# دیوانی زاری

مەلا عەبدولکەریم صائب

-------------------------------------------------------
**ناوی کتێب**: **دیوانی زاری**
**شاعیر** : **مەلا عەبدولکەریم** صائب **(زاری)**
**گردوکۆ و ئامادەکردنی** : **محەممەد سادق** صائب

**پیتچن**: 


**رووبەرگ**: **ئەحمەد غولامی )**
**چاپ و بڵاوگەی** : **محەممەدی سەقز**
**هەژمار**: **٢٠٠٠ دانە**
**چاپی**: **یەکەم ـ ١٣٨٢ (٢٠٠٤ز)**
**نیشانی بڵاوگە**: **سەقز ـ تەنیشتی مزگەوتی جامیعە ـ کتێبفرۆشی محەممەدی**
**موبایل**: **٠٩١٨٣٧٤٢٤٩٨**
**تەلەیفوون**: **٣٢٢٣٥٩٤**
**شابک**: **٢-٦٩-٦٧٢٠-٩٦٤**

## نێوەرۆک

**بەش** **لاپەڕە**

پێشەکی:

خوێنەرانی هێژا، وا لە پاش ماوەیەکی دوور و درێژ، بەرهەمە شێعرییەکانی مامۆستا مەلا عبدالکریم صائب «زاری» کەوتە بەردەستی خوێنەران، شاعیر دەبێ بەرهەمی چاپ کراوی خۆی ببینێ. بەڵام لای ئێمە خاوەنانی دەستەڵات ئەو ئازادی و دەرفەتەیان نەداوە، هەر بۆیە زۆری دیوانی شاعیران و بەرهەمی نووسەرانمان یان لە پەنا و پەسیوان فەوتاون یا پاش مەرگی خۆیان بە نیو و ناچڵی چاپ کراون. ئەم بەرهەمە شێعریانەی باوکم مەلا عەبدولکەرێم صائب بە ناوی «دیوانی زاری» ئەگەرچی هیچ شوێن و دەزگایەک پشتگیری لە چاپدانی ئەم بەرهەمە کلاسیکیانە ناکا بەڵام بە هەوڵ و ئەرکی خۆمان تێکۆشاوین تا ئەم دەفتەرە بخەینە کتێبخانەی کوردییەوە. هیوادارم جێی رەزامەندی خوێنەران بێ.

کورتەیەک لە ژیانی مامۆستا:

مامۆستا مەلا عەبدولکەریم صائب (زاری) لە بنەماڵەیەکی وەرزێڕ لە ئاوایی (ئاڵکەڵوو) سەر بە شاری سەقز لە ساڵی ١٣٢٥ کۆچی (١٩٠٥ زایینی) لە دایک بووە. خوالێخۆشبوو زاری کوڕی فەقێ عەبدوڵڵا کوڕی ساڵح کوڕی مەلا فەیزوڵڵا کوڕی مەلا حەمزە کوڕی مەلا ئەبووبەکرە. ئەم بنەماڵە هەر لە کۆنەوە لە خزمەت ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ڕێگای پێغەمبەری مەزن بوون. ماوەیەکی درێژخایەن بە دەست و دڵ پاکی بە چاکی و پاکی بۆ بەرژەوەندی ئەم ئایینە پیرۆزە تەقەلایان داوە.

لەو سەردەمەدا کە زاری توانیویەتی بچێتە خوێندن جگە لە منداڵە دەوڵەمەندەکانی شار و منداڵی ئاغای دێهات، کەس دەرەتانی ئەوەی نەبووە بچێتە مەدرەسەی دەوڵەتی. تەنانەت لە دێکانیشدا مەدرەسە نەبووە. هەر بۆیە لە حوجرە و مزگەوت لە لای مامۆستا ئایینیەکان دەستی پێ کردووە. مامۆستا ئایینیەکان لەو سەردەمەدا لە گەڵ هەموو گیروگرفتەکانی ژیانی خۆیاندا بێ یارمەتی کەس یا هەر چەشنە ئیمکاناتێک قورئان و بابەتە ئایینیەکانیان و خوێندن و نووسین کە پێویستی ژیانی سەردەم بووە فێری فەقێکانیان کردووە جا ئەوەی وریا بووە بۆ فێر بوون لە گەڵ هەموو کەموکورتیەکان دەسازا ـ زۆربەی فەقێکان لە گوڵستان و بوستان زیاتر نەدەڕۆیشتن. زاری هەر لە ئالکەلو دەستی بە خوێندن کردووە و اصول و قورئانی لە لای مەلا «محمود تدین» ئامۆزای خۆی خوێندووە. دوایی ئەچێتە داشالووجە لە لای شیخ عزالدین کە مەلا و بەرنوێژی ئەوێ بووە (تاریخی معجم) و (دورەی نادری) و (کلیله و دمنه)ی خوێندووە پاشان لەگەڵ چەن فەقێی تر ئەچن بۆ دێی تیکانلو بۆ لای مامۆستا (مەلا محمد خورخورەیی)لەوێ کتێبی (جامی) ئەخوێنێ.

فەقێکان، زیاتر لە بەر ئەوەی کە خەڵکی لادێکان نەیانەدەتوانی بەخێویان بکەن جێگایان ئەگواستەوە و ئەڕۆیشتن بۆ لایێ تر. دوای تیکانلو (زاری) ئەچێ بۆ ئاوایی (حسن سەلاران) لە سەرشیوی سەقز. ئەم ئاواییەی زۆر پێ خۆش بووە و هەر لەوێش پشکۆی شێعری زیاتر گەشاوەتەوە. لە حەسەن سەلارانەوە مامۆستا بارگە و بنەکەی کە بریتی بووە لە بوخچەیەک و چەند کتێب ئەپێچێتەوە و ئەڕوا بۆ ئاوایی (قەباغلوو) بۆ لای مامۆستا (شێخ عبدالله کانی کەوەیی) و پاشان لە شاری سەقز لای مامۆستا (ساڵح ئیمام زادە) درێژەی بە خوێندنی داوە.

بە بۆنەی کۆچی دوایی باوکی و مامەی دەست لە خوێندن هەڵئەگرێت و ئەرکی خێزانێکی رەش و رووتی ئەکەوێتە ئەستۆ. ئەمجار بۆ دابین کردنی بژیوی بنەماڵەکەی ئەکۆچێنێ بۆ دێی (قەرەچەر) لە گەورکی سەقز دوو ساڵ لەوێ ئەمێنێتەوە و پاشان ئەچێ بۆ دێی (چراغ ویس) هەر لە گەورکی سەقز تا ١٠ ساڵ بە کاری کشت و کاڵ و مامۆستایەتی لەم ئاواییە دەژی. بە هۆی وەرچەرخانی ئەو دەمە کە لە مێژوودا بە (قەزای شەهریوەری ١٣٢٠) ناو دەبرێت ئەکۆچێنێ بۆ دێی (داشالوجە) دوای هەشت ساڵ لە بەر نەبوونی کێڵگە و کشت و کاڵ دەکەوێتە سەختی ودەست تەنگی. لەو کاتەدا ئاغای (ئارەبوغلووی سەروو) (فەیزوڵڵا خان) دڵخۆشی ئەکات و مەزرایەکی پێدەدات ئیتر هەتا ئاوابوونی هەتاوی ژیانی کە رێکەوتی ١٣٦٠/٢/٢٧ هەتاوی (١٩٨٢ز) لەم ئاواییە درێژەی بە ژیانی داوە.

مامۆستا وەک زۆربەی خەڵک نانی خۆی بە ئارەقی نێوچاوان و دەست و شانی خۆی دەرهێناوە. جێی داخە کە بە بۆنەی سێبەری رەشی حکوومەتی پاشایەتی لەو سەردەمەدا هیچ کتێب و کۆڤارێکی کوردی لە بەر دەستدا نەبووە یان نەیتوانیوە لەگەڵ شاعیرانی تر پێوەندیان هەبێ دەنا تەجروبەی شێعری زۆر بەرزتر دەبوو. تەنیا تریبوونێک کە دەنگی شێعری تیا هەڵێنابێ رادیۆی کرماشانی ئەو ساڵانە بوو کە شکرالله بابان و سوارەی ئیلخانی زادە بەڕێوەیان دەبرد. (جگە لەوە لە ماوەی ژیانیدا هیچ کۆڤارێک نەبووە تا شێعرەکانی چاپ بکات. لە بەر ئەوە یەکەم چاپەمەنی و نووسینی کوردی لەو

**زەمانەدا تاوان و پاوان بووە تەنانەت چەند جارێک لە سەر شـێعری کـوردی، سـاواک هەڕەشـەیان لێکردووە. هۆیەکی دیکەش ئەمەیە کە مامۆستا وەک زۆر کەسی تر لە سەر ڕەنــج و بـەهرەی خەڵـک نەژیاوە و هەمیشە لە هەوڵ و تێکۆشان و کار کردندا بووە تا بتوانێ بێ منەت منداڵەکانی بژێنێ.**

**مامۆستا دوو ژنی هێناوە لە ژنی یەکەم بە ناوی (لعلی خان) کوڕ و کچێکی بووە و لــە ژنی دووهــەمی بە ناوی (شەوکەت) شەش کوڕ و کچێکی بووە. جا لە تەنگەژە و قەیرانی ئـاوادا مرۆڤـی هـەژار چـۆن بتوانێ بە ئاسوودەیی شێعر و شێوازە شێعرییەکان تاقی بکاتەوە. بە سەر ئەوانەشـدا مامۆسـتا لــە بواری شێعری عەرووز و کلاسیکدا زۆر سەرکەوتووانە ئەسـپی قەڵــەمی خـۆی تـاو داوە و ڕێبـازێکی تایبەتی بۆ خۆی پێک هێناوە هەر چەند دەبوو ئەم بەرهەمە زووتر بکەوێتە بـەر دەسـتی خوێنــەران بەڵام بە هۆی کەم دەستەڵاتی و پرش و بڵاو بوونی شێعرەکان، ئەم کارە دوا کەوت. پاش چەنــد سـاڵ گەڕان و پشکنینی ئەم لاو ئەو لا، ئەم دیوانەمان کۆ کردەوە کە سەرجەمی شێعرەکانیەتی.**

**زاری جگە لەمانە داستانی لەیلی و مەجنوونی نزامی لە فارسییەوە کـردووە بــە کوردیــەکی ڕەوان و پاراو کە بەو زوانە ئەویش دێتە ناو کتێبخانەی کوردییەوە.**

**من وەک کوڕی مامۆستا هەر ئەوەندەم لە دەست هاتووە ئــەم بەرهەمــە وەک خـۆی گردوکـۆ بکــەم و پێشکەش خوێندەواران و هۆگرانی شێعر و ئەدەبی کوردی بکەم. ئیتــر لێکدانــەوە و هەڵســەنگاندن و نرخاندنی دەخەمە ئەستۆی خوێنەری بیرمەند و وشیاری کورد.**

**حەز دەکەم دەست نیشانی ئەوە بکەم کە مامۆستا بۆچی نازناوی (زاری) هەڵبژاردووە. مامۆستا خـۆی لە شێعرێکدا کە بە فارسی نووسیویەتی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە. ئەمەش شێعرە فارسـییەکەی (زاری) و خودی دیوانەکەی پێشکەش بە کتێبخانەی دەوڵەمەندی ئەدەبی کلاسیکی کوردی:**

دلــــــی دارم بســـــــان بوتـــــــه در تـــــاب
وزو خـــــون مــــی چکــــد وز دیــــده خونــــاب
خلیـــــده خــــار هجـــــران در رگ و جــــان
نشســـــــته زاغ نومیــــــدی بــــــه بســــتان
لگـــــــدکوب ســــــتم باشــــــد وجـــــودم
نمیــــدانم از ایـــــن ســــودا چــــه ســــودم؟
گـــــلِ عمــــــرم شـــــده پژمــــــرده از غــــم
تـــــنم بـــــی حـــس بســـــان مـــــرده از غـــم
چنـــــان گشـــــتم زبـــــون و عاقبــــت شــــوم
دریــــن ویرانــــه شــــد هــــم لانــــه ام بـــــوم
چنــــــــان آشــــــفته و زار و نــــــــزارم
کــــه بــــر خـــــود نــــام «زاری» میگـــــذارم

محمد صادق صائب

## ١

ئەو فرسەتە کەی دێ کە لە ڕۆژ ئەم شەوە لادا | ڕۆشن کەمەوە چاوی نەبینم بە تەماشا

باوەڕبکە دڵ غەیری گەیشتن بە وساڵت | نەیکردووە مەیلێ بە هەموو نیعمەت و ناکا

دێژن بە سەبر دێتە بەر ئەم باغی مورادە | بەختی من و دەوری فەلەک ئەو تاقەتە نادا

داوێکی بگیری هەیە سەییاد و عەجایب | بەم کۆششە داوێ لە مل ئەو ئاهووە ناخا

هەرلەحزەدووسەدمەرتەبەدڵ دەربکە ڕێی غەیر | بۆسێبەری سەروی قەدی تۆ حەتمیە نابا

ئەی‌سەرویسەمەربەی‌بەبلێسەی شەمی گۆنات | بڕوانە لە پەروانە کە سووتاوە سەراپا

ئەی «زاری» زولێخا کە نەما سەبرو قەراری | بابێتە دەر ئەو یۆسفی کەنعانە لە چادا

## ٢

مژدە ئەی بولبول لە گوڵ لاچوو نقاب | وەختی سەیری گوڵشەنە بەزمی شەراب

مەجلیسی یارانە هەم کاتی ویساڵ | ڕازە، نازە و عیشوەیە، ڕەمزە و خەتاب

وازە دەروازە و مەغازەی دڵبەری | قەهرە لوتفە جلوەیە میهرە و عیتاب

غونچە گوڵ پشکووت و ڕوخساری نوان | قومریان سەرمەست و بولبول دڵ کەباب

هۆشی هۆشیارانی ڕۆشن فیکر ئەبا | سۆزی نەی ناڵەی چەنگ و ڕوباب

قەترەیی شەونم لەسەر گوڵ میسلی دوڕ | شوعلەوەر وەک شەوقی قورسی ماهتاب

هەر کەسێ یەک دەفعە بیبینێ بە دڵ | داوی زولفی ڕای ئەکێشێ وەک تەناب

تالبانی شەوقی ئەو تووبا قەدە | بێ خەبەر ماون لە ڕۆڵە و گیان و باب

کانی جوانییە و خەزێنەی دڵبەری | باغچەیی مەقسوودە بۆ چاک و خەراب

لەم هەموو لوتفە کەوا لەو شۆخەدا | گوڵ سەر ئەفکەندە خەجاڵەت ماوە ئاب

نووری ڕوخساری چرا بۆ ئەهلی دڵ | تیغی ئەبرۆی سەربڕی ئەهلی عەزاب

دایەنی ئەم نازەنینە بەرمەدە | گەر گەرەکتە «زاریا» ڕاهی سەواب

# ٣

دوێ قـــەراری دا کـــە بێـــت و مەرحـــەباییێکم بکـــات

ئـــاوری شـــەوقی لـــە دڵ بـــەردا خـــودا بـــۆچی نـــەهات؟

لـــەمشـــەوی هیجرانـــەدا گـــەر رۆژی روخســـاری‌نـــەبێ

بێ‌دڵ‌وچـاوێکی‌وەک‌مـن پـەی بـەوەسڵـی کـەی ئـەبات؟

دڵ بـــە ئومێـــدی قـــەدەمبۆســـیت لـــە رێـــدا کـــەوتووە

تـــۆ خـــودا پـــای لـــێ بنـــێ بەڵـــکوو بـــە ئـــاواتی بگـــات

خۆشـــترە بـــۆ مـــن لـــەئاوی زینـــدەگانی یـــەک قســـەت

چاکترە بۆ من لـە موڵـکی هـەردوو عالـەم یـەک نیگـات

نامـــەوێ ئـــەو قەلبـــە شـــەوقی قامـــەتی تـــۆی تیانـــەبێ

عـــاجزم لـــەو قاڵـــبە رۆحـــی بـــە قوربانـــت نـــەکات

ئـــاوری شـــەوقت بڵێســـەی بەســـتووە بڕوانـــە لـــێم

ئـــاوری ئـــاهی منـــە ئـــاور لـــە ئـــاوڕ بـــەر ئـــەدات

گیـــانی‌شـــیرینم چ نەقســـێ روو ئـــەدا گـــەر دەفعـــەیێ

عاشـقی شـەمعی‌جەماڵـت دەی بـەدیـدارێ نـەجات

شـــەرحی دووری گـــەر بـــدەم، ئـــاور لـــە ئـــاور بەرئـــەبێ

سۆزی‌سینە گـەر بکـەم ئیزهـار، ئەسـووتێ کائینـات

لـــەمهـــەموو زەخمـــە کـــە شمشـــێری بـــرۆت ئـــەیکا لـــەدڵ

لەمهەموو تـیرە کـەبرژانگـت لـە گورچیلـەی ئـەدات

لـــەمهـــەموو زەهـــرە کـــە ســـاقی فیرقـــەتت ئەیـــدا بـــە دڵ

لەم هەموو بێ‌میهرییە زوڵـفت لەگـەڵ ئێمـەی ئـەکات

غـــەیری‌خزمـــەت‌لـــەعلی‌لێـــو وخـــاڵ‌وخەنـــدەی‌دڵـــبەرت

لای کەســـێکی کـــە (معـــاذالله) ببـــا «زاری» شـــکات

## ٤

پڕلەشۆروشینیدووریبوودەروونی بێسەبات

بۆ تلووعی ڕۆژی روخسارت کتوپڕ موژدە هات

هەر لە قاپی حوجرەوە بۆ خاکبۆسی تا حەرەم

پۆلبەپۆل ئەرواح وێسان و لەسەر هەر جێگە پات

دارو بەرد و خاکو خاشاکیگوزەرگا سەربەسەر

گیانو چاون و هاتوون بۆ ماچی دامانی کەوات

وەختی هاتن چاوم، ئاگا بە! لە رێتا کەوتووە

سەر بەسەریەکدا وەکوو بەردیچەمیبەر خانەقات

چیلە بەدبەختی منی بێ دڵ خەیاڵی مونسەرف

کرد و گەڕیاوە خودا بۆهات و ئاخر بۆ نەهات

من شکاتیئێشی دڵ لای کێ ببەم ئیللا حەبیب

غەیری ئەو کوانێ تەبیبێ وا عیلاجێکم بکات

بێ حەیایی خۆشە «زاری» پێشووان ئەمیانەوت

شەڕ لە بێکاری نەتیجەی چاترە ئەمما بەکات

## ۵

بۆیە پێم خۆش ئەوێ پێی بێمە درگات

سەرم بۆیە ئەوێ بینێمە بەر پات

بۆیە چاوم ئەوێ تۆی پێ ببینم

دڵم بۆیە ئەوێ بۆ شەوقی باڵات

لەغەم ئازاد فکرێکم ئەگەر بوو

ئەویش واکەوتە داوی زولفی تاتات

لە حەد دەرچوو لە دووری بێ قەراریم

خودا کەی ئەم زستانی هیجرە ئەڕوات

لە بەدبەختی و شوومی خۆمە دەستم

بە دامانی کەوای ئەو شۆخە ناگات

لە شەرما بەدر پاماڵی ئەسەف بوو

لە بورجی ناز ئەو غونچە کە دەرهات

ویساڵی نادەنێ عاشق هەتاکوو

بە خوێناوی جگەر دەسنوێژ نەشوات

دەمی نەورۆزە بەزمی بولبول و گوڵ

سەبا بابی لە باغ ئەو زاغە دەرکات

سبەی قوربانە، رۆحم قۆچە ئەیکەم

بە قوربانی قەدی سەروی دڵ ئارات

کەسێ لەم بەزمەدا هۆشیارە «زاری»

لە عیشق ئاور لە حاڵ و ماڵ بەردات

## ٦

سەبا بەشارەتی دا بەهاری دڵگوشا هات
دەوایی زامەکانی ناسۆر و بێ دەوا هات

هەستا لەخەو وەنەوشە کەژبەرگیسەوزیبەرکرد
شەرابی زیندەگانی بۆ دار و بۆ گیا هات

کەناری باغ پڕ بوو لە غونچەکانی دڵبەر
رازاوە دەشت و زیوەر بۆ کێو و بۆ چیا هات

سەرما فەراری کرد و زستان گۆڕی گوم بوو
جەفایی بەفر رۆیی و هەوایی پڕ سەفا هات

باڵندەکانی دەنگخۆش بە چەنگ‌وعوود و بلوێر
بۆ دەفعی ماتەم و غەم دڵانی پڕ جەفا هات

پۆلێ گوڵاڵە سوورە بە رەقس و چەپڵەڕێزان
بۆ پێشوازی بولبول بە چۆپی و سەما هات

لە باغی هەور «زاری» بارانی شەوق ئەڕێژێ
لە لای پادشاوە خەڵات بۆ گەدا هات

## ٧

لە پەردە رۆژی روخسارت کە دەرهات
دڵ و گیانم بە جارێ خستە بەرپات

ئەزانم بۆ زیادی بینشی چاو
عەجایب سورمەیێکە گەردی پاڵات

بە سەر دوو دیدەدا دیدە عوبووری
بکە تاکوو بگا دیدەم بە ئاوات

گوڵاڵەی باغی حوسن و دڵبەری! کەی
ئەبێ ئەو فرسەتە، بێمە تەماشات

لە «جەنات النعیمی» وەسڵدا دڵ
تەمەننا غەیری سەیری رووت ناکات

بە یادت کەللە مەست و سینە پڕ جۆش
بە بێ‌شەوقت بە کەڵکی چیم ئەخوات؟

جەواڵی پڕ لە گۆشت و پێشەیە تەن
سەر و رۆحێ کە خاڵی بن لە سەودات

خودا هۆشێ ئەگەر گەوهەر بناسێ
خودا دەرکێ لە تاریکیم دەرکات

گەلێ بێ هیممەتە«زاری» ئەگەر دەس
لە دامانی وەفای ئەو شۆخە بەردات

## ٨

دەردی‌دووری کوشتمی یارەب دەوایێ بۆ نەهات؟
سوحبەتی بێگانە تاکەی ئاشنایێ بۆ نەهات

سەرفی‌رێگەی‌بێوەفایی‌بوو خەزێنەی زیندەگیم
کۆچی‌ئاخروەختەبێ‌ساحیب‌وەفایێ‌بۆ نەهات

غەرقی لافاوی غەم و خنکاوی گێژاوی بەڵام
وا لە رێدا سەد گرێ، موشکوڵ‌گوشایێ بۆنەهات

جەردە بۆ تاراج دیسانۆ لەراس‌وچەپ‌خودا
بۆنەجاتی کاروانم رەهنومایێ بۆ نەهات

وای‌بۆ کەشتی‌شکاوی‌قوڕ بەسەر لەم بەحرەدا
ناخودا کۆمەک‌کە ناکا باخودایێ بۆ نەهات

بۆئەوەی‌ئەم‌رێگەراسەگوم نەکەم‌تادەچمە شار
لەم شەوی تاریکەدا شەوقی چرایێ بۆ نەهات

زەخمی‌دڵ‌ئێشی گرانە سەبری‌ئەییووبی دەوێ
بۆ دڵی بێ سەبرم ئەی«زاری»شفایێ بۆ نەهات

## ٩

تاقەتی بولبول لە حەد دەرچوو خودا بۆ گـوڵ نـەهات؟
مەرهەمی ئـێش و فـیراق و دەردەکـانی دڵ نـەهات
وا لـــە تـــاریکی شـــەوی هیجـــر و قـــوڕاوی مەینـــەتا
ماتڵــم، بــۆ رۆشــنایی ئەختــەری کــامڵ نــەهات
ئینتــزاری خۆشــە بــۆ عاشــق بــە ئومێــدی ویســال
مــردم و ئــارامی قــەلبی زار و بــێحاسـڵ نــەهات
تا لــە پووشــی دڵ گــڕی شــەوقی جەمالــت بەرنــەبوو
مەنجەڵی سینەم بە زووخاڵی جیـایی کـوڵ نـەهات
بۆ نەکەم شیوەن لە لای ئـەو شـۆخەوە تـا ئـەم دەمـە
موژدەیێ بـۆ ئیمتینـانی قـەلبی بـێتـامڵ نـەهات
خۆلــە ژێــر بــەفری فیراقــا پووشــی وشــکی تــەن رزا
ئەیخوا چ بکەمبەهـاریعـومریبـێحاسـڵنـەهات
قــوڕ بــە ســەردا بــۆ نەکــەم لــەو رۆژەوە دنیــا هەیــە
کاریهیچکەس زاریا وەک کاری تۆ موشکوڵ نـەهات

## ١٠

بردوویـــە بـــە غـــارەت دڵـــەکەم لـــەزەتی رەنگـــت
ئـــادەی بـــدە ماچـــێ لـــە شـــکۆفەی دەمـــی تـــەنگت
بـــەم ئـــاوری شـــەوقم کـــە دەســـووتێت کـــەژ و کێـــو
تەئســـیری لەبـــەرچی نییـــە بـــۆ خـــاتری ســـەنگت
کێیـــە دڵـــی لـــەتلـــەت نییـــە بـــەو تێغـــی برۆتـــە
ئـــاخر چ نـــەچیرێ کـــە نـــەکوژرا بـــە تفـــەنگت
ئەکوژێتـــەوە ســـۆزم بـــە تکـــێ ئـــاوی تەماشـــا
گەربێتـــە دەر ئـــەو رۆژە لـــە زوڵـــفی شـــەوەزەنگت
بـــێنـــوورە کـــە دوو دیـــدە لـــە دووری شـــەمی گۆنـــات
روونیـــان بکـــەوە چاوەکـــەم ئـــەم جـــارە بـــە رەنگـــت

بونیـــــادی ژیـــــانی مـــــنی زاری بـــــە فـــــەنادا
قـــەهری بـــە پەلـــە و مەرحەمـــەتی دوور و درەنگـــت
لـــوتفێکی شفابەخشـــە بـــە رەحمـــەت کـــە بپرســـی
جـــار جـــارە لـــە سـۆزی دڵـــی زەخمـــاری خـــەدەنگت

## ۱۱

بڕوانە چ حەشرێکە ئەی دیدە لـە هیجرانـت
لایـــێ بکـــەوە لێمـــان دەســـتی مـــن و دامانـــت
بانەگرێ بەری رۆژی روخسار، شەوی پەرچـەم
ئەم جارە نیشـانم دە خورشـیدی درەخشـانت
تاکەی منی بێچارە مەحـڕوومی ویسالـّت بم
بەم جـۆرە کـز و عـاجز گیرۆدەیـی گریانـت
بو غارەتی ئەقڵم چاو هەڵمەبڕە بە غەممازی
با سینە نـەکا لەتلـەت شمشـێری برۆکانـت
هەیهەیمەدە سا جەولانبەو پەرچەمە تاتاتـە
شـێتی مەکـە دیسـانۆ مـەجنوونی بیابانـت
پوورەی هەنگیئەڕواحی وا پێوە لە سەد جێگـە
سەر تا بە قەدەمبالآتوەک زوڵفی پەرێشـانت
بێڕەحمییە داپۆشین ئەو شەمعە لە پەروانـە
ناشوکرییە دەرکردن ئەم تەیرە لـە بوسـتانت
باغێکی سەفابەخشە ئەو رووتە وەلێ سەد ئـاخ
بۆمـەنعی تەماشـامان کێشـکچییە موژگانـت
ئاگا بە نەبی تێکەڵ بە خـوێنی دڵـی «زاری»
وەختێ کە دەکەی شانە زوڵـفانی پەرێشـانت

## ۱۲

زەردە سۆزەی دڵ لە دووریـدا و نزیکـە بەفـەوت
دەفعەیێ رێگای دیداری نـەدامێ بـەختی چـەوت
ویسـتی ئـاوێ بـە ئـاوردا بـرێژێ دیـدە، دیم
بۆ بلێسەی ئاوری تیژی دەروونم بوو بـە نـەوت
چوومەسەرچاوەیحەیاتوساقیوپەیمانـە هـات
عالـەمێ تێرئاو بوون و من قـومێکم بەرنەکـەوت
بۆ تەماشاکردنی خورشـیدی روخسـاری گـەلێ
چاوەڕێبوودڵ کە شۆڵە دەرکەوێت و دەرنەکەوت
بـۆ وەدەس هێنـانی دیـداری گـەلێکم دا تـەکان
بەختی بێ هێزم لە لێژی بێ مورادی سەرنەکەوت
دەفعەیێ گـەر فرسـەتی وەسڵـم بـداتێ رۆزگـار
سەیریئەوهەشتەمگەرەکناوێتوناترسـملـە حـەوت
زیندگیومەرگلای ئەهلی سەفا وەسڵـە و فـیراق
عەیشیخۆش ئەی«زاری»دیدارە و جیـایی یار، مـەوت

## ١٣

بە چاوی مەستت ئارامی منی برد
بە تێغی ئەبرۆی دڵمی جنی ورد

وتم بازێکی ئازادە خەیاڵم
لە داوی زولفی خاوا پاوەنی کرد

پەنا بۆ کێ ببەم دادم بپرسێ
بڵێم دڵبەر ئەوەی کرد و ئەوەی برد

ژیانی بێ‌فەنا لەو داوە دایە
ئەوەی لەو داوەدا بمرێ مەڵێ مرد

بە قوربانی سەبا بێ گیان و ماڵم
کە پەیغامی بەهاری وەسڵی هاورد

ئەزانی بۆ دەماخم چاخە ئەمڕۆ
بەلامانا بە ناز ئەو شۆخە رابورد

شکەستی‌دا بە سەرو ئەم سەروە سەد جار
بە دوو نارنجی نەرمی پڕچنگ و گرد

قەڵەم لەت بێ زوبانی ئێمە نووسی
پەشیمانم چی بوو ئەم زوڵمە چم کرد

لە سەفحەی سینەدا دوو قوببە کافوور
دروس کریاوە بێ ئوستاد و شاگرد

لە شەرما گەردنی کەج بوو وەنەوشە
لە سەر ئەو روویە ڕووبەندی کە لابرد

خەیاڵی من بە خەو رێی کەوتە باغی
کە پێی زانی لە هەردی باغی دەرکرد

وتی «زاری» بەشت لەم باغە نادەم
وتم وەعدەی من و تۆ حەشر و سەر پرد

## ١٤

خودا ئەو ڕۆژە ئێمەی بەربەلا کرد
کە پەروانەی بە ئاور ئاشنا کرد

بەهیوا نیم ئەگەر عەقڵم بمێنێ
کە زوڵفت شانە چاوانت سیا کرد

سکوونی پۆشی دڵ بۆ ئارەزوو کەم
کە گەردنتی خودا وەک کارەبا کرد

کە فانووسی جەماڵت شوعلەوەر بوو
دڵی ئێمەی پەپوولەی ئەو چرا کرد

لە حەڵقەی داوی زولفت بێ خەبەر نیت
کە هەر تارێ هەزاری موبتەلا کرد

بە ناز ئەو ڕۆژە چاوانی هەڵێنا
وەنەوشەی سەربەرەو ژێری حەیا کرد

کە ئەم گوڵنارە لەم گوڵزارە پشکووت
لە نەرگس بولبولی بێ ئیشتیا کرد

شەفافی رووتی گوڵ چۆن دێ لە شەرما
لەدەشتا مەنزڵی پێچ و پەنا کرد

مەڵێ بۆ عاجزی «زاری» کە باری
بڕۆتی ئافەتی شێخ و مەلا کرد

## ١٥

کە پیری مەیفرۆش ئەمڕۆ جامێکی حەوالەم کرد
لە بیری بردمۆ ئەو موددە وا سەد ئاە و نالەم کرد
ئەگەرچیبادیسەختیهیجرەت هات و بێخیهەڵکەندم
بە «حمد اللە» لە باغی وەسڵدا سەیری گوڵاڵەم کرد
دڵم دوێنێ لە هۆشیاری کە لافی لێ دەدا ئەمڕۆ
دوچاری چاوی مەستی ساقی و دەوری پیالەم کرد
گوڵی روخساری پیشانم کە دا دوێنێ لە گوڵزارا
هەتا مەغریب دوعا خوانی دەوامی ئەو جەمالەم کرد
وتم پنهان ئەکەم سۆزی دەروون و دەردی موشتاقی
کتوپڕ عیشقی تۆ هات و قسەی مەشهووری عالەم کرد
غولامی عیشق بێباکە لە مەیدانی قیامەتدا
ئەسیری پەرچەمت بم چاکە ئەمڕۆ ئەم خەیالەم کرد
موقامم وا لە کەیوان و فەلەک، ئەرزی گوزەرگامە
لە رۆژێکۆ کە من عەبدایەتی ئەو چاوە کالەم کرد
بە شیرینی ویسالی نازەنین بێژی بگەم «زاری»
عەلاجی ئێش و دەردی دڵ کە بەم دەرمانە تالەم کرد

## ١٦

لە تاوی ئێش و دووری تەلعەتی یار
چ غەمبارم چ غەمبارم چ غەمبار
لە تەن گیانم کە دەرناچێ لە هیجری
چ بێ عارم چ بێ عارم چ بێ عار
بە بێ دیداری ئەو لەم زیندەگیمە
چ بێزارم چ بێزارم چ بێزار
بە پەیکانی موژەی بێ ڕەحم و خوێنڕێژ
چ زەخمارم چ زەخمارم چ زەخمار
بە ئیستغنای ئەو شۆخە ئەزانن
چ بیمارم چ بیمارم چ بیمار
مەزاقی دڵ ئەڵێ لەم جەورە هەی داد
چ پڕ ژارم چ پڕ ژارم چ پڕ ژار
وتم «زاری» ئەتۆ چۆنی؟ وتی وەی
چ ئەفگارم چ ئەفگارم چ ئەفگار

## ١٧

لەم هەموو باری گرانەم وا لە سەر     نازەنینم جارێ نەیپرسی خەبەر
مامەوە بێ ساقی و جام و حەریف     هەمدەمم غەم، بادە خوێناوی جگەر
لەم دڵە بێ غیرەتە ئازیزەکەم     دەردە دڵ لای کێ ببەم خاکم بەسەر
بۆ لە بێکاری دەسی کۆتا نەکرد     بۆ لە بێعاری هەنگاوێ نەچووە دەر
وا لە پای ئالاوە داوی تەمبەڵی     کۆمەکی باری نەبێ نایێتە دەر
دەرکی وا پۆشیوە نۆشابەی هەوا     بێ خەبەر ماوە لە ئەسپاوی سەفەر
خۆفی جێمانی نییە لەم چۆڵەدا     بێ رەفێق و تۆشە و بێ بارەبەر
هەمسەرانی رۆین و ئەم غەرقی خەو     هیچ نازانێ کە رێگەی وا لە بەر
ئاە بۆ ئەو هۆشیارە وا کە هۆش     با بە بێهۆشێکی وا گیری خەتەر
مردوویەکی وا ئەبێ عیسا دەمێ     زیندووی کاتۆ بە ئیزنی خوا مەگەر
چی بکەم بێ روشنایی ئەی خودا     لەم قوڕاوە بەم شەوە چۆن بێمە دەر
مەملەکەت بێ پادشا وێران ئەبێ     باغ قەت بێ باغەبان نادا سەمەر
چارەی ئەم دەردە نییە ئیللا لە لای     خوا پەرستانی نەخەوتوو تا سەحەر
دایەنی ئەو دەستە بگرە بەستە بۆ     چارەی ئەم دەردە لەوانۆ یەک نەزەر
لەم شەوە تاریکەدا بێ نووری شەم     «زاریا» تەی چۆن ئەکا رێگا بەشەر

## ١٨

خۆشە پێم شیددەت بسێنێ دەمبەدەم خوێنی جگەر
بەڵکوو رۆژێ بۆ مداوا ئەو تەبیبەم بێتە سەر
خاکی رێگاکەی بە برژانگم ئەماڵم تا نەگا
وەختی هاتوچۆ لە خار و خەس بە دامانی زەرەر
سورمەیێ بۆ بینشی چاوانی من دەس ناکەوێ
چاکتر لەو خاکە ئەو پاکە بە سەریا کا گوزەر
غونچە بۆ بینینی روخساری کە چاوی هەڵبڕی
وا خەجاڵەت بوو بە شێتی کێو و هەردی گرتە بەر

حەسرەتی حوسنی وەکوو ئـاور لـە جەسـتەی بـەر بـووە
شەمع بۆیە وا ئەسووتێ ئەووەڵـی شـەو تـا سـەحەر
تـۆ کـە سـۆزێکت لـە شـەوقی شـەم لـە خـاتردا نییـە
مەنعی پەروانە لە سۆزش بۆ ئەکەی ئەی بـێ خەبـەر
وا خەیاڵـــی حاڵـــی روخســـاری پەشـــێوی کـــردووم
نیمـە فکـر و بـیر و هۆشـی ئیمتیـازی پـا لـە سـەر
چـــون تـــەوافی کەعبـــەیی دیـــدارە ئـــاواتم ئەڵـــێم
مـن چ دەربەسـتم کـە سـەد دەردی گـرانم بێتـە بـەر
«زاریـــا» بـــێ ڕەنـــج گـــەنجی ئـــارەزوو دەس ناکـــەوێ
خەرمەنیمەقسوود کەی دەس کەوتووە بـێ دەردەسـەر

## ١٩

بـــە داوی پەرچـــەمی تاتاتـــە دڵگـــیر
بـــە برژانگـــت بڵـــێ نەیداتـــە بـــەر تـــیر
کە ئەم ئـاهووی وەحشـەت هاتـە گوڵـزار
بـــە داوی میهـــر گـــیری دە، نـــە زنجـــیر
بـــە خەنـــدە لێـــوی بـــزوان و بـــە چـــاوی
ئیشـــارەی کردمـــێ بـــێ ســـوودە تـــەدبیر
بـە ئـاور تـا نـەبێ گـەرم ئاسـنی سـەرد
چـــەکوش ناکـــا لـــەوا چەنـــدان تەئســـیر
ســـەرم ســـوور مـــاوە نـــازانم کـــەلامی
نـــەباتی میســـرە، شـــەهدی نابـــە یـــا شـــیر؟
شـــەرابی زینـــدەگی ئـــەڕژێ لـــە لێـــوی
مەســـیح ئاســـا زەمانـــێ بێتـــە تـــەقریر
تەماشـــــایەکی گوڵـــــزاری جەماڵـــــی
دەوایـــەکی جـــوانی بەخشـــە بـــۆ پـــیر
وەرە ســـاقی بـــە جامـــێ بگـــرە دەســـتم
چ جـــام؟ ئـــەو جامـــە وا نـــادان ئـــەکا ژیـــر
بـــە بـــادە غـــەم بـــە بـــادە «زاریـــا» چـــون
لـــە بێـــدادی فەلـــەک ناکـــات تەقســـیر

## ٢٠

لــــە بـــەدری عالـــەم ئـــارا لادە رووپـــۆش
لەمــە زیــاتر دڵــم بــا هەڵــنەخا جــۆش

جیـــایی تۆیـــە بـــاعیس بۆیـــە ئـــاوا
مــنم بـــەم جـــۆرە شـــێواو و ســـیاپۆش

خودایـــا فرســـەتێ خاڵـــی لـــە ئـــەغیار
لە قەندی لێـوی پـڕ کـەم باغـەڵ و کـۆش

بەهانـــەی ســـەیری بـــاغی مـــەحموو ئـــاوا
دیـــداری تۆیـــە بـــۆ رەنـــدانی مـــەی نـــۆش

بـــە دیـــدارت کـــە بـــێ دیـــداری پاکـــت
گوڵســـتانم لـــە لا ناخۆشـــە نـــاخۆش

مـــەزاقم گـــەرچی پـــڕژارە لـــە دووریـــت
بـــە یـــادی خـــاکی پابۆســـیتە دڵ خـــۆش

لــــە ئاوێنـــەی خـــەیاڵا ســـوورەتی تـــۆ
هەمیشـــە حـــازرە نابـــێ فـــەرامۆش

هەیـــە و ئێـــژن لەگـــەڵ هـــەر نـــێش نۆشـــێ
ئەمن رازیم هەر ســەد نـێش و یـەک نـۆش

وەهـــا مەســـتی شـــەرابی شـــەوقە «زاری»
هـــەتا رۆژی قیامـــەت نایـــەتۆ هـــۆش

## ٢١

لـــە گوڵـــزاری ویســـالت دەر بـــەدەر خـــۆم
لە جەننـەت بێبـەش، ئاوارەی سـەقەر خـۆم

لە دەوری شەمعی روخسـارت وەکـوو شـەم
رەفێقـــی گریـــە و گـــڕ، تـــا ســـەحەر خـــۆم

سروورم هـەر کـە تـۆ رۆیشـتی، رۆیشـت
لەگـەڵ غـەم هەمنشـین و هەمسـەفەر خـۆم

لە چاوم خوێنی گەش دوو جۆ، لە دووریـت
ئەڕۆ چەشمەی دوو بەحری پـڕ خەتـەر خـۆم

نـــەما بـــێ تـــۆ نەشـــات و شـــادمانیم
دوچـاری ئێشـی قـەلبی پـڕ شـەرەر خـۆم

لـــە بـــەر بـــوو بێبـــەری داری مـــورادم
وەکـوو دارێکـی بـێ سـایە و سـەمەر خـۆم

بـــڕی تێغـــی فیراقـــت جـــەرگی«زاری»
وەکـوو دارێکـی بـێ سـایە و سـەمەر خـۆم

## ٢٢

هەتاکـــەی تاســـە خـــوارت بم هەتاکـــەی ئینتیـــزارت بم
هەتا کەی بـێ قـەراری هیجـرەتی وەک ژاری مـارت بم

هـــەتا کـــەی ئێشـــی دووری ســـاکنی ماڵـــی دەروونم بـــێ
رەفێقـــی ئـــاهی ســـەرد و رەنگـــی زەرد و دەردەدارت بم

زوانم لاڵـــە، ژیـــنم تاڵـــە، حەســـرەت زاڵـــە غـــەم شـــایە
خەفەت ئاغایـە، بـا پاشـێلی فیتنـەی پێچـی لارت بم

عەجەب شیرینە ئەو چینە ئەگــەر رەحمــە و ئەگــەر قینــە

که دەیخەیتە تەوێڵ و ئەمر ئەکەی من وێڵــی شــارت بم

جیایی تۆیــە بــاعیس، بۆیــە خــوێنی دیــدە وەک جۆیــە

بەشــم رۆڕۆیــە وا چاکــە خــەریکی شــین و زارت بم

ســەفایێ بێنــە پێشــۆ بــێوەفــا ئــاخر جــەفا تاکــەی؟

چییــە وەک زولــف پــەرژینی گوڵاڵــەی لالــەزارت بم

دەمێکــە حــەول ئــەدەم لــە خــوا ئــەپاڕێمۆ تەقالامــە

کــە رۆژێ باغــەبانی ســێو و نــارنج و هــەنارت بم

بلــووری گــەردنت بنوێنــە، ســەر هەڵــبێنە، بڕفێنــە

ئەوی هۆش و خەیاڵە یەک کەڕەت با شێت و هــارت بم

دڵــم مەشــکێنە دەربێنــە لــە ژێــر ئــەو هــەورەدا رۆژت

وەدەرخە داو و دانــەی خــاڵ و زوڵــفت بــا شــکارت بم

دڵــی دەرهــات «زاری» کەوتــە بــەرپای و کــەچی نــەتنا

بە سەریا پــا، دەبــا گــەردێ لــە خــاکی رێگــوزارت بم

## ٢٣

ئــــادەی وەرە قوربــــانی قــــەدی نەیشــــەکەرت بم

قوربانــــە ســــبەی، لازمــــە قوربــــانی ســــەرت بم

دڵ حــــازرە بــــێ بیــــدە لــــە ســــێدارەیی زولفــــت

باهــەر وەکــوو خەرمانــە، لــە دەوری قەمــەرت بم

دەرمــــانی بــــرینی دڵــــەکەی پــــڕ لــــە غــــەمم کــــە

ئەی من بــە نیشــانەی موژەکــەی عیشــوەگەرت بم

سووتاوم و ڕێگەم نییە بۆ دیتنی باڵات
پێ هەڵگرە بێ تا بە فیدای ڕێگوزەرت بم
ئاخر نەفەسە لازمە ئەی دیدە کە ئەمڕۆ
بۆ ڕەسمی وەفا هاتنە جێ، خاکی دەرت بم
سەر هەڵبڕە بڕوانە کە سەر بەرزییە بۆ من
بۆ ڕۆژی قیامەت کە شەهیدی نەزەرت بم
ڕۆژێ نییە زەخمێ کە نەکا خەنجەری نازت
ئەمدی کەڕەتێ دەست لە ملێ یا کەمەرت بم
تۆ بیتو خودا بەسیەتی ئەم جەورە هەتا کەی
بەم جۆرە ئەمن هەڵگری زامی خەتەرت بم
ئەی باغی جەوانی منی دڵ لەتلەتی شێواو
عیللەت چییە بێ بەهرە لە سایە و سەمەرت بم
سەد مەرتەبە رابوردی و نەت پرسی لە حاڵم
با دەفعەیێ خاشاکی شەقامی سەفەرت بم
خۆش بەختییە بۆ «زاری» کە دایم بە دڵ و گیان
غەمبار و حەزین، خەستە و خوێنین جگەرت بم

## ۲۴

بۆ لە دنیادا ئەبێ من واریسی فەرهاد بم
نائومێد و دڵشکاو و ڕەنجەڕۆ و ناشاد بم
گەر بە دامانت بگا دەستم چ کوفرێ روو ئەدا؟
با لە ئێشی دەردی هیجرانت دەمێ ئازاد بم
تیری غەمزە نایەڵێ یەکلەحزە خاتر بسرەوێ
شیری ئەبرۆ نایەڵێ بێ ناڵە و فەریاد بم
پەرتەوی‌ئەنواری‌لوتفت‌کەوتەسەرعالەم تەواو
بۆ ئەبێ هەر من بە تەنها مەوریدی بێداد بم
پێوتم بادی‌سەحەر دوێنێ لە غونچەی دەمیەوە
بێ خەبەر نابێ ئەمن شیرینی بێ فەرهاد بم
دوێ سەری زوڵفی لەگەڵ دڵدا قڕەی بوو پێی‌دەوت
تۆ نەچیری لێرەدا هەرتا ئەمن سەییاد بم
حەزرەتی لەیلا کە بەم شێوە دڵ ئارا بێتە دەر
«زاریا» ناچار ئەبێ مەجنوونی مادەرزاد بم

## ٢٥

ئـــەی فیـــدای ســـەروی قـــەد و لێـــوانی شـــەکەربارتم
وەرمەگێـــڕە روو لـــە مـــن بێتاقـــەتی دیـــدارتم
بێرە سەیری سۆزی دڵ، چـاوم! ئـەبرژێ چـون کـەباب
سـینە پـڕ ئـاور لـە شـەوقی روومـەتی گوڵـنارتم
دڵ ئیقامـەتگاهی حەڵـقەی زوڵـفە یـا چـاهی زەنـەخ
باڵ و پـەڕ سـووتاو، پەروانـەی شـەمی روخسـارتم
گـــیری دانـــەی خـــاڵ داوی گێســـوانی عەنبـــەرین
مەسـتی عـەتری زوڵـفی رەشـکی نافـەی تاتـارتم
گۆشـــەی چـــاوی وەدەرخســـت و ئیشـــارەی کردمـــێ
وا وەرە مـن گـەنجی بـێمـار و گوڵـی بـێ خـارتم
لـەم شـەوی تاریکـەدا رۆژی جەماڵـت، هـات و سـەد
شوکور، وەک ئەستێرە مـەحوی پەرتـەوی ئـەنوارتم
ئـــاوڕێکم لێـــدەوە ئـــاور لـــە جەســـتەم بەرمـــەدە
چـاوم ئیسـتیغنا بەسـە! نـازانی چـەن زەخمـارتم
مـەنعی چـاوانم لـە سـەیری بـاغی روو بـۆ نـاکرێ
ئەمکوژی، یا رێم ئـەدەی، هـەر بولبولـی گولـزارتم
سـوجدەگاهی «زاری»یـە مێحـرابی دوو ئـەبرۆی تـۆ
تـا حـەیاتم بـێ، غـولامی نەرگسـی مـەی خـوارتم

## ٢٦

لە تاریکی شەوی هیجرام و موحتـاجی شـەمی رووتم
لە گـەنجی ئـارەزوو دوور و لەگـەڵ مـاری غـەمت جـووتم
هەموو کەس با بزانێ چاکە مـن وا گـیری داوی تـۆم
غـولامی خاڵـی مشـکین و قـەدی بـاریکی وەک مـووتم
لە سایەی ئـاوری شـەوقی جەماڵـی دڵـبەری تـۆوە
هـەماری نـەوتم و گـۆگرد، بەڵـکوو کـانی بـارووتم
ئەگەرچی ئاوری عیشقت بڵێسـەی دەمبـەدەم بـەرزە
مـنم ئەمـڕۆ سـەمەندەر ئـاورم هێلانـە، ناسـووتم

لە رۆژێکۆ موژەت تــەدبیری قەتڵــی عاشـقانی کــرد

مـــنی بـــێدڵ خـــەریکی کفـــنم و تـــەرتیبی تـــابووتم

لە من نابێ بپرسی وەسـفی شـێواوی دەروونم چـون

زەنەخـــدانی ئەتۆیـــە مەحبەســـی دڵ چـــاهی هـــاڕووتم

خودا رەحمێ بکا بەم بێ وجوودە تـا موزەییـەن بـێ

ئـەوی رێگــە و گوزەرگاتــە بــە قــەترەی ئەشـکی یـاقووتم

ئەگــەر داوود تــەوفیقی خــودا بێتــو نــەکا یــاری

ئــەمن کــەی پاڵــەوانی مەعرەکــەی مەیـدانی جـالووتم

گەدایێ بێ پەنا و بێ کـەس و گـەردن کەچـە «زاری»

بە رەحمەت دەستی بگـرە ئـەی غـولامی دەسـت و بـازووتم

## ٢٧

یـــادت دێوانـــەی کـــردم نـــەما ســـەبرو قـــەرارم

مـــردم نـــەهاتی جـــارێ ، بپرســـی حاڵـــی زارم

دووریــت عــەزابی ئــەلیم، وەسڵــت جــەنناتی نــەعیم

عالـــەم هـــەموو ئـــەزانێ ئـــەتۆی بەهەشــت و نـــارم

لە سایەی چـاوی کـاڵ و دوو ئـەبرۆی وەک مێحرابـت

دەمـــێ ئیمـــامی تەکیـــە، دەمـــێ دێوانـــەی شـــارم

کــە رووم لــێ وەرئەگێــڕی رۆژم لــێ ئــەبێ بــە شــەو

وەختم بــێ تــۆ هــەر شــەوە، وەسڵــی تۆیــە نــەهارم

کــارم چییــە بــە ســەحرا، بــە ســەیری بــاغ و بێســان

دیـــداری تۆیـــە بـــاغم، گوڵســـتانم، گوڵـــزارم

رووت وەرگێـــڕە بـــەم لاوە، نـــووری چـــاوم نـــەماوە

بەڵـــکوو رۆشـــن بێتـــەوە، دیـــدەی تاریـــک و تـــارم

لـــەو رۆژەوە بـــە پەرچـــەم رۆژی روخســـارت پۆشـــی

دەگاتـــە بـــانی فەلـــەک ســـەدای شـــین و هـــاوارم

تـــەکان مـــەدە بـــە زولفـــان بـــۆ گـــرتنی دڵـــی مـــن

بـــەر لـــەوە بێمـــە دنیـــا، بـــەو داوە گرفتـــارم

بـــۆ كوشـــتنی حـــەريفان وەختـــێ دەكـــا ئيشـــارە
هـــەزارێ بـــێ گيـــان ئـــەكا بـــە يـــەک عيشـــوە نيگـــارم
مـــردوو ئەوەيـــە ريشـــەی جـــەرگی نەبـــڕێ پـــەيكانت
زينـــدوو مـــنم ســـەرتاپا، بـــەو تـــيرە بريـنـــدارم
نـــازی چـــاوان ئـــەمكوژێ هـــەموو رۆژێ ســـەد دەفعـــە
چـــی ئـــەبێ لـــەعلی لـــەبت جـــارێ بكـــا تيمـــارم
قووەم نـــەماوە بـــێم، بـــێ، پـــێ لـــە ســـەر چـــاوم دانـــێ
بەڵكوو موشەڕەف ببـــێ بـــە خـــاكی پـــات، روخســـارم
نامـــدوێنێ لـــێم بەقينـــە، ئـــاهی دەروون بەتينـــە
وەڕەزم، هـــەراس لـــەم ژينـــە، لـــە حـــالی دڵ بێـــزارم
قـــەدت داری تووبايـــە، عالـــەمی لـــەبن دايـــە
رێم دە بێمـــە ئـــەو ســـايە، گـــەدام، رووتم، هـــەژارم
ميـــوەی داری وەفايـــە، غونچـــەی بـــاغی ســـەفايە
«زاری» خـــاكی ئاســـانەی شـــفايە بـــۆ ئـــازارم

## ٢٨

بـــە ئيســـتيغنا شـــكانت پشـــتی ســـەبرم
بفـــەرموو حـــازری كـــەن كفـــن وقـــەبرم
ئەگـــەر تـــۆ هـــەر وەهـــا بی و مـــن وەهـــا بم
مەحاڵـــە گيانەكـــەم ئـــەمجارە نـــەمرم
دڵـــم مـــوژدەم ئـــەداتێ ئـــەم ســـبەينێ
لـــە دەســـتەی ئـــەهلی ديدارايـــە حەشـــرم
بـــە يـــادی ســـەروی بـــاڵاو و گوڵـــی رووت
گوڵاو ئەڕژێ لـــە ســـەجع و نـــەزم و نەســـرم
ئيلاهـــی ئـــەم سوپاســـەت كـــەی ئـــەدا كـــەم
كە جورعـــە نۆشـــی بـــەزمی شـــاهی عەســـرم
بـــە مـــاچی خـــاكی ئاســـتانەی موبـــەددەل
بـــە «يُســـرە» و كامـــەرانی «عُســـری» دەهـــرم
لە ســـايەی شـــەوقی زولـــف وخاڵـــی تـــۆوە
قســـەم موشـــكە و عـــەبيرە و كـــانی عـــەترم
ئەگەر عيللەت نـــەبێ ئـــەو شـــەوقە، ديـــدە!
گـــەلێ كـــەمتر لـــە خـــاک و خـــارە قـــەدرم
دەمێكـــە چـــاوەڕێی ئـــەو رۆژەيـــە دڵ
بـــە«حمداللـــه» تلـــووعی داوە فـــەجرم
دەسم كەوت ئەو«مەتا» وا موشـــتەری بـــووم
گەيشـــتە موشـــتەری ئـــاڵای فـــەخرم
بـــە تـــەوفيقی خـــودا ئەمرۆكـــە «زاری»
بـــە دامـــانی ويساڵـــی دەســـت ئـــەگرم

## ٢٩

نامەی دڵ ئاوێزت هات نامە سەر چاوی کوێرم
گەشاوە بەرگی سیسی گوڵاڵەی گەرمەسێرم
هەم دڵ رۆشن بوو هەم چاو هەم قامەتی چەوتم راس
عومرێکی تازەی بەخشی بە گیانی لەمان تێرم
خودا بۆچی نەکریا بینێرێ وەک نووسیبووی
«دوو سێ شێعرم بۆ نووسی نەکرا ئێسە بینێرم»
چییە وەفا بەو عەهدە بفەرموون بەم زوانە
هەر ئەوەندە چاوەڕێم رۆژ بە ئەنگوس ئەژمێرم
ئەی بەحری پڕ لە گەوهەر شەپۆلێ با بێتە دەر
دوڕڕی مەقسوودی وەختم بە تاڵی رانەبوێرم
ساقی بێنە ئەو ئاوە کە خزرم وەعدەی داوە
بەڵکوو حەڵقەی ئەم داوە لە پای خاتر دەربێرم
ئاوری ئینتیزاری بەربووە لە جەستەی «زاری»
بە لوتفێ دەفعێ ئازارم بکە با گیان بسپێرم

## ٣٠

بێژی کەڕەتێ بە دڵ ببینم / گوڵزاری جەماڵی نازەنینم
دێوانە منم لە تاوی عەشقت / مەشغووڵی یەخەی کەوا درینم
ئارامی دڵی بە شیوەن ئاوام / بنچینەیی کەیف و پێکەنینم
قیبلەت کەچ ئەبێ ئەگەر بپرسی / ئەحواڵی دەروونی پڕ برینم؟
تێفکرە لە جەوری تۆیە جاری / دوو جۆگە لە چاوی پڕ گرینم
مەعلوومە لە داوی زولفی تاتات / دەرچوونی نییە نە دڵ نە دینم
سەر بێنە دیاری دڵ، بزانە / وەک شەمع تەنێکی ئاورینم
لەم گوڵشەنەدا هەتا قیامەت / مەمنووعە خەیاڵی هەڵفڕینم
«زاری» لە بەهەشتی وەسڵی یارا / مۆژدەت بدەمێ لە خالیدینم

## ٣١

سموومی شارەزووری هیجـری تـۆ ئـەی گیـانی شـیرینم
هەڵــیقرچان و بــرژانی دڵـــی پــڕ ئـێش و غـــەمگینم
فەلـــەک رێگـــای دیـــداری نـــەدامێ عـــومر دوایـــی هـــات
چییـــە تـــەدبیر تـــا فرســـەت بـــدا ئـــەمجارە بتبیـــنم
هەنگاوێکی خەیاڵی روو بە مەتڵەب گـەر هەڵـێنم، چـەرخ
هەزاران خـاری مـانیع سـاز ئـەکا ئەیکاتـە پـەرژینم
لـــە کـــوورەی ئیشـــتیاقا وا تـــواوە مـــەغز و ئێســـقانم
تەماشا کە چ رەنگ زەرد و لەڕ و بـێ هێـز و بـێ تیـنم
قەدیمە سـۆزی سـینەم ئـادەم و حـەوا لـە خـەودا بـوون
کە ئوستادی ئەزەل ئەم دەرسی شەوقەی کردە تەڵـقینم
مەگـەر سـاقی لـە مـن تـۆراوە، بـەر ناکـات بـەم لاوە؟
بڵـێ خـۆ کووپـە نـەڕژاوە بـە جامـێ بـات تەسـکینم
بە یاری مەی نـەبێ تـەی نابـێ ئـەم دەشـتە خەتەرناکـە
بدا بـەو بـادە تـەخفیفێ، بـە وەزنی بـاری سـەنگینم
لە زیندانی تـەنا، دڵ دەربـەڕی رووی کـردە بـاغی رووت
ئەڵێ مەجزووبی دانەی خـاڵ و داوی زولفـی موشـکینم
گـەدایێ رووت بـووم ئـەمما لـە سـایەی نەرگسـی تـۆوە
ئەوێستا خـاوەنی بـەرگی بـە خـوێنی دیـدە رەنگیـنم
بە هۆی بەرقێ درەخشاوە لـە بـەدری تەلعـەتت ئەمشـەو
هەموو عالـەم ئـەزانێ هەمـدەمی مـەجنوونی مسـکینم
غولامی هیممـەتی شـەوقم کـە بـێ گـەنج و سـپا خـاوەن
وڵاتی شـام و هیندوسـتان و میسـر و چـین و مـاچینم
بـە یـادی دوڕفشـانی لـەعلی رۆح ئـەفزات سـەرگەرمی
تـــەنینی پـــەرنیان و نـــەزمی گەردنبەنـــدی پـــەروینم
خەیاڵـی دڵـبەرم «زاری» کـە هەمـدەم بـێ چ دەربەسـتی
پەشـێوی حـاڵ و نـاڕێکی وەسـیلەی لازمـەی ژیـنم

## ٣٢

ئـــەی رۆحـــی رەوان و نـــووری چـــاوم
ئـــــــارامی دەروونی پڕلـــــــه تــــــاوم
موحتـــاجی نەســـیمی لـــوتفی تۆیــــه
پـــــەژموردە گوڵـــــی دڵــــی شـــــکاوم
فەریادڕەســــــی ئەگـــــەر نەفــــەرمووی
بـــێ قـــەدر و بـــەها، پـــەنا نـــەماوم
کۆمـــەک کـــه نـــەکا جـــەنابی لوقمـــان
نایێتــــــه دەرۆ دڕک لـــــــه چــــاوم
دەســـــتێ بـــه کـــەرەم نەدەیتــه باڵـــم
ســـەر تـــا بـــه قـــەدەم قـــومی قـــوڕاوم
وا خـــۆ دەخەمـــه حەســـاری لوتفـــت
بڕوانییــــــــه کــــــاری ناتــــــەواوم
تــــەدبیر چییــــه؟ ســــەلاح چۆنــــه؟
چ بکـــەم کـــه گـــەلێ هـــەوا بـــڵاوم
بـــازی کـــەرەمت مەگـــەر بـــه هیممـــەت
نـــــــێچیری ئەمـــــــەل بخاتـــــــه داوم
ئـــەم ژەنگـــی دەروونـــه گـــەر وەهـــا بـــێ
تێغێکـــــــی لـــــــه خاکـــــــەدا رزاوم
پاکانـــه بکـــه نـــەزەر لـــه ناپـــاک
پـــاکم کـــەرەوە کـــه مـــن خـــراوم
«زاری» نییـــەتی غـــەمێ کـــه چـــون تـــۆی
دەرمـــــانی دەروونی پـــــڕ زوخــــاوم

## ٣٣

پـــەردە لـــەو روخســـارە لادە بـــاوەکوو پەروانـــه شـــەم
ئاوری شەوقی ئەتۆ بـــەردا لـــه خـــۆ ســـەر تـــا قـــەدەم
گوێ له قرچەی جەرگی پارە بگـره چـون سـۆزی دەروون
ئـــاوری وایـــه کـــه ئـــاور لی ئـــەکا وەک بـــەرق رەم
بـــێ دڵـــی خۆشـــه ئەگـــەر دڵـــدار، دڵ بێنێتـــه جـــێ
بولبولی خۆشه ئەگەر گوڵ بێتـه خەنـدە سـوبحدەم
ئـــــەم شڵـــێوە و رێـــژەوی بـــاران و تـــاریکی هـــەوا
ئاوی چاو و دووکەڵی ئاهی منـه نـەک هـەور و تـەم
گـوم ئـەبێ لـەم دەشـته تاریـک و درێـژەی هیجـرەدا
گەر له شەوقی تەلعـەتت بـۆ دڵ چرایـێ هەڵـنەکەم
ئاشـــنا نـــابم وتی خـــاتر بـــه نـــووری ئاشـــنا
تاوەکوو مووسا لـه شـیوی ئەیمـەنا مـەئوا نەکـەم
چوونه دەر یەعقووبی لەو دەشته بـه چـل سـاڵ و ئـەمن
وا له هەشتا دام و لەو جێدا کـه ئـەووەڵ بـووم هـەم
گـــیری دنیـــا کـــەوتم و داوی فـــریبم کەوتـــه پـــا
جـەهل کێشـامی هـەتا خسـتمیه نێـو گێـژاوی غـەم
لـــەم قوڕاوەیـــدا وەهـــا غـــەرقم نـــەجاتم موشکوڵـــه
کوا «تەهمتەن»؟ هیممەتی خزری؟ پەنا بـۆ کـێ ببـەم
«زاریـــا» کونجێـــک و نـــانێکی رەق و بســـتێ حەســـیر
کافییـــه! زیـــاتر لەمـــه ئەســـپابی ئـــازارە و ئەلـــەم

## ٣٤

ئەبێ هەر من بە تـەنها خـۆ دوچـاری زەحمـەتی دڵ کـەم
لە دووریدا بە خوێنی دیدە سەفحەی سـینە گـوڵ گـوڵ کـەم
خــودا فرسـەت بـدا بیخاتـە دەسـتم دایـەنی وەسڵـت
لە خـاکی پـاکی بـەر دەرگاکـەتا ئـەم جـارە مـەنزڵ کـەم
هەڵیگرسـێنە تـۆ بیتـو خـودا فانۆسـی روخسـارت
لە بەر شەوقی چراتا بەڵکوو یەک شەو حەللی موشکوڵ کـەم
ئەڵـێم بەڵـکوو ببیسـێ دەنگـی هـاوارم نگاهـێ کـا
وەکوو پەروانـە بێـدەنگ بـا نـەبم تەقلیـدی بوڵـبوڵ کـەم
ئەگەر هەر لەحزە سەد جارم بە تیغی جـەور سـەر ببـڕێ
گەلێ بێ هیممەتم، تاڵـی ئەگـەر یـەک زەڕڕە حاسـڵ کـەم
بە شمشیری جـەفا بـا قیمـە بـێ، سـەر تـا بـە دامـانم
کە غـەیری شـەوقی دیـدارت بـە شـاری سـینە داخـڵ کـەم
لـە بـازاڕی موحیببەتـدا سـەراپا خـۆ لـە قـوڕ ئـەگرم
لە یادی تـۆ ئەگـەر یـەک لـەحزە دڵ خاڵـی و غـافڵ کـەم
ئیجـازەی ئینتیزارانـت بـە دیـدارێ ئـەدەی، تاکـەی
مـنی بـێ تاقـەتی بـۆ تـۆ پەشـێو، لێـرە تـامڵ کـەم؟
وەکوو «زاری» مەگەر بگـرم کـەنارێ لـەم شـەڕ و شـۆرە
هـەتا کـەی دڵ نیشـانەی نەشـتەری برژانگـی قـاتڵ کـەم

## ٣٥

لە خۆشی دوور و نـەزدیکم بـە سـەرچاوەی هــەموو دەردان
لە دەشتی مەینــەتا تــەنها مـنم حــەیران و ســەرگەردان
ئەترســـم پێکـــەوە کـــۆوە نـــەبن ئــــەم ئـــاور و ئـــاوە
وەکوو نەمدیوە پێکۆ بن شەمی وەسڵ و شــەوی هیجـران
لـــە چـــەرخی حەوتـــەمین تێپـــەڕ دەکــا ئــاوازی دڵخۆشـیم
ئەگـــەر بێڵـــن لـــە بـــەر دەرگاکـــەیانا ببمـــە درگـــاوان
گرفتـــاری کەمەنـــدی زولفـــە دڵ تێفکـــرە تـــا چەنـــدە
قسەی مزر و بە لەززەت هەر وەکوو ڕێواسی «هێجانـان»
بـــە دەوریـــدا وەکـــوو پەروانـــە بـــۆ گـــەردش نەکـــەم هـــەرتا
ئەسووتم ئەو کە بەم جۆرە شــەمی روخســاری داگرســان
ئەڵــێم بــادی ســەبا کەشــفی هــەناری بــاغی دڵــبەر کــە
ئیجازەی باغەبان وەربگـرە بـۆ گووشـین و دەس لێـدان
ئەگەرچی بێ تــەوەقوف چـوو وەهــا مەسـتی تەماشـا بـوو
نەما«زاری» لــە خاتریــا لــەبیری چـوو خەبــەر هێنــان

## ٣٦

ئەی دڵ چیە وا عــاجز و شـێواوی هەمیســان
پڕ زەحمەت و پڕمیحنەت وخوێناوی هەمیسان
ئاخر چ خەتەر هاتووە مەئمووری سەرت بـێ
مـــاتی و پەرێشـــانی و دامـــاوی هەمیســـان
چی ئاوری بەرداوەتە جەستەی نەحەســاوەت
بەم جۆرە گڕت گرتووە ســووتاوی هەمیســان
چیت بیستووە کێ زوڵمی لە تۆ کردووە بیڵــێ
بۆ دەگری و پڕ ناڵــە و زووخــاوی هەمیســان
وا زاهیرە ئەی دڵ کە نــەما ســەبر و قــەرارت
شێتی سەری زوڵف و پەری لێ داوی هەمیسان
مەیشارەوە ئەم سۆزە لە «زاری» کــە ئــەزانێ
عاشق بە جەمالــی گولــی تێـراوی هەمیســان

## ٣٧

بـــەلاما هـــات دوێ ســـەروی خـــەرامان
تەماشـــایەکی کـــرد و لێـــوی بـــزوان
فیـدای ئـەو نازەنینـە بم بـە رەحمـەت
دڵـــی بـــێ حاڵـــی بـــەو لێوانـــە لاوان
لـــە شـــاری حوســـنەوە تەشـــریفی هێنـــا
گوڵـــە و ئـــەڕوات بـــۆ ســـەیری گوڵســـتان
بـــە تـــەنها خەندەیـــەکی لێـــوی ئاڵـــی
بـــە جـــارێ ئـــەقڵ و هـــۆش و فـــامی ئـــەڕفان
دڵـــم ئێســـتە لـــە تـــۆی زوڵـــفایە خـــەوگای
کە حـــاڵ و ماڵـــی هـــەر دوو چـــوو بـــە تـــاڵان
نییـــــە ســـــەییادێ وا لـــــەم راوگـــــادا
بـــە هـــەر تـــیرێ ئـــەپێکێ ســـەد دڵ و گیـــان
لـــە عالەمـــدا مەگـــەر هـــەر ئـــەو بزانـــێ
بکـــا زەخـــم و بکـــا ئـــەو زەخمـــە دەرمـــان
لـــە تـــیر ئەنـــدازی وادا خـــۆ کەســـێ هـــەس
نـــەجاتی خـــۆ بـــدا نـــەخوات پـــەیکان
خودایـــا تـــۆ بکـــەی، ئـــەم راویـــارە
نـــەکا «زاری» لەمـــە زیـــاتر پەرێشـــان

## ٣٨

قەلبی من و شەوقی ئەو زانیوتە وەکوو چی وان؟
ئەم ئاگرە ئەو گوگرد، ئەم بادیە ئەو فنجان
ئاسوودە ئەبێ کەی بم من لەم غەمی دووریتە؟
پەنهانی کە تۆ دایم، وەک رۆژی چلەی زستان
لەو رۆژەوە چاوانت رێگەی بە دڵی من گرت
کارم چ نییە ئیللا ئاور لە جگەر بەردان
دوورم لە گوڵی گۆنای ئەو گوڵبنە بۆیێ وا
لەم وەختی بەهارەیدا پایزمە گەڵاڕێژان
یا رەببی بە لوتفی خۆت سا بیکە لە گەردنیا
وەک زولفی پەرێشانی، دەستی ئەمن ئاوێزان
ئەم تیری موژە و شیری ئەبرۆی دڵ ئاوێزەی
سەدها وەکوو فەرهادی بە خوێنی جگەر غەڵتان
سەر هەڵبڕە بڕوانە دەوروبەری خۆت ئێژم
بەو پڕتەوی روخسارەت پەروانە چیها سووتان
بەرقێ لە چرای کوڵمی دوێشەو کە درەخشاوە
سووتا وەکوو کێوی توور مەجمووعی رەگو ئێسقان
تەنها ئەمنی «زاری» شێتی غەمی دووری نیم
لەم دەشتە درێژەیدا چەن زیرەکە سەرگەردان

## ٣٩

دڵـــم، هۆشـــم، خەیاڵـــم، تـــالبی یـــەک لـــەحزە دیـــدارن
کە بێ دیـــدار هـــەر دەم هەمـــدەمی ســـەد ئـــێش و ئـــازارن
شەکەر بێ موشتەری، بێنرخە قەنـــدی میســـر هـــەر ئانـــێ
بە خەندە، لەعلی لێوی دڵـــبەرت ســـەرگەرمی گوفتـــارن
نیگاهـــێ کـــەی ئەکـــەی چـــاوم لـــە ئەحواڵـــی ئەوانـــەی وا
بـــە نـــووکی تـــیری برژانگـــی ســـیاهت ســـینە زەخمـــارن
بە سورمەی دڵبەری ئەو رۆژە چاوی رشـــت، ئـــەمن زانـــیم

به هەر تـیری مـوژەی جـەمعێ لـە هـەرلاوە گرفتـارن
به قانوونی نزاکـەت، شـانه بـۆ تـەرتیبی زولفـی چـوو
گـەڕاوە دی بـە هـەر تـارێکی سـەد «وامـق» گرفتـارن
لە حوسنی بی نـەزیر و بـێ حـەدت وا دێتـە بـەر چـاوم
به شەوقت نەک منی غەمدیده سەدها سـینه، پـڕ خـارن
نیگاهێکم تەمەننا بـوو لـە چـاوی، چـاوی لـێ پۆشـیم
خودا ئەو چاوە مەستانەی لـە «زاری» بـۆ چـی بێـزارن

## ٤٠

بڕوانه لە جۆشی دڵـەکەی پـڕ خەتـەری مـن
کوورەی گڕی هیجرانه لە پێ تا به سـەری مـن
سووتا بەشەرارەی شەمیشەوقتجەسەدم گشت
بـرژا بـە بڵێسـەی غـەمی دووری جگـەری مـن
هەر ئەونەیه ڕێژاوە دوو دیدەم لە غەمت خوێن
دەریایەکی خوێنینه هـەموو دەور و بـەری مـن
هەر لەحزە دەکـەن تـازە برینـێ لـە دەروونم
برژانگ و برۆی دڵبەرەکەی لەب شـەکەری مـن
لەم هەمووە برینانه لە جەستەم بە مژەی کـرد
جـارێکی نەپرسـی بەکـەرەم سـیم بـەری مـن
پامالّی غـەمی دووری ئەگـەرچی مـنم ئەمـڕۆ
دیـــداری جەبینییـــە محـــەللی نـــەزەری مـــن
دێوانه کەسـێکه کـە نـەکا مـەیلی تەماشـای
ئەنواری جەمالّی گوڵـەکەی عیشـوەگەری مـن
وەک داری بەهەشـتی سـەمەری کـامی دلانـە
شۆخێ کە بەری دا، بە دڵی بـێ سـەمەری مـن
«زاری» وەرە تێکوشه بە دڵ بەڵکوو وەدەس خا
تاجێ لە غوباری دەری مەحبووبە، سەری مـن

## ٤١

ئەی سەروی باغی خاتری پڕ شەوق وجۆشی من
چـاوت بـە نـاز هەڵـبڕە بڕفێنـە هۆشـی مـن
بـازاڕی عیشـوە ماتڵـە بـێ چـاوی مەسـتی تـۆ
وەک بەزمی تەرەب بێدەنگە بێشیعری خۆشی من
دەرمـانی دڵـی غـەمزەدە ناکـا بـە نیگاهـێ
مەحبووبی دڵبەر و بێ بـاک و لـەعل پۆشـی مـن
بـۆ هەڵـئەفڕێنی مەگەسـی دڵ لـە نـەباتت
ئـەی شـۆخی نازپـەروەری شـەکەر فرۆشـی مـن
بەینێکـە لـە سـایەی قـەدی ڕەعنایـەوە «زاری»
لێـوڕێژە لـە خـۆینی دڵـی بێچـارە کۆشـی مـن

## ٤٢

جەژنی قوربانە سبەی ئەی نازەنین
ئەمن و دڵ پێکۆ بە قوربانت ئەبین

مەیلی کوشتاری هەیە بۆیە وەها
تێغی ئەبرۆ تیژ ئەکا بۆ سەر بڕین

گیان ئەوا دەرچوو بڵێ لاکاتەوە
با شەڕەفیابی تەماشایی ببین

باغی حوسنە تەلعەتت لەو باغەدا
حەیفە بۆ بازی خەیاڵم هەڵفڕین

شارەزای ئەو باغە قەت ناکا هەوای
لالەزاری لەندەن و باغاتی چین

چاوەڕێ تاکەی بمێنم لێرەدا
یا بفەرموو بمکوژن یا بێژە بین

خۆنییە یەک لەحزە ئەی«زاری» نەکەن
تیری برژانگی لە خاتر سەد برین

## ٤٣

**«موغازەلە»ی شیخ الاسلامی سقز لەگەڵ «زاری» کەرتی ئەوەڵی هۆنراوەکە ، هی شێخ الاسلامە و کەرتی دووەم شیعری زارییە :**

ئەی «زاری» وەرە پێشۆ با پێکەوە زاری کەین
شینێ لە فیراقی یار وەک هەوری بەهاری کەین

لاشێعرێ بفەرموو تۆ ئەمنیش ئەولاکەی دی
بە موغازەلە تەقلیدی تاهیربەگ و ناری کەین

بۆ عومری لە دەس دەرچوو بێ فایدە و بەهرە
دوو جۆگە لە دوو دیدە بە نەدامەت جاری کەین

خۆ سەڵتەنەتی جوانی مەستانە عوبووری کرد
بەم پیریە با کەسبی زادێ لە هەژاری کەین

وا چاکە پەڕ و باڵ و ڕۆحێ لە بەدەندایە
بۆ سوحبەتی شەم هەر وەک پەروانە بە دیاری کەین

دووی نەفس وهەوا کەوتن وەک توڵە هەتاکوو کەی؟
با موودەتێ هاوکاری شێرانی شکاری کەین

بەم جیفەیە تێر نابێ ئەم مارە شەڕئەنگێزە
بێ با بە قولاوی وەرع مەردانە مەهاری کەین

گوڵزاری جوانیمان کافووری کە لێباری
عەیبێکی عەزیمە،ڕوو ڕەش میسلی بوخاری کەین

تەشریفی کەرامەت چون بۆ ئادەمی دورواوە
بێغیرەتییە ئێمە گەر بەر سەگی هاری کەین

یانی بەشەر ئەخلاقە نەک قامەتی ڕێکوڕاست
تەحقیق لە لاوێ نە، لای حاکمی شاری کەین

لەم سوورەتەدا ئادەم دانا کە بە ئەسما بوو
نابێ کە بە جێگەی خووی نالایەق و لاری کەین

سووڕەت بەگ و سیرەتسەگپڕکووچەو بازاڕە
نایابە جوانمەردێ، تا فەخر بە یاری کەین

بۆ ئێمە لە سەر مینبەر خەتابە و تەبلیغات
گوم ناوێ و پێواری تەسلیم بە «زاری» کەین

## ٤٤

خودا چ بکەم لە دەس بێ تاقەتی چاو      دڵێکم بوو ئەویشی خستە گێژاو
بەڕووی ئەودا ئەوێستا خوێن ئەڕێژێ      یەخە و داوێنی پڕکردم لەخوێناو
لەدنیادا نییە وەک تێئەفکرم      وەکوو من دەردەدار وخانە شێواو
بە تیری غەمزەی ئەو شۆخەن بریندار      دڵی پڕئێش وسینەی پڕ لە زووخاو
لەداوی زوڵفی بڕوانە بە هەر تای      دووسەد شابازە پابەسراو و گیراو
بە بێباکی وەکوو «حەجاجە» بۆقەتڵ      جوان و پیر وعالەم ناس وبێ ناو
چەپ و راسی تەماشا کە عوششاق      میسالی بولبولێکن واشە لێداو
دڵم بەینێکە بێ ئاسارە داخۆ      بەتیری کام تیرئەندازە کوژراو
بەسەرهاتی چییە لەکوێیە جێگای      لە «زاری» بۆچی وا خۆی کردە تۆراو

## ۴۵

سەفی ئەگریجەکانی هاتە سەر ڕوو      سوپاهی زەنگباری سەر فەرەنگ چوو
بپارێزە خودا ئەم تەیری دڵمە      لە دانەی خاڵ و حەڵقەی داوی گێسوو
سوپای برژانگی وێساون بە قەسدی      ئەوە بەر تیرەبارانم بدەن زوو
مەگەر بەرقی جەماڵی کەوتە دنیا      کەوا ئاور لە شاری سینە بەر بوو
پەری شێوە بە عیشوەی چاوی کاڵی      ئەبا هۆشم بە غارەت، دڵ بە جادوو
چ شەییادێکی چالاکە لە حوسنا      دووسەد عەنقا ئەکا پابەس بەیەک موو
بە «زاری» گەر نەکا ئەو شۆخە رەحمێ      گرفتاری هەزار ئافەت دەبێ زوو

## ۴۶

جەماڵی تۆیە ڕووناکی شەمی شەو      خودا بێبەش نەکا چاوی ئەمن لەو
شەوێکی بێ بەیانە ڕۆژی دووری      شەوی دیدار وەک ڕۆژێکە بێ شەو
لە خۆ بێزارە چاو ئەی دیدە سا بێ      بنێ پا دەفعەیێ سەر چاوی بێ خەو
خەوت بردم بە نازی نێرگسی کاڵ      میسالی واشە، پاساری، هەڵۆ، کەو
دڵم مەشکێنە با نەڕژێتە سەر خاک      خەزێنەی شەوقی تۆ وەک خوێنی خوسرەو
خەیاڵم هاتە سەیری باغت ئاگای      لە دانەی خاڵ و داوی زوڵفی تۆ نەو
چ شیرینێکە فەرهادی بە حەسرەت      نەکوشت، ئاگا بە ئەی دڵ تۆ نەبی بەو

مــن ئــەم دورڕ پاشــییەم ئــەو وەختــە زانی
لە لوتفت کەوتــە ســەر ئــەم خاکــە پەرتــەو

بــــە غـــەیری میهــری تـــو «زاری» محالـــە
بســێنی ســەقز و بانـــە بـــە یـــەک جـــەو

## ٤٧

دڵــم پـــڕ حەســرەت و ئــازارە ئەمشــەو
مەگـــەر شـــینی فیراقـــی یـــارە ئەمشـــەو

ڕەنگم زەردە، مــەقامم هــەردە وەک شێت
خــــەوم دەرد و خــــۆراکم ژارە ئەمشــــەو

سەرم پڕ ئــێش و ســینەم پــڕ لــە ســەودا
لـــە چاومـــدا مـــوژە وەک خـــارە ئەمشـــەو

لـــە وێرانـــەی مـــنی خـــاتر پەشـــێوا
خەفــەت ســاقی و غــەم مــەیخوارە ئەمشــەو

وەفا مــرد و موحەببــەت بــێ ســەمەر مــا
ســـەفا خـــەوت و جـــەفا بێـــدارە ئەمشـــەو

شـــەپۆلی ســـەیلی خوێنـــاوی دەروونم
وەکـــوو لافـــاوی ڕووو بـــەخوارە ئەمشـــەو

لـــە گـــەرمی ئـــاهم ئـــاور هاتـــە ناڵـــە
دوو چـــاوم میســـلی دوو جۆبـــارە ئەمشـــەو

جگــەر پــڕ ناڵــە و ســوراخە چــون نــەی
سەرم سەمتوور و ڕەگ چــون تــارە ئەمشــەو

دوچـــاری ســـۆزی هیجـــرە بۆیـــە «زاری»
لـــەگیان و ماڵـــی خـــۆ بێـــزارە ئەمشـــەو

## ٤٨

مەکــەن مــەنعم لــە شــین و ناڵــە ئەمشــەو
لـــە دووریـــدا مـــەزاقم تاڵـــە ئەمشـــەو

ئەوەنـــــدە ئارەزوومەنـــــدی بـــــەیانم
کە یەک لەحزەم لــە لا ســەد ساڵــە ئەمشــەو

دڵـــی بـــێ تـــاو و چـــاوانی پـــڕ ئـــاوم
ئـــەمان بێـــدار و ئـــەو بـــێ حاڵـــە ئەمشـــەو

ســـپای شـــادی قـــڕی تێکـــەوت و شـــکیا
بــە ســەرما لەشــکری غــەم زاڵــە ئەمشــەو

شـــکۆفەی شـــەوق و ســـۆزەی شـــادمانیم
بـــە لافـــاوی خەفـــەت پاماڵـــە ئەمشـــەو

خـــەریکی کۆچـــە گـــوڵ ژاکـــاوە بـــەرگی
چەمــەن پــڕ شــین و بولبــول لاڵــە ئەمشــەو

لـــە زووخـــاوی فیراقـــی نازەنینـــان
پیاڵـــەی ســـینە ماڵاماڵـــە ئەمشـــەو

دەفـــەم هـــەمدەردە بـــۆ هـــاوار و فریـــاد
ڕەفێقـــی شـــیوەنم شمشاڵـــە ئەمشـــەو

تـــواوە شـــەمعی بینـــایی، پەپوولـــەی
حەواســم بــێ پــەڕ و بــێ باڵــە ئەمشــەو

بـــە ڕوودا ئـــاوی چـــاوم دێـــت و ئێـــژی
بـــە زێـــڕا پـــەخش زیـــوی قاڵـــە ئەمشـــەو

بـــە یـــادی تـــاقی ئـــەبرۆ و چـــاوی شـــیرین
کـــەلاوەی بێســـتوونم ماڵـــە ئەمشـــەو

بەرەو مەقسوود شەودێزی ئومێدم
بەجێ ماوە، شەلە، بێ نالە ئەمشەو

مەگەر فەرهاد هیممەت کۆمەکێ کا
سەرم خاکی کەژ و لاپاڵە ئەمشەو

لە بەزمی خوسرەوانا شاهی بەختم
وەکوو پەرویزە بێ ئیقباڵە ئەمشەو

کەبابم سینەیی بریانە «زاری»
شەرابم ئاوی ئەشکی ئاڵە ئەمشەو

## ٤٩

وەکوو زوڵفت دڵم شێواوە ئەمشەو
لە دووری تۆ قورم پێواوە ئەمشەو

شەلالی خوێنە داوێن و بەرۆکم
ئەوندەم خوێنی دڵ رێژاوە ئەمشەو

دڵێکم بوو رەفیق و هەم زبانم
لە حەڵقەی پەرچەما جێ ماوە ئەمشەو

بڵاوە فیکرەتم وەک تاری گێسووت
وەکوو شێتێ پەری لێی داوە ئەمشەو

نەشێوێنێ خودا ئیقباڵی ساقی
نەویدی وەسڵی یاری داوە ئەمشەو

لە جۆشی شەوقی دیداری دڵ ئارام
پیاڵەی دیدە پڕ خوێناوە ئەمشەو

سەفا «زاری» نییە بۆ بەزمی ئێمە
شەرابم شەربەتم لیلاوە ئەمشەو

## ٥٠

قوربانی دەمت بم کە وەکوو کانی نەباتە
هەیهەی غەڵەتم وت کە قسەت ئاوی حەیاتە

هەر نوکتە کە بەو لێوە شەکەربارە ئەفەرمووی
سەد شادیە بۆ گوێگر و سەد عیزز و نەجاتە

شابازی خەیاڵم کە شکا باڵی فڕینی
وەک تەیری دڵم پابەسی گێسووی سیاتە

زەڕڕاتی وجوودم لە سەرم تا بە بەری پێ
پەروەردە بە شیری شەکەری میهر و وەفاتە

بڕوانە کە ئەم لاشە زەعیفە قەفەسێکە
جێی بولبولی شەوقی قەد و روخساری چراتە

سەر هەڵبڕە بڕوانە تەماشاکە ببینە
کوژراو و بریندراری موژەت پڕ بە وڵاتە

ئەو گەردە لە داوێنی کەواکەت کە ئەنیشێ
گیانی ئەمنە مایلی ماچی بەری پاتە

بۆ دەفعی بەلا و ئافەت و ئازاری جەماڵت
دڵ هەر وەکوو ڕۆحم سپەری تیری قەزاتە

مێحرابی موناجاتی منی «زاری»یە ئەبرۆت
لەو گومبەزەدا مەوریدی سەد فەیز و بەراتە

## ٥١

بە شەوقت زیندووە ئەم رەنجەڕۆتە    مەسووتێنە دڵی چون ماڵی خۆتە
بە برژانگت وەکوو غەربالە سینەم    جگەر لەت لەت بە شمشێری برۆتە
وەحش بوو بازی فیکرم ئێستە گیری    تەنابی تاری زولفی فیتنە جۆتە
ئەگەر چی دوورە ئەم بەینەی من و تۆ    دڵم گوێی هەر لە دەنگ و گوفتوگۆتە
ئەزانی بۆچی سێوم خۆش ئەوێ من؟    نموونەی دڵپەزێری رەنگ و بۆتە
لە قەندی لێوی وەک لەعلت شەفایێ    بدە بەم زامی ناسۆری بەسۆتە
ئەڵێ «زاری» بەرۆکم بەردە. ئێژم    عەلاجم ناکرێ دڵ دەستەمۆتە

## ٥٢

وەرە مەی گێڕ دەورێ دە بە بادە    بە جامێ خەرمەنی دەردم بە بادە
بە چاوی تۆ لە گوڵزاری ژیانا    تەماشایێکی ئەو رووتەم مورادە
فیدای ئەو روومەتانەت بم لە سەر رووت    بە پەنجەی ناز ئەو رووپۆشە لادە
گرفتاری سیارۆژیم بێ رووت    لە تاریکی سیا رۆژیم لادە
بڵێ ئەو هەورە با نەگرێ بەری رۆژ    بە تاوی ئەو هەتاوم سینە شادە
نەخۆشی دەردی دووریتم دەوایێ    لە دیدارت بە دەردی بێ دەوا دە
بە خاڵ و گەردنی زەردت شکستێ    بە نافەی مشکی چین و کارەبا دە
جیایی خۆ بڕی ریشەی حەیاتم    ژیانێکم بە جامێکی جیا دە
بە مەیلم خۆ نەچەرخا چەرخ «زاری»    خودا بەم چەرخە سا بادی فەنا دە

## ٥٣

ئەمڕۆکە دڵم پڕ لە غەم و حەسرەت و دەردە    مەیلم بە تەماشای کەژ و داوێنی هەردە
ئەی خاک بەسەر عاشقی بێچارە، نەسیبی    هەر تاب وتەب و جۆشی دەروون و دەمی سەردە
هەی، دڵ مەدە بەو خاڵی لەب و گەردنی مینا    ئافاتی خیرەد، خاڵی لەب و گەردنی زەردە
زۆرن لە چەمەندا سەمەن و سووسەن و نەسرین    بەم دڵبەریی و شوخیە، ئەم نەرگسە، فەردە
ئەی بادی سەحەر وەختی گوزارت بە چەمەندا    لوتفێ بکە، لەم بەندەوە بەو شایە خەبەردە
گیراوی قولاوی غەمی هیجرم، بە نیگاهێ    باڵ و پەڕی ئەم بولبولە لەم چەنبەرە بەردە
بڕوانە لە «زاری» کە لە دووریت وەکوو بەی    رەنگ‌زەردوجگەر ڕێش و تەن ئالوودە بە گەردە

## ٥٤

لە شەوقی قامەتی ئەو گوڵعوزارە
دڵم ئەمڕۆ بە سەد میحنەت دوچارە

چ لێقەوماو و بەدبەخت و پەرێشان
چ داماو و مەلوول و دەردەدارە

هەموو پەیکانی ئەندووهە نەوەک موو
ئەوی موویێ لە ئەعزاما دیارە

ئەوەندەم تیری غەم وا پێوە، جەستەم
وەکوو ژیشک سەراپا غەرقی خارە

لە غەم خاڵی نییە یەک لەحزە سینەم
بە شێوەن ئاوەدان و بێقەرارە

لە ماری زولفی بێ رەحمەت بپرسی
ئەزانی چەندە دڵ زەخماری مارە

بە چاوی کاڵت ئەم چاوانە ئاوی
لە دووری تۆ وەکوو هەوری بەهارە

هەموو تاوانی چاوانی عەجوولە
لە سەر کاهی دڵ ئەم کۆهانە بارە

منی فەوتان و خۆشی خستە گێژاو
چ گێژاوێ؟ کە ناپەیدا کەنارە

وەرە ساقی بە جامێ بگرە دەستم
چ جام؟ ئەو جامە بۆ ئەم دەردە چارە

پەیاپەی تێکە لوتفێ کە، بە یادی
لەبی لەعل و دوو چاوی ئەو نیگارە

بە بێ هۆشی مەگەر ئەم رێگە تەی بێ
کە هۆشیاری هەموو گەردە و غوبارە

مەکە «زاری» لە بەزمی بادە مەنعم
لە سایەی بادەوە لەیلم، نەهارە

## ٥٥

بەڵێ ئەمشەو شەوی بۆس و کەنارە
شەوی عیشوە و نشات و بەزمی یارە

شەوی وەسڵی نیگاری دڵ رفێنە
شەوی مەستی مەی و ساقی خومارە

شەوی کون کردنی دوڕڕە بە ئەڵماس
شەوی هەڵگرتنی قوفڵی بە کارە

شەوی تیر خستنە بۆ کەسری ئاماج
شەوی تەقڵەدەوی چابوک سەوارە

شەوی رەنگ کردنی فەرشی حەریرە
شەوی ماچ کردنی خەددەینی یارە

شەوی سا وا مەکەی ماهی مونیرە
شەوی ئیتر بە سەی مەمکی هەنارە

شەوی خۆ کوشتنە هاوارە «زاری»
بە تۆچی عالەمێ وا کامگارە

## ٥٦

بــە قوربــانی هەناســەی بەربــەیانت بم ســەبا دێــرە

هەواڵــێ بــۆ مــنی بــێ دڵ لــە ئــەوزاعی«ســبا» بێــرە

کــڵاوەی کێــوی کەللــە هــەوری غــەم گرتوویــە بڕوانــە

لــە ئــاوی دیــدە دامــان و یەخــەم ، گــۆلاوە، ئەســتێرە

لــە ژاکــاوی گــوڵ، ئــاخر باغــەبان نابــێ نیگاهــێ کــا

بە لوتفی دەفعی ئــازاری نەخۆشــی، شــەڕ نییــە، خێــرە

شــکانی پشــتی ســەبرم بــاری ئیســتغنای و نــازانم

لەبــەرچی تــورکی غــەمزەی دڵــڕفێنی هــەر بــەمن فێــرە

خــەوم وا رۆییــوە تــا رۆژی پــاک ئەســتێرە ئــەژمێرم

لــە راحــەت وام زانیــوە وەجــاخی تــالعم کــوێرە

چ دەربەستی نــەبوونی نــان و ئــاوە رۆحــی نەسرەوتووم

لــە کافــەی مەینــەتا شــاگردە، مەیگێــڕە لــە غــەم تێــرە

لەجەســتەمنەشــتەریغــەمهــەر ئەونــدە هەڵــچەقی نابــێ

تەسەوور وابکــەن مــوو بــێ بەســەرمۆ ، نــوکی خنجێــرە

پــەنا بــۆ کــێ ببــەم، دامــانی کــێ بگــرم، بــە کــێ بێــژم

وەکــوو مــەردان لــەم گێــژی بــەڵام ئــەمجارە دەربێــرە

نەکــەم بێهــوودە وێــژی چاکــە چــون زنجــیر ســەنگینی

قــەزا و دەرد و ناکــامی حەواڵــەی گــەردنی شــێرە

بــە دامــانی ســولەیمان دەســتی کۆتــاهی ئــەمن ناگــا

بــە لــوتفی خــۆ خــودا بینێــرەوە دووبــارە بــۆ ئێــرە

عــومر ئــەو لەحزەیــە، دیــدە بــە دیــداری منــەووەر بــێ

بــە غــەیری ئــەو دەمــە بــاقی حــەیاتت عــومر مــەژمێرە

بە پیری مەیکەدە بێژە، لەبەزمی بادە نۆشیدا
پیاڵەی بەختی ئەم بەدبەختە بۆچی وا سەرەوژێرە
نەکا بشکێت قەفەس، دەرچێ لەدەس بفڕێتو گوم بێ لێت
دڵئەی«زاری» بە حەڵقەی داوی ئەو سەییادە بسپێرە

## ٥٧

ئەمشەو دڵەکەم پڕ لە غەمە ماتە پەرۆشە
دوور بێ گوڵەکەم، عاجزە، ناساغە ، نەخۆشە

دێژن سەدەقە بەرگرە بۆ ئافەت و ئازار
سەد گیان بەفیدای جورعەیێ لەو چەشمەیی نۆشە

یارەب نەشکێ ڕەونەقی بازاڕی جەماڵی
تا ئاهووی سارای خوتەن نافە فرۆشە

بێ غونچەی پشکووتووی ڕوخساری گوڵستان
بڕوانە چ بێ ناڵە و فەریاد و خورۆشە

ئەی بادی بەیانی وەرە بەو نەرگسە بێژە
لەم بولبولە بێ تاقەتە ئەو ڕووتە مەپۆشە

ئەو لەحزە کە ڕووت لێمە ئەگەرچی شەوەزەنگ بێ
ڕۆژێکی سەعادەت سەمەری ڕۆشنی خۆشە

ئەی ساکنی سەر ئاوی بەقا هیممەتێ، جامێ،
بۆ کوشتنی ئەم «زاری»یە بێچارە مەکۆشە

## ٥٨

وەرە ساقی پیاڵەت پڕ لە مەی کە
بە جامێ ئەم بەساتی دەردە تەی کە

غەمی دنیا مەخۆ غەم سەممە، فیکرێ
لە دارا و جەم و کاووسی کەی کە

نییە لەم باغەدا شادی، تەماشای
ڕەنگی زەرد و دڵی کرمۆڵی بەی کە

چ بەزمێ بوو نەشێوا چاوەکەم، گوێ
لە فەریادی شکات ئامێزی نەی کە

بە داوێنی ئەدەب دەس بگرە داوای
حەیاتی خۆشی بێتاڵی لە حەی کە

عەجایب عارە بێ عاری لەگەڵ مووی
سپیدا لێرە بەولا حەیفە مەیکە

مەڕۆ بێڕێگە، بێ سەر ڕێگە، ئەسپی
هەوا و ئارەزوو مەردانە تەی کە

بەهاری عومر دوایی هات، بیری
تەهییەی بەرگ بۆ سەرمای دەی کە

لە غەفڵەتدا بڕاوە وەختی «زاری»
لە خەو هەستە کەم ئەمڕۆ نە سبەی کە

## ٥٩

دەمێکە هیجر هەمدەم و رەفێق و هـەمقەتارمـە
ئەگـەر فەلـەک رێگـە بـدا وەخـتی دیـداری یارمـە

خودا خودامە زوو برۆ زسـانی هیجـر، ئـارەزووی
زهـووری دەولـەتی گـوڵ و هـەوای نەوبەهارمـە

دڵـم لـە رۆیـنی فـیراق ئـەدا نەویـد و نەوبـەتی
تلـووعی رۆژی تەلعـەتی دیـداری گوڵـعوزارمە

لە ژێـر بـاری دووریـا، شکاوە پشـت و گـەردنم
هاوار، یار بـێ خەبـەر لـە وەزعـی حاڵـی زارمـە

شەوێ درێژە ئەم شەوە خودا بە سـەر کەسـا نـەیێ
دوچاری کەس نەوێ لەوا ئـەوی کـە مـن دوچارمـە

غەریبی شاری عیشقم و هەوای چاوی کـاڵ و خـاڵ
قووەی بەدەنمە، قووتمە، رەفیـق و غـەمگوسـارمە

بڕوانە چاوی دڵبەری بە تیری غـەمزە لـەت ئـەکا
هەموو دەقیقە سەد کـەڕەت ئـەم دڵـە بـێ قەرارمـە

لەبەینیهەوری زوڵفەوە کە سووچی زولفی دەرئەخا
ئەبا بـە یـەک کـەڕەت ئـەوی قـەرار و ئیختیارمـە

شەرابی شەوقی قامەتی کە رەشکی ئاوی کەوسـەرە
دەوای ئـێش و دەردمـە، شـفای ژار مارمـە

ئومێـدی رۆیـنی شـەوی سـەردی فـیراق «زاریـا»
بـە ئـاهی ئـاورینم و بـە چـاوی ئەشـکبارمە

## ٦٠

تا لـە بـەر چـاوی مـەقامت سـەر گلێنـەی چاومـە
گـەر لـە بـەر چـاوم نـەبی جێگـەت دڵـەی فەوتاومـە

گـەردی ئـاهم بـۆ ئـەوەی نـەگرێت دامـانی کـەوات
ئـاو پاشـی رێ، وەزیفـەی چـاوی پـڕ خوێناومـە

وامەزانـە خـادمێکی غـایبم هـەر جـێ ئـەچی
سـایەبانی سـەروی قـەددت رۆحـی لێقەوماومـە

دوێ لە باغـا تووشـی گـوڵ بـووم وتی چـۆنی؟ وتم
بولبـولی تـۆ مـات، سـۆزی خـاتری شـێواومە

پـێ وتم بـۆ وا سـەرت خۆڵاویـە دڵـبەر، وتم
وەی لـە دووری شـەمعی روخسـارت، قـوڕە پێواومـە

لـەم بیابـانی فـیراق و شـارەزووری هیجـرەدا
روئیـەتی بـەرقی جەماڵـت شـەربەت و بەفراومـە

«زاری» شێوا بوو وەلـێ هوشـیارە ئێسـتاکە گـەلێ
چونکـە شـەوقت هەمـدەمی ئەقڵـی پـەری لـێ داومـە

## ٦١

ئـەکا یـادی مـنی بێچـارە قـەت ئـەو شـایە حاشـا نـە
فەرامۆشـی ئەکـەم گیـانم هـەتا تێدایـە حاشـا نـە
قسـووری بـەختی خۆمـە دەفعـەیێ ناکەومـە بـیری
بڵـێم نامیهرەبـانی زەڕڕەیـێ لـەو دایـە حاشـا نـە
مـنم وێڵـی بیابـانی فـیراق و بێبەشـی دیـدار
لە پەروانـە بڵـێم ئـەو شـەمعە بـێ پەروایـە حاشـا نـە
ئەگـەر چـی ناکـەس و نائـەهل و نائینسـان و بێکـارەم
رەقیـب وا تێنـەگا مـەیلی دڵـم بـەو لایـە، حاشـا نـە
بینایی خۆمـە نـاقیس، دەرکی جیلـوەی گـوڵ ئەگەرناکـەم
چ نوقسـانێ لـە حوسـنی غونچـە گـوڵدایـە حاشـا نـە
لەسـایەی شـەوقی دڵـبەردا سـەرم دانـاوە ناجووڵـم
بـە ناکـامی چلـۆنم دەر ئەکـەن لـەو سـایە حاشـا نـە
سەروسەودای بولبول چۆن لەگەڵ گوڵدا ئەزەل پێکـهـات
دوایی قەت هەیـە بـۆ ئـەو سـەر و سـەودایە؟ حاشـا نـە
لـە نێـو پـۆلی خەریـدارانی یوسـفدا بڵـێی دەرکـەن
لە ریـزی مشـتەری ئـەم پـیرە بـێ سـەرمایە حاشـا نـە
مـوقیمی ئاسـتانی دڵـبەرم وا تێمەگـە «زاری»
کـە روو وەرگێـڕم و جـێ بێڵـم ئـەم دەرگایـە حاشـا نـە

## ٦٢

تەماشـاکە سـەفی پەرچـەم لـە سـەر کوڵـمی پەرێشـانە
بە قامەت سەروی بوسـتان و بـە روو خورشـیدی تابانـە
بـە بـاغی روویـدا بولبـول ئەگـەر جـارێ گـوزارێ کـا
هـەتا رۆژی قیامـەت دێـت، نـالان و غەزەلخانـە
بـە شـیرینی جەماڵـی تۆیـە شـیرین، تاڵـی ئـەوقاتم
لـە سـایەی قامـەتی تـۆوە«قەبەغڵـو» ئەرمەنسـتانە

بە رەسمی دڵــبەری ســادەی بــە شـێوەی وەک زولــەیخاوە
بــە کۆڵانــا گــوزاریٚ کــە هــەتا شـێخت لــە ســەر بانــە
لــەچاوی‌مەســتومــەمکی پــڕ چنــگ و خاڵــی دڵ ئــاوێزی
پیاڵـــە و قەنـــدوچا حـــازر بفـــەرموو«زاری» میوانـــە

## ٦٣

لـــە دووری تەلعـــەتی ئـــەو یارمانـــە
مـــن و نـــەی تـــا ســـەحەر هاوارمانـــە
مەگــەر هــەر نــەی بزانــیٚ دەردی دووری
کــە هـــەر ئـــەو هەمـــدەم و هەمکارمانـــە
لە سۆزی ئێمە شەمع ئاگایــە چــون ئــەو
بـــە تـــەنها مـــەحرەمی ئەســـرارمانە
ســـپا ســـالارەکانی لەشـــکری عیشـــق
پیـــادەی ســـەنگەری پەیکارمانـــە
وەکوو مەنسوور گوستاخیم ئەگــەر کــرد
ســـەری زولفـــانی دڵـــبەر، دارمانـــە
من و بولبول لــە شــەوقی گــوڵ هەمیشــە
چریکـــەی زکـــری یاگوڵـــزارمانە
لــە ئێشــی دەردی دووری ئاسمــان، بــۆم
بـــە تـــاو ئـــەگری، زەوی غەمبارمانـــە
نەویــدت پــیٚ ئــەدەم «زاری» کــە ئــاخر
کـــەمانی ئـــەبرۆی، خوونخوارمانـــە

## ٦٤

لــە ســەفحەی نامــە بینــیٚ دیٚ نەویــدی وەسڵــی جانانــە
لە نووکی خامە خوێن ئەڕژیٚ نیشانەی قوربی قوربانــە
دڵــم مــوژدەی ئــەدامیٚ بــۆ ئــەوەی قوربــانی قــەددی بم
سـیابەختیٚ وتی نابێـت کـە ئـەم قوربانــە، نوقسـانە
لــە ســەیری رووی‌دا دڵ کەوتــە بــەر تــیری مــوژەی بۆیــە
لە هەر جێگــەی کــە تێفکـری برینــە و جێگــە پەیکانــە
لـــە وەســـفی تـــاقی ئـــەبرۆیا دڵـــم سەرســـامە نـــازانی
کەمانــە یــا هــیلالی جێژنــە؟ یــا مێحــرابی پاکانــە
وەرە بڕوانـــە روخســـاری، بزانـــە چۆنـــە مـــن شـــێتم
ئەسێرەی سوبحە یا بــەدرە؟ وە یــا خورشـیدی تابانــە
کــەلامی دڵـــبەری یـــاڕەب بـــەچی تەشبیهـــ لایـــق بـــیٚ
رەحیقــە یــا شــەرابی کەوســەرە یــا ئــاوی حەیوانــە

نــەمامی قامــەتی ســەروی حەدیقــەی شــاه و شــەهبازی
بەڵــێ ئــەم داری تووبایــە و بیــارە بــاغی رزوانــە
ئەگــەر «زاری» بڵــێ وەک خــزرە پێــت وابــێ درۆناکــا
لەبەرچی؟چونکەسەردەستەیگوڵی گوڵــزاری عوسمانــە

## ٦٥

بــە چاڵــی گــەردنی تــۆ هــەر کــە ئــارامی دڵ و گیانــە
دڵ و گیــانم لــە تــاوی دووری ئــەو باڵاتــە بریانــە
بەدەستەی پەرچەم و غونچەیدەمونارنجی مەم هەر ســێ
لە شەوقی تۆ وەکــوو شــەم مــن بەشــم گریــان و گریانــە
بە خاڵی دڵــبەری لێــوی وەکــوو لــەعلی بەدەخشــانت
سەروســینەم بــە یــادت هــەردەمێ ســۆزێکی تریانــە
نەمامی شەوقی تۆ ریشــەی وەهــا مەحکــەم لــە دڵــدایە
نە خۆفی بــای شەماڵــی هــەس نــە بــاکێکی لــە زریانــە
بەتیپیزولفوسەربازی موژەت فەرموو کە رەحمێ کــەن
هــەتا کــەی بــۆ مــنی بێچــارە هــەر بکــوژ و ببڕیانــە
لەقرچەیقەلب و برژەیجەرگ و ناڵەی سینە گوێ بگری
ئــەزانی بــێ چــرای ئــەو رووتــە هەنگامــەی حەشــریانە
خودا بیکەی بە خاتر ســۆزی عیشــقی عاشــقانی خــۆت
نــەجاتی خــاتری«زاری» بــدە لــەم جۆشــی گریانــە

## ٦٦

بــە نــاز ئــەو چــاوە مەســتانەت هەڵــێنە
لەمــە زیــاتر قــەرارم لــێ مەســێنە
لــە هــەر گوڵــزارەدا دڵ تــێ ئــەفکرێ
لــە حوســن و دڵــبەریدا نیتــە وێنــە
بە قوربانی قــەدی ســەروت، ســەر و مــاڵ
لــە گێــژاوی فیراقــم، دڵ دەرێنــە
شــەوی دووری عەجــەب تاریکــە ســا بــۆ
تلووعی سوبحی وەسڵــی ئــەو رووتــە بێنــە
ئەونــدە تــیری موژگانــت لــە دڵ دام
لیباســم تــار و پــوودی ، غــەرقی خوێنــە
بــە هــەر تــا زوڵــفت ئاوێزانــە ســەد دڵ
مەگــەر ئــەم کارەبایــە، دڵ ڕفێنــە

شـکانی بـاری شـەوقت گـەردنی هـۆش
خـودا ئـەم بـارە چـەن گـەردن شـکێنە

بـە قەسـدی دیـتنی ڕۆژت لـە پـەردە
کە دەرهاتی ، بە سـەر هـاتم ، بـە پـێ نـە

لـە خـاکی عیشـقدا مەردانـە «زاری»
وەرە غـەیری وەفـا تـۆوێ مەچێنـە

## ٦٧

خەیاڵـت ئـاورێ بـوو کەوتـە سـینە
هەناسـەم ئیسـە بۆیـە ئاورینـە

وتم تـۆ بی خـودا راسـی بڵـێ پـێم
بـە ناهـەق کوشـتنی عاشـق چ دینـە؟

وتی بـێدەنـگ بـە ئـەی بـێدڵ مەناڵـە
خـەڵاتی ئێـوە واوەیلایـە ، شـینە

مەسـووتێنە وتم ئـەی شـەم سـەراپام
وتی ئەحواڵـی پەروانـە ببینـە

مەپرسـە چۆنـە دڵ بـۆ دیـتنی رووت
بـە گیانـت ، گیانـە نـەزدیکی فڕینـە

ئەکـەم داوای گوڵـزاری ویساڵـت
لـە رۆحـی پـاکی سوڵـتانی مەدینـە

تەوەسسـول بـۆ مـەرامت «زاری» بـەو کـە
کـە هـەر ئـەو «رحمـةً للعـالمین»ە

## ٦٨

ئەوەتا تیری موژەی ، کـەوانی ئـەبرۆ نـاوە
بۆ قەتڵـی عاشـقانی غـەمی دڵ بـێ حەسـاوە

بۆسەیری خاڵی لەعلی لێوی چووم و نـەمزانی
بـە دەوری ڕۆژی روویـا زوڵـفی بـڵاوە ، داوە

بەدووی وەسڵی دڵـبەردا لەگـەڵ هەناسـەی سـەردا
دڵ هەر وا لـە سـەفەردا چ بکـەم نایێتـە دواوە

ساقی بێنە ئـەو جامـە مەرهـەمی زۆخ و زامـە
لەمسینە پڕ سەودامە ئەمشەو هەر خوێن تکاوە

لەبەر دەردی هیجرانی ئەگریم شەو تا بـەیانی
لە دووری چاوەکانی ، دوو چاوم دوو شـەتاوە

ئەوە سـەرەوی رەوانـە یـا خـۆ ئـارامی گیانـە
یا قیبلـەی عاشـقانە؟ لـەو بانـە راوەسـتاوە

تا کەی ئیمـا و ئیشـارە؟ دەروونم پـڕ شـەرارە
عـەلاجی نـاوێ یـارە! بێـژە تـا نەسـووتاوە

پشتی هەڵکرد و رۆیی وەکخۆر لـە چـاو ئـاوا بـوو
قیامـەت پەیـدا ئـەبێ ئەگـەر لاکاتـە دواوە

لە شاری دڵ ڕۆڕۆیە ، شـینی هیجـرانی تۆیـە
چـاوت ئاڵـۆزە بۆیـە دەروونم ئاڵـۆزاوە

با بگریم و بسـووتم پەروانـەی شـەمعی رووتم
پـا بەسـراوی گێسـووتم بـەو داوە دڵ گـیراوە

بـە هیچـی تـر نـەزانی قرمـزی کەوشـەکانی
بـە سـەر خـاکی رێگایـا خـوێنی منـە ڕژاوە

وەختێ کەهاتی شـەوقی گۆنـات کەوتـە غەمخانـەم
نەمزانی تۆی وەمزانی مانگە گۆشـەی کێشـاوە

وا مەستی بـادەی شـەوقی باڵابەرزانـە قـەلبم
خەبەرێکی لە وەزعـی دیـن و دنیـای نـەماوە

چـاوێ کـە تـو نـەبینێ بێبەشـە لـە بینـایی
دڵێ کە تـۆ نەناسـێ دڵ نییـە، بـەردی نـاوە
بۆچی بە گۆشەی چاوێ لێمت نـەڕوانی تـاوێ
ئەگەر تـۆ مـەیلت واوێ ژیـانی مـن فـەوتاوە
ئـەزانی بـۆ غـەمگینم خۆینـاو دێ لـە بـرینم
سـەییادی نـازەنینم تـیری لـە جـەرگم داوە
عومرم ڕۆیی بە تاڵی لە حەسرەت لێـوی ئاڵـی
بە غەمزەی چاوی کاڵی، «زاری» جەرگم بـڕاوە

## ٦٩

ئـــەزانی بـــۆ دڵ ئاڵـــۆز و شـــێواوە؟
شـــەوی زولفـــی بـــە ســـەر ڕۆژا کشـــاوە
لـــە خـــۆ بـــۆ بەرنـــەدا پەروانـــە ئـــاور!
جەماڵـی شـەم کـە ئەمشـەو بـێ حەسـاوە
حـــەریف ئەمـــڕۆ دڵـــی زینـــدووم بـــە فـــەردێ
وەهـــا کـــردم غـــەمی مـــەرگم نـــەماوە
مەگـــەر ئـــەو فـــەردە ئـــاوی زینـــدەگی بـــوو
کـــە تـــەبعی وشـــکی ئێمـــەی پـــێ ژیـــاوە
بـــە چـــاوی تیـــژی هۆشـــت تـــێ بفکـــرە
لـــە حوســـنی ئـــەم ســـوئالە و ئـــەم جـــواوە
«وتم ماچـــێ لـــە خـــەرمانی گوڵـــی رووت
وتی بڕوانـــە کـــوا شەقڵـــی شـــکاوە»
خەیاڵـــم کەوتـــە ســـەر هۆنینـــەوەی دوڕ
لـــە ســـەر ئـــەم وەزنـــە بـــەم شـــێوە شـــیاوە
دوێ وێســـابوو لـــەو ســـەر ئـــاوە دەتـــوت
لـــە ســـەر ئـــاوی بـــەقا ســـەروە رواوە
وتم دەردم بـــە دیـــداریْ دەوا کـــە
وتی بمـــرە بـــە دەردی بـــێ‌دەواوە
وتم بـــۆ ســـوورە بـــەرگت وا بـــە جـــارێ
وتی خوێنـــە بـــە ســـەرمانا ڕژاوە
وتم هاتوومـــە ســـەیری ســـیحری چـــاوت
وتی دوورۆ کـــەوە ئەتخاتـــە چـــاوە
وتم بـــا بێمـــە ســـایەی چـــەتری گێســـووت
وتی هۆشـــت بـــێ کـــەی چـــەترە داوە
وتم وا دێمـــە بـــەر تـــاوی هـــەتاوت
وتی لاوە ئەســـووتی بـــەم هـــەتاوە
وتم ڕێگـــەم دە بۆبـــاغی گوڵانـــت
وتی مـــاری بـــە دەورا راکشـــاوە
وتم قووتـــێ لـــە یاقووتـــت وتی قـــەت
بەشـــەر لێـــوی لـــە یـــاقووتم نـــەداوە
وتم عـــەترێ لـــە مشـــکی گیســـوانت
وتی نـــە، ئـــەم خەیاڵـــە پووچـــە خـــاوە
وتم بینێـــرەوە دڵ هاتـــە باغـــت
وتی ڕێگـــەی نـــەجاتی بەســـتراوە
وتم خـــوێنم بـــە ناحـــەق بـــۆ ئـــەڕێژی؟
وتی ئاوێکـــە بـــۆ عاشـــق ڕژاوە
وتم «زاری» هـــەتاکوو کـــەی بناڵـــێ؟
وتی هـــەرتا لـــە تـــەنیا ڕۆح مـــاوە

## ٧٠

بۆ چەمەن لەو وەختەوە تەشریفەکەت هـاوردووە
وەک وەنەوشە گەردنم بۆ خزمەتت کەچ کـردووە

عەتری زوڵفی دڵبەرت ئەی نـازەنینی گوڵـبەدەن
ئابڕووی شیشەی گوڵاو و موشکی چینی بـردووە

لەم شەرابی عەشقە هەرکەس پیاڵەیەکی پڕ نەکرد
پی مەڵێ گیـانی لەبەردایـە، کەلاکـە و مـردووە

عاشقی بێچارە ئەقلی چۆن ئەبێ لـێ گـوم نـەبێ
مانگ و خورشید و گەلاوێژت کەتێکـەڵ کـردووە

خادمی مورغی سولەیمانم کەئەم سوبحەی خەبەر
بـۆ مـنی بێـدڵ لـە ئـەوزاعی سـەبا هـاوردووە

پڕ کە ساقی پیاڵەکەم تۆ بی خودا چونکـە رەقیـب
شوکری هەق شوێنی گومە لێرە، شەڕی لابردووە

ئاشـــقێکی ســـادقم «زاری» تەماشـــاکە چلـــۆن
بـو نیشـانەی تـیری موژگـانی دڵـم داکـردووە

## ٧١

بــۆ تەماشــا راکــە، بولبــول تــا زووە
حــــەزرەتی گــــوڵ بــــۆ گوڵســــتان هــــاتووە

غونچەیـە مـوژدەی نزیکـی وەسـڵ ئـەدا
قامــــەتی ســــەروە و هــــەناری گرتــــووە

بێنــە سـەیری لــەم شــەوی هیجرانــەدا
رۆژی روخســــاری تلــــووعی کــــردووە

دڵــــڕفێنی گــــەردنی وەک کارەبــــای
زایەڵــــە و شــــینی وە عالــــەم خســــتووە

گەرمــە بــازاڕی مــەی و بــەزمی ویسـاڵ
نــــاز و عیشــــوەی ســــاقیە و هــــاتوچووە

بــۆ ئەبــەد مــانی دەڵــێ عاشـق قسـەی
ئابــــڕووی ئــــاوی حــــەیاتی بــــردووە

هــۆش و ئیـدراکی بــە جـارێ وا رفـان
وا ئــــەزانم رۆژ و شــــەو، زوڵــــف و رووە

پێکــــەنینی عالــــەمی دێوانــــە کــــرد
تــــیری برژانگــــی هــــەزاری کوشــــتووە

کــــاروانی دڵ ئــــەبێ رووتــــۆ کــــرێ
پەرچــــەمی رێگــــەی نــــەجاتی بەســــتووە

وا دیــارە گــڕ لــە عاشــق بــەر ئــەدا
شــــەمعی روخســــاری کــــە داگرســــانووە

بـا لـە سـووتانم نەکـەی حاشـا ئەڵـێم
ئــــاوری تۆیــــە لــــە «زاری» بــــەربووە

## ٧٢

وجــــوودی ئێمــــە و شــــەوقی جەماڵــــت ئــــاور و کایــــە
هەتا ئەم شەوقە باقی بێ، تەن ئـەم سۆزیشـیە تێدایـە

دەمـێ شـێتم، دەمـێ عـاقڵ، دەمـێ سـاغم، دەمـێ ناسـاغ
جەنابی عیشق هـەر رۆژێ بـە نـەوعێ جلـوە فەرمایـە

شـــەمی روخســـاری هەڵـــکرد و خەیاڵـــی عالـــەمێکی بـــرد
خوداوەنـــدا چ ســـڕڕێکە تلـــووعی خـــۆر لـــە شـــەودایە
بـــە زەردەخەنـــدەوە دوێنـــێ وتی ئاخرتـــە بـــۆ ســـووتان
وەکوو پەروانە حـــازر بـــە، سبەی وەخـــتی تەماشـــایە
کە داری بـێ بـەر و بـێ سـێبەرم، نـەیبوو بـەری مەقسـوود
دە بیسووتێنە چـاوم چونکـە ئـەو سـووتانە ئەحیایـە
لـــە زوڵـــفی دڵـــبەرت بڕوانـــە وەختـــێ دێتـــە هـــاتوچۆ
کـە ئـاوێزانی هـەر تـارێکی پۆلـێ قـەلبی شـەیدایە
بـە شـێتی نیسـبەتی«زاری» ئـەبێ بـۆ چـی بـدەن یـاران
کە شـێتی قامـەتی ئـەو شـۆخە، هوشـیارانی دانایـە

## ٧٣

کـە ئـەڕوانێ ئـەزانم چـی ئەڵـێ بـەو چـاوە شـەهلایە
کە گەردن کەچ ئەکەم حاڵی ئەبێ مـن چـم لەدڵـدایە
لـە بـەینی ئێمـەدا هـەر چـاوە مەشغووڵـە بـە گوفتوگـۆ
لە ئەسڵا ئێمە بـێ دەنـگ و موحیبەتمانـە گۆیایـە
لـــە وەخـــتی غـــارەتی فـــام و شـــعووری عاشـــقا«زاری»
زبانی قوڕبەســەر چ بکـا؟ بـڕۆ شمشـیری بوڕڕایـە

## ٧٤

دەور دەوری ســـــاقی و پەیمانەیـــــە
جـــەژنی دیـــداری مـــنی دێوانەیـــە
دەوری ســـاقی گۆشـــەگیری خانـــەقای
دەرپەڕانـــد و مەســـتی ئـــەم دەورانەیـــە
دڵ فـــڕێ دە بێـــرە ریـــزی بێـــدڵان
عەیشی بـێ غـەم خاسـەی ئـەم مەسـتانەیە
نەقشـــی بـــەرچاوت تماشـــاگا نـــەبێ
وەخـــتی ســـەیری ئـــەم تماشـــاخانەیە
یـــادی نەققاشـــە رەفێقـــی رێگـــە بـــۆ
چوونـــە دەر لـــەم دەشـــتە بـــێ پایانەیـــە
خـــاکی بەدبـــەختی بـــە ســـەر خـــۆدا ئـــەکا
ئـــەو کەســـەی ســـەرگەرمی ئـــەم نەقشـــانەیە

بــا ســەرت نەشـکێ مــەیێ ئــەم ریــزەوە
تــۆ کــە ئــەم دەرســەت لــە لا ئەفســانەیە

بــۆ لــە تــاریکی هــەوا ترســم ببــێ؟
یــادی دڵــدارم شــەمی کاشــانەیە

پەرتــەوی رووی و دڵــی بێتاقــەتم
ئــەو وەکــوو شــەم ئــەم وەکــوو پەروانەیــە

ئیــددیعا لــەم رێگــەدا بــێ سـوودە زۆر
بــەرز، نــزم و ئاشــنا بێگانەیــە

رامــەبوورە وا بــە تیــژی تینــووەم
چــاوی ئــاوم لــەو چــەمی حەیوانەیــە

بێــژە بــا پێوانــە بــێ لێوانەکــەم
لێــوی وشــکم چــاوی لــەو لێوانەیــە

تــا هەناســەی ئــاخری «زاری» ئەڵــێ
ســەر نــە، رۆحــم خــاکی ئــەو کاشانەیە

## ٧٥

سەبا بڵێ بە گوڵ کە دڵ ئەوندە ئینتیزارییــە
هــەر نەفەســێ، هەمنەفەســی هــەزار بێقەرارییــە

بەیان کەی ئەدا خــودا شــەوی فــیراق تــا هەڵــێ
خورشیدی رووی وشۆڵەیێ بــدات لــەم هەژارییــە

نەهات دەفعەیێ بنــێ بــە نــاز پــا بەســەر مــەدا
کــە خــاکی پــای مەرهــەمی بــرینی دەردەدارییــە

دڵم لە سینە دەرپەڕی لە هــەور بــۆ نەهاتــە دەر؟
مــانگی چــواردە مەگــەر نقــابی زوڵــفی مارییــە

بە زوڵفی وەک شەوی نەکاهەتاوی روو بــەژێرەوە
هــەزار چــاو چــاوەڕێی نیگــای لالەزارییــە

بە ناز هات و پێکــەنی رفــانی هــۆش و فیکــرەتم
وتی زەمــانی مەســتییە چ وەخــتی هۆشــیارییە

تەیرێکیبێخەوە دڵم هەموو شــەوێک تــا ســەحەر
بە یادی سەیری نەرگسـت هــاواری یــا بەهارییــە

بە سەروی قامــەتت بڵــێ، لــە بــەزمی بێدڵانــەدا
بۆدەفعیئێشی زامیدڵ کە وەختی لــەنج و لارییــە

بێ شەوقی رووی دڵبەرت وەهــا مەزانــە دڵ بــژی
یادی جەماڵیئێوەچون، ئاوی حــەیاتی«زاری»یــە

## ٧٦

بــەو گوڵــە نازکــەم بڵــێ کــە دڵ هیلاکــی دوورییــە
شــفا و مەرهــەمی هــەموو بــرینی مــن حوزوورییــە

وتی گونــاهی خۆیــەتی بــەرگری وەســڵ و بــێ بەشــی
لە فەیزی لوتفی بــێ حــەدم، عیللــەتی پــڕ قســوورییە

ئەونــدەت ئینتیــزارە دڵ وەختــە لــە ســینە دەرپــەڕێ
بەم وەزعە هەر کە رازییە مەجبوورە، کەی ســەبوورییە؟

خــودا نــەکا لــە گــەردنم کەمەنــدی زولفــی تــو دەرێ
بێگانــەیی لــە شــەوقی تــۆ، کەماڵــی بــێ شــعوورییە

سەد پۆل گیانی عاشقی وەک منی لێوە هەر نەفەس
فیدای سەروی قامەت و گەردنی وەک بلوورییە
کەلیمی رۆح عازمی میسری ویساڵی دڵبەرە
خاکی حەریمی حوجرەکەی میسالی کێوی توورییە
دەمێکە «زاریا» دڵم گومە لە شیوی «ئەیمەنا»
چاوەڕوان شۆڵەیێ لە ئافتابی نوورییە

## ٧٧

له خەرمانی هۆشی دام بەرقی هەوای دیداری
چوومە گوڵزار و نەمدی گوڵی وێنەی روخساری
دڵبەر مەیلی نەماوە، بەرم ناکاتە لاوە
ناپرسێ لەم سووتاوە، لە حاڵی بێ قەراری
سەفی تەماشای دیدار، بووە بە مایەی ئازار
کە پەرژینە بە رەشمار باغی سێو و هەناری
وتم لەم سەودا لادەم، ئەم هەوا لە دڵ لا بەم
چی پەی پەی ئەپێکێ دڵ پەیکانی نادیاری
ئەمە گوناهی چاوە کەوتوومەتە ئەم داوە
خودا چ لێ قەوماوە دڵی غەمباری «زاری»

## ٧٨

ئادەمی تۆ؟ پێم بڵێ یا خۆ پەری؟
وا ئەوەندە جوان و زیبا پەیکەری
دڵ زەدەی تیری موحیببەت بۆ نەبێ
تۆ کە بەم جۆرە لەتیف و دڵبەری
زینەتی باغ ئەی نەمامی ئارەزوو
حەیفە وا بێ میوە و بێ سێبەری
گەردنی مینا هەڵێنە با بلوور
نرخی بشکێ لی نەپرسێ مشتەری
بۆ لە خۆ پەروانە ئاور بەرنەدا؟
رامەبوورە وا بە لاما سەرسەری
گوێ دە، ئەم غەوواسی شەوقە چی ئەڵێ
ئەی دوڕی دەریای ناز و دڵبەری
سێوەکانی باغت چەن قیمەتین
سەندنی مومکین ئەوێ بۆ مشتەری؟!
ئاوڕی داوە بە خەندە پێ وتم
بێ بەها نابێ کە دەستی بۆ بەری
کاری زێو و زەڕ نییە ئەم مامەڵە
گیان و سەر هەر دوو ئەبێ با مشتەری
«زاری» نامەردی ئەگەر لەم مامەڵە
تا حەیاتت باقیە دەس هەڵگری

## ٧٩

دووری محاڵە لەو گوڵی گۆناتە ئەی پەری
ئەگەرچی رۆح بە غارەت وەکوو دڵم بەری
زانیوتە چلۆنە دڵی بێچارە لە دووریت
ئەم هەر وەکوو پەروانە ئەتۆ شەمعی خاوەری

فامم نــەماوە بڵــێم قامــەتت لــەچی ئــەچێ
شمشادی ئەتۆ؟ سەروی؟ یا داری عەرعــەری؟

مەم پرتەقاڵ و پستە دەم و سێوە روومــەتت
«لا حولــە و لاقوتــە»، دارێکــی پــڕ بــەری

گــەر بێتــە لالــەزار بــە شــوکرانە دائــەنێ
وەنەوشە وەکوو زولف لە بەر پێتدا ســەری

ئەی رۆحــی رەوانم وەرە «زاری» تەمایــەرە
ئەم دەرد و ئێشی هیجرە بە یــەک غــەمزە لابــەری

## ٨٠

بــەهارە و بــاغ بــەرگی ســەوزی پۆشــی
ئــەکا بــادی ســەبا عەنبــەر فرۆشــی

لــە ســەرمادا ســەرو وەک نــەی ئەلــەرزا
نەجاتی بوو لــە زەحمــەت کەوتــە خۆشــی

بــــڕاوە دەوری جــــەوری بەهمــــەن و دەی
دەمــی ســـەیری گوڵانــە و بــادە نۆشــی

لـــە گێـــژاوی غــەما ســاقی ئــەخنکێم
بـــە جامــێ بـــۆ نـــەجاتم تێنەکۆشـــی

لـــە تـــیری ئــاە ناترســی بــدا لێــت
لـــە بولبـــول وا گوڵاڵـــەی روو ئەپۆشـــی

دڵا بڕوانـــــە بـــــەم گوڵـــــزارەدا، تــــا
نـــەجاتت بـــێ لـــە هـــەرگاهێ پەرۆشـــی

دەوایــە ســەیری ئــەم گوڵگەشــتە «زاری»
دەوا پێویســـتە بـــۆ دەفعـــی نەخۆشـــی

دڵا وەربگـــــرە پەیمانـــــە محاڵـــــە
نـــەجاتت لـــەو قـــوڕاوە تــا بــە هۆشــی

بـــە ئومێـــدی شـــەفا هاتینـــە گوڵـــزار
کــە ســەیری باغــە دەرمــانی نەخۆشــی

## ٨١

کە تۆ پێت بێتە سەر فەرشی چەمەن ئەو رووتە بنــوێنی
لە شاهی عیشوە ئەفسەر وەک خەیاڵی ئێمــە ئــەڕفێنی

بــە چــاوی عیشــوەکەت بڕوانــە بــێ دڵ وا لــە گێــژاوا
مەگەر تۆ ئەم گرفتارە بــە تــای ئــەو زولفــە دەربــێنی

کــەلامت بــێ «مــەلا» حەیفــە لــە حەڵــقەی نازەنینانــا
شەوێ پێویســتە بــازاڕی شــەمی ئــەم شــارە بشــکێنی

شــێوا، بــێقامــەتت نــازی گــوڵاڵانی چەمــەن یەکســەر
شکانت شەئنیدەریا لەو دەمەت چون گەوهەر ئــەڕژێنی

شـــەمامەی نازکـت بـێنـازە، بـێگوشـینی دەسـتی دڵ

لە شۆری بێ حەدم تێفکـرە وەختـێ زولـف ئـەبزوێنی

لە کانی گەوهــەرت دوێ گەوهــەرانی خسـتە دەر زانـیم

دڵــی پـــەرویزی بێچـــارە بـــە رووی شـیرینت ئـەڕفێنی

بە شۆخی بێخی هەڵکەندم شکاتی ئێشـی سـا کـەم کـە

لە گەرمی ئەو چرا «زاری» لە شەوقی خـۆ ئەسـووتێنی

## ٨٢

چ کـوفرێ روو ئـەدا چـاوم بـرینم سـەختە چـاری کـەی

بە ماچێ دەفعەیێ رەحمێ بە لێوی وشکی «زاری» کـەی

وەهـا غــەرقی خەیاڵــی تۆیـە دڵ، حیسسـی ئەلــەم ناکـا

ئەگەر هەر لەحزە سەد جۆگە لەخوێنیسینە جاری کەی

منالــی دڵ گــرووی قەنــدی لــەبی تــۆی گرتــووە گیانــە

چییە ژیریبە سێوی مەمک و کولمی وەک هەناری کـەی

دەمێکـــە زەهـــری دووری تـــۆ خـــۆراکی قـــەلبی ناشـــادە

خودا هەڵــناگرێ ئیتـر دوچـاری زەهـری مـاری کـەی

لــە موژگـانی سـیاهت گـەر بپرسـی حاڵــی مـن، دێـژێ

لەخوێنیغەرقە سەر تا پـا چ لازم شـێت و هـاری کـەی

لـــە بـاغی رووتدا دڵ بولبولــێ مەسـت و غــەزەڵ خوانــە

هەڵیمەفرێنە زوڵمە، وێڵی دەشـت و کۆهسـاری کـەی

کـە «زاری» سـاکنی کووچــەی غـەمی باڵاتــە بـا جـارێ

لە رێگەی لوتفەوە بـەو لێـوە ئاڵـەت پرسـیاری کـەی

## ٨٣

کـەی عیلاجـی دەردەکـەم وەک بووعـەلی سـینا ئەکـەی؟
چـاوی نابینـا بـە گـەردی دامـەنت بینـا ئەکـەی؟
ئـەم هـەموو حوسـنە لـە تـۆدا کۆیـە مـن وا تێئەگـەم
نـازی زیبـایی بەسـەر کۆگـای پـەروینا ئەکـەی
شـانە بـۆ ئارایشـی گێسـوو تـەکانی دا، وتم
حەبسی پۆلی دڵ لە حەڵقەی زولفی موشکینا ئەکەی
تێغـی بـێ بـاکی وجـوودت ریشـەی جـەرگی بـڕیم
عاقیبەت دەفـنم لـە کفـنی سـووری خوێنینـا ئەکـەی
خۆزگە بەو رۆژە لە سەر قـەبرم ئەوێسـی یـەک نەفـەس
تەعزیـەی مـەرگم لەگـەڵ تـەکفین و تەڵـقینا ئەکـەی
«زاریـا» هۆشـت ببـێ گـەر سـادقی لـەم عیشـقەدا
سەرفی عومری خۆ لە شەوقی سەرو و نەسرینا ئەکـەی

## ٨٤

کەی بە چاوی مەرحەمەت جارێ تەماشـامان ئەکـەی
مەرهـەمی زامـی دڵـی پـڕ ئـێش و سـەودامان ئەکـەی
دەردی دووری کوشـتمی، لێمـت نەپرسـی دەفعـەیێ
کەی بە دیدارێ لـەپـاش ئـەم مەرگـە ئـەحیامان ئەکـەی
سەد کەڕەت قوربانی ئەو خاکەم کە کەوشت ماچ ئەکا
کەی بە وەجهـی لوتـف تێکـەڵ خـاکی بـەرپامان ئەکـەی
گیان و دڵ، گیان و دڵم ئامـادە هـەر دوو بـۆ فیـدات
کـەی حەواڵـەی دەشـتی قوربانگـای مینامـان ئەکـەی
سـینە سـووتاوانی شـەوقین و هـەموو وا چـاوەڕێ
کەی بە ئـاوی وەسـڵ دەفعـی سـۆزی گـەرمامان ئەکـەی
سەبرە (مفتـاح الفـرج) «زاری» ئەگـەر سـەبرت ببـێ
تێـر سـەیری سـەرووی سەروسـتانی هـەورامان ئەکـەی

## ٨٥

لای ئـــەو دڵـــە وا نوکتـــە بـــە میـــزانی ئەســـەنجێ
مـــەحبووبتر ئـــەم شـــەوقەیە هـــەر زەڕڕە لـــە گـــەنجێ
دوێنێکـــە بـــە نـــەرگس لـــە چەمەنـــدا بـــە دەنگـــی بـــەرز
بولبولمـــە موســـەدق خەبـــەرم داوە لـــە چـــەن جـــێ
ســـوبحا کـــە گوڵـــەندامی ئـــەمن دێتـــە تەماشـــا
نـــازاری منـــە خـــاتری رابگـــرە نـــەڕەنجێ
(زاری) نیـــەتی غـــەیری ویســـالی لـــە نـــەزەردا
گـــەر بـــەخت بکـــا کۆمـــەک و ئـــەم کـــارە بگونجـــێ

## ٨٦

دەبـێ کـەی بـێ لەگـەڵ زیبـا نگـارێ
بـه کـەیفی خـۆم بکـەم بـۆس و کـەنارێ
لـە بـاغی وەسڵـدا هـەر وەک عـەنادڵ
بـە خۆشـی بـوگزەرێنم رۆژگـارێ
دەبێ کەی بێ دوو حوققـەی سیمی عـەییار
لـە دەس بگـرم بـە بـێ باکی لـە یـارێ
دەبێ کەی بێ بـە بـێپـەردە لـە گـەڵ گـوڵ
بکـەم عەیشـێ بـە بـێ غـەم وەک هـوزارێ
دەبـێ کـەی بـێ وەکـوو پەروانـەی شـەم
لـە عەشـقت خـۆ بسـووتێنم بـەجارێ
دەبـێ کـەی بـێ لـە کونجێـدا بـە تـەنها
بنیشـم مـن لەگـەڵ لالـە عـوزارێ
ئـەلا «زاری» بـە مـەهجووری بناڵـە
کـە نـابینی وەکـوو خـۆت بێقـەرارێ

## ٨٧

دووریت ئەگەرچی ناکا لە زەحمەتم قوسووریێ
یادی بەهاری وەسڵت ئـەدا بـە دڵ سـروورێ
حەیفە بە ناز مەمکووژە، ئەسـیری چـاوی کاڵـت
جارێ بکە بە لایا بـە مەرحەمـەت عوبـوورێ
ئەی نووری چـاوی«زاری» بـۆچی بـە دەردەداری
لەتاوی هیجری باڵات ئەم عـومرە راببـوورێ

## ٨٨

شــەمی ڕوخســاری داگرســان و هاتــە بەزمــەوە دوێنــێ
بــە جەرگــەی بێــدڵان حوســنی خــودا پێــداوی بنوێنــێ
هەزاران مورغی زیرەک گـیر ئـەدا ئـەو شـۆخە بـێ تایـە
بە شـێوەی دڵـبەری هـەر وەخـت لـەعلی لێـوی بجوێنـێ
لەســەر ڕوو پــەردە گــەر لادات و ڕۆژی تەلعــەتی دەرخــا
بەشەر بێ بەش لە هۆش و دڵ، مەلەک «لاحول» ئـەخوێنێ
بەهــەر لادا کــە بــڕوانی ئــەبینی مەحشــەرێ بــەرپا
عــەجایب گەرمــە بــازاڕی، خــودا بــازاڕی نەشــکێنێ
لەشــەمعێکی وەهــا دووری قســووره و فــەڕزە نــەزدیکی
بەڵێ هۆشـیار شەخسـێکە کـە فـەڕزی وەخـت نـەچوێنێ
لــە تــاریکی هــەوادا شەمشــەمە کــوێرە نــەکا مــەنزڵ
چییــە گــەر بێتــە بــەر ئــەم ڕۆژە چـاوی هـۆش هەڵـبێنێ
لەدەوری مەنزڵــی کۆکــۆ نــەخۆش و ســاغ وەک پــوورەی
هەنگم دی ئەم هەموو سـەبرە خوداوەنـدا لـە کـوێ دێنـێ
حەقیقەت خزمـەتی خەڵـکەتەریقەت، نەک دەف و خەنجـەر
دڵی کێ پەیرەوی ئـەم قەولـە، حەققـە، حـەق بسـەلمێنێ
چرا بوو هات و ڕۆیـی کـەس نـەبوو لی وەرگـرێ نـووری
نەبوو یەک مشتەری یەک حەببـە لـەو توججـارە بسـتێنێ
لــە داوی مــەکری دێــوی نەفســی بــێ ئینســاف نەمـدیوە
کــە بــێ ئوســتاد شــاگردێ بزانــێ پــای دەربێنــێ
تەســەوور وا نــەکا پــەرواری دابەسـراوی ســەر ئــاخوڕ
لەگــەڵ لاغــر میانــانی ئەســیلا پــەل ببزوێنــێ

ریــازەت کێشــی دڵ پــاکی لــە حــیرس و ئــارەزوو ئــازاد

ئــەبێ ئــەم گۆیــە لــەم مەیدانــە وەک مــەردان بــڕفێنێ

عەقیــدەت وا نــەبێ قــەت بــێ تەعــەللوم ببیــە عەللامــە

فــەقێ نابێتــە مامۆســا هــەتاکوو دەرس نــەخوێنێ

دڵــت گــەر زینــدووە «زاری» ئــەبێ تەقلیــدی مووســا کــا

لــە شــاگردی خــزردا بەڵــکوو عیرفانــێ وەدەس بێنــێ

## ١

**شەوێک لە ماڵی مەلا محەممەدی شێخەلئیسلامی ئەبێ مەلا محەممەد لۆمەی ئەکا گوایە لیباسی مەلایی بۆ لەبەر ناکا؟ لە جەمعی دانیشتوانا پێی ئەڵێ دەستێ جل و بەرگی مەلاییم بۆ داناوی هەر ئەمشەو ئەیدەمە خزمەتت... دانیشتووان یەکیەک و دوو دوو ئەڕۆن و مەلا محەممەد بەرگری لە ڕۆیشتنی مامۆستا ئەکا تا مەجلیس چۆڵ ئەبێ.**

**پاش ماوەیەک مامۆستایش بە عەزمی ڕۆیشتن هەڵئەسێ و مەلا محەممەد خوا حافیزی لێ ئەکات و باسێ لە وەعدەکەی ناکا، ئەم هەڵبەستە بەو بۆنەوە وێژراوە:**

«شیخ الاسلام» وەعدەیەکی دا — دەسبەجێ بوو بە پووش بردی با
پایزی ئەم بەهارە نازانم — بۆچی وا گورج هەڵمەتی هێنا
وەعدەکەی تۆش هەر لفی ئەو بوو — یانی ئەو دوولفە لە یەک زگ زا
گوێم زرنگاوە بۆ ئەو خەلاتانە — پووشی وەرگرتنم وەلێ فڕدا
کۆنە پۆشاکی خۆم کافیمە — بۆ شڕە ئابڕووم بۆ بڕوا؟
من شکاتم لە «عەمر و زەید» نییە — بە ئیرادەی خودایە مەنع و عەتا
بۆ هەموو لایێ دەس درێژ کردن — نەقسە بۆ ئابڕوو و بۆ تەقوا
خاوەنی دەستی ژوور، سەربەرزە — خاوەنی دەستی ژێرەوە رسوا
وا مەزانە کە بێ سەمەر بووبن — ئەو نەمامانە بەری چاکیان دا
یانی نابێ بدا کەس «زاری» — تا بژی، هیچ وەعدەیەکی وا

## ٢

گوێ لە نەی بگرە لەریشەی جەرگ ئاور بەرئەدا — شەرحی حاڵی عوودوپەروانە و شەم و مەجمەر ئەدا
سەیری جەستەی کون کونی ناکەن کە ئاو زووخی هیجر — هەم لەسینەو هەم لەسەر وێنەی سەماوەر کوڵ ئەدا؟
دەردی تەنهایی مەگەر هەر نەی بزانێ چۆنە، چون — ئاوری ئاهی دەروونی گڕ لە عالەم بەر ئەدا
سۆزی دڵبرژێنی ناڵەی، مەغزی سەر دێنێتە جۆش — جۆشی فرمێسکی بە دایەن خەرمەنی گەوهەر ئەدا
پەنجەیی نەیچی عەجایب هەر کە ئاور ناگرێ — ئەو دەمەی وا شەرح و سۆزی فیرقەتی دڵبەر ئەدا
بۆ تەماشای ئەم جگەر برژاوە ناکەن رۆژ و شەو — ئاه و فەریادی نیشانەی شیوەنی مەحشەر ئەدا
نەشتەری دووری بڕی ریشەی حەیاتی بێ گومان — بۆیە بەرگی وا بە تیژی شێوەیی نەشتەر ئەدا
حەیفە لەم پووشە کە کەمتر بێ بەشەر بەم هۆشەوە — نووری سەدتەعنە لەخورشید و مەه و ئەختەر ئەدا

چۆن ئەبێ ئاقڵ لە دڵ دەرکا غەمی یار و دیار
بۆ دیار و یار و گیان و ماڵ و حاڵ وا سەر ئەدا

تا بە دامانی دڵ ئارامی نەگا دەستی نیاز
باغی کۆشش گیانی من هەر بێ مورادی بەر ئەدا

لەحزەیێ دیداری یارانی هەق و هەق ئاشنا
بەهرەیی سەد ئاوی حەیوان و چەمی کەوسەر ئەدا

عیشق مامۆسامە ئەی «زاری» قسەم بۆیێ وەکوو
خزر ئاوی زیندەگی پیشانی ئەسکەندەر ئەدا

## ٣

بە ساغی لەش مەنازە گیانە هاکا
مەرگ هات و گومی کردی لە خاکا

عەجەب دەردێکە مردن هیچ زیڕۆح
نییە و نابێ لە بەردەسیا هەڕا کا

مەکە ئەی نەفسی نابینا و بێ هۆش
وەکوو سەگ سەر بە ناوی هەر کەلاکا

مەدە گەوهەر بە پوولی قەلب و رووکەش
کەریش مەعلوومە ئەم سەودایە ناکا

سەرت با دانەخەی ئاگابە، سۆزی
لە ئەنزاری هەموو ناپاک و پاکا

لە کاری لار روو وەرگێڕە بۆ راس
چ راس؟ ئەو ڕاسە بەرگیری هەواکا

رەفیقێ مەگرە پێتۆ با وەکوو مار
برایێ بگرە دەردێکت دەواکا

مەنە پایێ لە راست دوور خاتۆ
بچۆ لایێ بە هەققت ئاشناکا

کەسێ بەم ڕێگەدا ئەڕوات «زاری»
نزیکی شێرە مەردانی خوداکا

## ٤

گوێ لە نەی بۆناگری شینی فیراقی یار ئەکا
تا لە گەل بڕیاوە دایم ناڵە و هاوار ئەکا

یادی دیداری رەفیقانی بە خاتردا کە دێ
ئاهی پڕ دەردی لە هەستی ئەهلی دڵ بێزار ئەکا

سۆزیسێحرئامێزیسینەی بێدڵان دێنێتە جۆش
غافلان ئاگەدار و خەوتوان بێدار ئەکا

خادمی ئەو قەلبە رووناکەم بە نووری مەعریفەت
وا لە هەر زەڕڕە بەفیکرەت کەشفی سەد ئەسرار ئەکا

رووبەهەڵقەیئەهلیدڵوەکنەیوەرە راس و رەوان
راستی بیستووتە خۆ سەگ داخڵی ئەخیار ئەکا

پشتلەمهەڵقە ئەگەرهەڵکەیوەکوو دەف بێ گۆمان
هێزی چەپلاخەی قەزا پشتی ملت زەخمار ئەکا

شەو دەگریا و دەگڕیا شەم بە پەروانەی دەوت
تۆ بە منسووتاوی ئەیمن کێ بەمەم دوچار ئەکا

وا بەژیرانە جواوی داوە پەروانەی هەژار
ئێمە هەر دوو عاشقومەعشووقە خۆ پێوار ئەکا

ئەم موعەمما«زاریا» بۆ ئێمە خۆ حەل ناکرێ
تاکوو نەیچی بانگەوازی بێنە دەر ئیزهار ئەکا

## ٥

**ئەم هەڵبەستەی لە سەید عەلی شای زەنبیل نووسیوە بۆوەی تاریخی «ابن خلکان» بۆی بنێرێ**

دەردی تـــەنهایی مـــەزاقم تـــاڵ ئـــەکا
خەرمـەنی عـومرم بـە کـۆی زووخـاڵ ئـەکا

بـــێ رەفیقـــی، ریشـــەیی جـــەرگی بـــڕیم
لەشـکری میحنـــەت بـــە سـەرما زاڵ ئـەکا

گـــەر نـــەبێ یـــارێ، ئەنیســـێ، هەمـــدەمێ
وەسوەســەی شـێتی لــە دڵـما مـاڵ ئـەکا

بـــۆ ئەمـــە لـــەم راوگایـــە هەڵـــفڕم
دڵ لـــە لـــوتفی ئێـــوە داوای بـــاڵ ئـــەکا

یـــانی ئـــەو ئوســـتادە گۆیـــا بـــێ دەنگـــە
نــوتقی شــەهد ئــامێزی تــووتی لاڵ ئـەکا

نـــاوی مەشـــهوورە بـــە «ابـــن خلّکـــان»
سـوحبەتی ئـەو مـس بـە زێـڕی قـاڵ ئـەکا

مەرحەمـــەت بێتـــو نەکـــەی بـــەم «زاری»یـــە
غـــەم گوڵســـتانی دڵـــی پامـــاڵ ئـــەکا

## ٦

ئەزانی بۆ لە چاو و دڵ بە خـورِ خوێنـاو و خـوێن ئـەڕوا
مـــەزاقم تاڵـــە، ســـاقی توورەیـــە جانانـــە بـــێ پـــەروا

ئومێـــدم بـــوو لەگـــەڵ یارانـــدا وەک کۆمەڵـــی پـــەروین
لە بورجی زیندەگیـدا بـێ خەفـەت چەنـدێ بکـەم مـەئوا

فەلەک وەک موستەشارم غەدری لێم کردوموخالیف خویش»
بـــرا وا، کـــەدخوا وا، یـــارو یـــاوەر وا، بـــرادەر وا

ئەوەی وا کۆمەڵەی ئێمەی لـە یـەک پچڕانـد و رووخـانی
خودا بێ ئابـڕووی کـا رووڕەشـی کـا هـەتکی کـا رسـوا

ملی بشـکێت و بمرێـت و بـڕووخێ بـەخت و ئیقباڵـی
خودا ماڵی بە قورِ بگـرێ لـە بـاغی عـومری بـەر نـەخوا

شەلی کا، شێتی کا، سەرلێشەواوی کـات و کـوێر و کـەڕ
لـەئاوی ئـارەزووی دنیـا و قیامـەت سـووڕەتی نەشـوا

بە پەندی کا گولی کا، تێـک بـدا بونیـاد و بنچینـەی
جڵـەو کێشـی نەدامـەت بـێ شـقا و نەگبـەتی لـەودا

عەقاریب بوون ئەقاریب قەت نەبوون ئـەم دەسـتەواهاتن
بەمـــەکروفێڵ وحیلـــە و دەســـبڕی وەک مامـــە رێـــوی وا

خەیانەتیان گەلێ کرد ئەم چرووکانە خەجاڵەت بن
ئەگەرچی ناکرێ بۆ کەس لەگەڵ تەقدیردا دەعوا
شکایەت بۆبکەم قوڕ بۆ بپێوم یەخە بۆ بدڕم؟
خوداهەرچی موقەددەر کردبێ، هەروا ئەبێ هەروا
وەفای ئەم شێوەمەڕگورگانە «زاری»چونکە ئاوا بوو
تەجەننوب فەڕزە دووری واجبە لێیان لەمەبەدوا

## ٧

شێعرەکانی لەتیف و دڵ ئارات
بۆ شفای دەرد و ئێشی «زاری» هات
لەخوداوەندی عالەمم گەرەکە
لە سەر ئەم شێوە پایەدارت کات
لە فەقیرانی بێنەوا پرسین
بۆ ئەمیرانە گەورەتر عادات
هاتنی موخلیست تەقازا کرد
بۆ تەشەڕڕوف بە خاکی بەردەرگات
ناتەوانە زەعیفە ناتوانێ
بێتە بەزمی حوزووری ڕۆح ئەفزات
دێ ئەگەر حەق بە لوتف و ڕەحمی خۆی
لەم نەخۆشینە زوو نەجاتی بات
ئیشتیاقی منیش لە حەد بەدەرە
بۆ حوزووری شەریفی پڕ بەرەکات
عەیش هەر سوحبەتی ڕەفیقانە
ئاە چ بکەم زەمانە ڕێ نادات
سەیری باغاتە ئارەزوی بولبول
چی قەفەس جیەتی لە جێی باغات
گەردنی وا لە قوڵفی سەد داوا
قەدەمێ ڕوو بە ئارەزوو نەڕوات
گەردنی بەستراوی سەد زەنجیر
نەک بەمەقسوودی خۆ تەکانی بات
قەتعی ئومێد با نەکەم بەڵکوو
بە غەڵەت چەرخ فرسەتێکم بات
بێمە بەزمی حوزوور تا زیاتر
«زاری» ئەم زەهری دووریە نەخوات

## ٨

شا کە هاتی پشتی تێکرد و بە گژیا چوو نەهات
کاخیسەعدئاوای وا لێ بوو بە نەحس ئاوا هەڵات
بێوەفایی ڕۆژگارت دی کە چی هاوردە پێش
دوێکە شاهەنشا بوو ئەمڕۆکە ئاوارەی وڵات
«نیاوەران» ئەندووهناک و کاخی مەڕمەڕ پڕ لە داخ
بۆ ئەوانە هەرکە دڵخۆشن بە چەن ڕۆژی حەیات

بۆ لە کاخی گوڵستان ناپرسی کوا گوڵ پـەروەرت؟
کـوا گوڵاڵـەو غونچـە و کـوا بولبـولانی خـۆش سـەدات
کوا پیاڵـە و سـاقی، کـوا بـادە و کـوا بـادەنۆش
کوانـێ زیروبـەم کوانـێ سـۆزی نـەی کـوا بـەزمی شـات؟
تا وڵامـت باتـەوە، بـەرقێ بـوو هـات و تێپـەڕی
یـا خـەوێ بـوو دیم و ڕۆیـی یـا خەیاڵـی بـێ سـوبات؟
ئـادەمیزادێ نییـە ئـەم ئـەژدەها نەیگـەزتبێ
«ڕەسـتگار» ئـەو مەردەیـە بـەم دەسـبرە بـڕوا نـەکات
چاکە وەک وتوویانـە ئـەبێ بـڕوا، بـڕوا بکـەین
هیچـە دنیـا هیچتـر لـەو ئـەو کەسـە رووی تـێ ئـەکات
موڵک دەروێشی ئەوێ« زاری» کە لەودا کەس نییە
هەڵـمەتی باتـێ، یەخـەی بگرێـت و تـاڵانی بکـات

## ٩

هەرچی دڵ پی خۆش بێ هەر لە بیرە، ساڵێ لە بەهارا لە «حەسەن سەلاران» لەگەڵ دەستەیێ لە ڕەفیقان بو سەیاحەت چووین بۆ کوێستان بە کێوەکانا سەرکەوتین تا چووینە سەر «بەردی ڕەش» بەینی «جەوشەن» و «میک» و «باینجان». لە سەر ئەو بەردە کە مەنزڵمان گرت و روانیمانە دەرە و چیا و دەشتەکان و بەفری خاڵ خاڵ و گژوگیای جۆر بە جۆری جوان گوڵ و خونچە گوڵ، لەزەتێکی وا واردی دڵم بوو کە ئێستاش هەر دێت و دەچێ و ئەدا تەکان، بەو هۆیەوە مامۆسای تەقدیر ئەم هونراوەی تەڵقین کردم، ناردم بۆتان؛ یادگار بێ.

بـەهاری دڵگوشـا بـوو ئـارەزووی سـەیری گـوڵانم کـرد
لە گـەڵ پـۆلی ڕەفیقـان عـەزمی چـوونی کوێسـتانم کـرد
لـە ئـاوایی وەدەر کـەوتین وێنـەی بـاز سـەر کـەوتین
لە سەر بەردی ڕەشی «جەوشەن» تەماشـای کێوەکـانم کـرد
هـەموو عابـای سـەوزی قـودرەتی دابـوو بـە سـەر شـانا
لـە وێسـتانی قنووتـا بـوون تەقلیـدی ئـەوانم کـرد
منیش هەستام و سەرسامی جەماڵـی دەشـت و سـارا بـووم
بە وردی سـەیری جـوانی سـونعی خـەللاقی جیهـانم کـرد
بـە چـاوێکم لـە لالـە و نەرگسـی شـەهلام ئـەڕوانی
بـە کـەیفی خـۆم بـەو چـاوەم تەماشـای ئەرغـەوانم کـرد

لە مل خواری وەنەوشە وا ئەدەب فێـر بـووم خـەلیل ئاسـا
بـە وەحـدەت ئاشـنا تـەرکی موناجـاتی بوتـانم کـرد
سەبا شـانەی لـە زولفـی یاسـەمەن وختـێ کـە دا عـەتری
بـە سـەرما هـات و تەئسـیری لـە مـەغز و ئێسـقانم کـرد
بە سـەر قـووچی قـەڵادا ئاسمـان کووپـەی گـوڵاوی رشـت
بـە دار و بـەرد بـینی موشـکی نـابی ئـاهوانم کـرد
لـە نـازی سوسـەن و نەشـئەی هـەوا و پێکـەنینی هـەور
بـەیاری هـۆش دەرکـی سـەد رمـووزی عاشـقانم کـرد
ئەگـەر چـی دەرکـی تەسـبیحاتی ئـەم ئەکوانـە ناکریـێ
ئەوەی وا کەوتە گوێی هۆشم بـە «حمـد اللـە» رەوانم کـرد
ئەوندەم جـوان و دڵـبەر هاتـە بـەرچاو ئـەو کـەژ و کێـوە
وتم ئۆخـەی ئـەوا سـەیری بەهەشـتی جـاودانم کـرد
هـەوا ئـاوی مـورادی لـێ ئـەڕژیا بێگومـان بۆیـە
لە سەر ئەو بەردە دەرکی سوحبەتی «خضـر»ی زەمـانم کـرد
دوڕ ئەفشـانی ئـەکرد ئـەو رۆژە هـەور و کەسـبی دوڕداری
وەکوو دەریـا لـە قـەترەی ئـاوی هـەوری دوڕفشـانم کـرد
چنـوور ئاڵـۆز بـوو زولفـی و کاسـەی لالـە پـڕ ژاڵـە
بە خونچـەی گـەردن و سـەر رووت تەشـبیهی کچـانم کـرد
لـە ناڵـەی کـۆتر و قاسـپەی کـەو و ئـاوازی زەردیـوەر
سـەماعی تـار و روود و بەربـەتی ساسـانیانم کـرد
لـە هـاژەی باڵـی داڵ و قیژەیـی سـەقر و چریکـەی بـاز
بـە خـاتر یـادی جـەور و خـوێن مـژی چـەنگیزیانم کـرد
لە رێواس و مـەنێ و کاشمـە و لووشـە و شـنگ و پیچـەک
نـە باغـەڵ بەڵـکوو پـڕ بـەرماڵ و کـۆش و گیرفـانم کـرد
وەکـوو زەیتـوونی شـیوی ئیمـەنم دی داری ئـەو کێـوە
لـە شـاخ و بـەرگی وا دەرکـی نیشـانی بـێ نیشـانم کـرد
حـەیاتی دڵ بـە ئـاوی زینـدەگی بەخشـی ئەبـەد داوا
لە بـەحری رەحمـی بـێ پایـانی حـەیی موسـتەعانم کـرد
بـە یـاری باغبـانی هـۆش لـەم فەسڵـی بەهارەیـدا
لـە رووبـاری تەفـەککور ئـاودێری بـاغی گیـانم کـرد

له هەر بەردێ له هەر دارێ له هەر غونچـه لــه هــەر خـارێ
کــه وردۆ بـــووم کەشـــفی زۆر ئەســـراری نـــەهانم کـــرد
عەجـــەب زانســـتگاییکه تەبیعـــەت حـــەیف دەرســـێکم
نەخوێنـــد لـــەودا و نـــەمفامی رەفیقـــی بێـــدڵانم کـــرد
نەسـیمی سـوبح ئــەی «زاری» وتی پــێم کەسـبی عــەتتاری
له بــەرگی نــازک و بــۆ خۆشـی خونچــەی گوڵــبنانم کـرد

## ١٠

**شیوەنی زاری بۆ هاو قەتاری، خوالێخۆشبوو «مەلا محەمەد ئەمین شەریعەتی»**

دیــت چــی کــرد چــەرخی کــەچ رەفتــار
چـــۆن جـــەرگی گـــەزیم وێنـــەی مـــار

چـــۆن شـــکانی نـــەمامی ئومێـــدم
چـــۆن لـــه جێگـــەی گـــوڵا روانی خـــار

چـــۆن رفـــانی گوڵاڵـــەی شـــادیم
چـــــۆن رژانی بەســـــەرمدا ئـــــازار

چـــۆن زووخـــاوی فیراقـــی پـــێ چێشـــتم
چـــۆنی کـــردم بـــه ســـوورەتی دیـــوار

چـــۆن ژیـــانی بـــه ژان وەرگێـــڕام
نایـــه ســـەر خـــاترم لـــه غـــەم ســـەد بـــار

ئـــاورێکی وەهایـــه تێبـــەردام
گشـــت ئـــازام ســـووت میســـلی پـــوار

یـــانی مـــەرگی «شـــەریعەتی» مـــەرحووم
لـــەززەتی زینـــدەگیمی کـــرد بـــه ژار

«ئاڵکەڵـــوو» «مەنشـــەء» و ســـەقز مەدفـــەن
ســـەروی لادێ بـــوو هاتـــه بـــاغی شـــار

گـــوڵ ئـــەبێ جێگـــەیی گوڵســـتان بـــێ
نـــه دەر و دەشـــتی چـــۆڵ و پـــڕ لـــه غوبـــار

هاومـــاڵان یـــەک بـــه دووی یەکـــدا
رۆیـــــن و ئەبڕێتـــــەوە کـــــۆچ و بـــــار

دەســـتەیێ ســـەر لـــه خـــاک دەردێـــنن
دەســـــتەیێ تـــــر لـــــه خاکـــــدا پێـــــوار

نۆهـــەمی تـــیر بـــوو کـــه تـــیری ئەجـــەل
بـــڕی ریشـــەی حـــەیاتی میســـلی مشـــار

بگـــری ئـــەی دڵ هـــەتا هەیـــه هێـــزت
دیـــدە بـــا بـــێ میســـالی هـــەوری بـــەهار

بەســـەر ئـــەو خاکـــه پاکـــەدا کـــه لـــه ژێـــر
ئـــــەودا راکشـــــاوە، خـــــەوتووە یـــــار

تـــا لـــه ریشـــەی ســـەفاتی مـــەحبووبی
ســـەوز بـــێ گـــوڵ نـــه یـــەکێ هـــەزار هـــەزار

هـــەر ئەوەنـــدە بـــڕێژین ئەشـــکی ســـوور
تـــــا مـــــەزاری ببێتـــــه وەنەوشـــــەزار

شـــــیوەنێ وا بکـــــەین وەک ئێمـــــه
دەشـــــت و دەر بێتـــــه ناڵـــــه و هـــــاوار

نـــاگریم بـــۆ ســـەدەف ئەگـــەر شـــکیا
بەڵـــکوو بـــۆ گەوهـــەرانی بـــێ ئاســـار

یـــانی گـــوم بـــوونی ســـیفاتی چـــاکی
لـــه تـــەوازع لـــه عـــیلم و حـــیلم و وقـــار

ساڵـــی فـــەوتی دیـــارە بـــۆ هەرکـــەس
بژمێـــری «یـــا ولی و یـــا غفـــار»

جێگە خاڵی و کتێب بێ خاوەن — مەدرەسە چۆڵ تیا نییە دەییار
هاو عەسران ئەگەر دوو سێ ڕۆژێ — پێش کەون بێ ڕەفیق و خدمەتکار
سواری تابووت بن و بکەونە ڕێ — روو بە خەوگای قەبری تەنگ و تار
ئەی دڵ ئامادە بە کە نۆبەت دێ — تۆیش وا زوو سواری ئەسپی دار
بکەن و بتبەنە ئەوێ بخەوی — رووت و بێ پشتیوان و بێ غەمخوار
مامۆساکانی ئایینی ئەغڵەب — نەوەیان کەوتە سەر خەتێکی لار
وا کوژراوە چرای بینشیان — پیان بێ فەرقە زوڵمەت و ئەنوار
عەقڵ بێ ئیختیار و دەس بەسراو — وا بە دەس دێوی نەفسەوە هەوسار
مەسلەکی بابەکانی خۆیان تەرک — کردووە، کەللە رووت و بێ کردار
بە «اضاعوا الصلوە» مومتازن — شۆن کەوتووی هەوان روو بە خوار
بۆ حقووقێکی پڕ لە ژان و بڕک — روو بە دونیا بە جارێ کەوتنە غار
بۆ نەچیرێ ئەگەر لە داوی خەن — بکە بڕوا قبووڵ ئەکەن سەد عار
غەرقی شینە پەرتە هۆشی‌عەفوی‌کەن — گەر بکا غەیری دەرد و غەم ئیزهار
اهدنا ربنا صراط الحق — عەیبمان داپۆشە یا سەتتار
«زاریا» وا چاکە گشت بێژین — «و قنا ربّنا عذاب النّار»

## ١١

سەرم بێ شەوقی تۆ کێوێکە پڕ خار — دڵم بێ یادی تۆ دارێکە بێ بار
بە غەیری هەمڕەهی یادی جەماڵت — ئەوی هەمڕاهە یا دووپشکە یا مار
ئەپاڕێمۆ بە دڵ تا حەق بەرەحمەت — وەدەستم خاتەوە دامانت ئەمجار
بەهاری وەسڵ ئەگەر تەشریفی هێنا — من و سەیری وەنەوشە و باغ و گوڵزار
چ گوڵزارێ بە خۆشی جەننەتی عەدن — لە گوڵپەڕ، پەخشە تێیا ئاوی ئەنهار
تەراوەت بەخشی ئەرواحە تەماشای — هەوای دەرمانە بۆ هەر ئێش و ئازار
چ نزهەتگاهە دەشتی مەحموو ئاوا — کە سوورماوە سەری لەو، چەرخی دەووار
بە چاوی خۆی نەیدیوە بە عومری — لە سەرئەرزا بەهەشتێ وا سەفادار
مەگەر ئەم نەقشە رزوان هات کێشای — کە نابینێت عەیبی هیچ هۆشیار
زرنگتر باغەبانانی زەمانە — بەدیققەت گەر تەماشا کەن سەر و خوار
«معاذالله» کە دەرکی زەڕڕەیێ عەیب — لە جۆگا یا لە پەرژین و لە دیوار
وەرن گەردش لە باغێکی وەهادا — شفایە بۆ دڵی غەمگین و زەخمار

ئیرەم جێ بێڵە بێ بۆ سەیری ئێرە — لە سەیری ئێرەدایە نووری ئەبسار
ئەوی پیخۆشە چاو و دڵ تیایە — هەموو رەنگ و هەموو بۆ و هەموو دار
هەموو شەربەت هەموو میوە هەموو گوڵ — هەموو تام و مەزەی بێ ئێش و ئازار
هەڵاوەسراوە وەک عیقدی سوورەییا — بە شاخی دارەدا هێشوو بەرەو خوار
بە سووری روومەتی جوانانە سێوی — بە گردی مەمکی مەحبووبانە هەر نار
لە شیرینی بەری داری دڵ ئارای — مەزاقی شەککەر و شیرینە پڕ ژار
بە دەسیانۆیە سەد تەسبێحی هێشوو — وەکوو سۆفی، سەبز پۆشانی گوڵزار
بە خۆشی جۆشی ئاوازی پەڕندەی — هەموو گوێگر لە مۆسیقاوە بێزار
بە قوربانی سەدای ئەو بولبولانەم — لە شەوقی گوڵ سەحەرگە دێنە هاوار
لە شەوقی گوڵ ئەگەرچی باغە جێیان — هەموو شەو تا سەحەر بێدار و غەمبار
لە نازی غونچە بڕوانە بە شۆخی — لە سەر گوڵبن کڵاوی دادەنێ لار
بە سەر پەنجەی وەفا بادی سەبا لا — ئەدا پەردەی لەسەر خورشیدی روخسار
بە رەنگ و عەتری ئەنواعی گوڵاڵە — نموونەی «جنت الماوایە» کوهسار
چ قودرەت ئەم هەموو رەنگەی لە بەرگی — گوڵا رێژاوە بێ شاگرد و میعمار
هەوای ئەم دەشتە عەتر ئامێزە دێژی — بە سارادا رژاوە موشکی تاتار
چراخانی گوڵستانی بەهاران — چرایێ روونە بو ئینسانی هۆشیار
کەمێ گوێ بگرە تا ناڵەی «هوالحق» — ببیسە تۆ لە هەر غونچە لە هەر خار
بە چاوی مەعریفەت تێفکرە «زاری» — سەراپا مەشعەلی ئەنوارە ئەشجار

## ١٢

ئامۆژگاری پیاوی تەجرەبە کار — بگرە گوێ ئەی برادەری هۆشیار
مەکە پەروەردە تۆوی رەنج ئاوەر — ریشەیێ سەوز کە، کە بگرێ بار
سەگ لە درگای خاوەنی خۆیا — بکەوێ چاکە عاجز و مل خوار
چاوەڕێ بۆ نەوازشی ئاغای — کە لە فەزڵی بێت بەرخوردار
بگەڕێ کووچە کووچە و ماڵە و ماڵ — ئەیدەنە بەر پلاری بەرد و دار
کونجی تەنهایی بگرە ئەی «زاری» — والە تەنهائیا گوڵی بێ خار

## ١٣

گـــەر بــــە دیـــدەی فکـــر بـــڕوانی لـــە شـــێوەی ڕۆزگـــار
تێدەگـــەی عەینـــەن میســـالی کەشـــتییە بـــۆ ڕێبـــوار

ســـەیری تیـــژی ڕۆیـــنی ناکـــەی کـــە بـــۆ هـــاورد و بـــرد
وا بـــە ڕێـــوە لـــەحزەیێ نـــادا پشـــوو لـــەیل و نـــەهار

دەســـــتەیێ دێنێتـــــە دنیـــــاوە لـــــە تـــــاریکی نـــــەبوون
دەســـــتەیەکی تـــــر ئـــــەبا بـــــۆ عالـــــەمێکی نادیـــــار

بـــێ ئـــەوەی ئاگـــا بـــێ کـــەس لـــەم هـــاتن و ڕۆیشـــتنە
یـــەک ســـواری وشـــتری تابووتـــە یـــەک لانـــک ســـوار

ئـــەو شـــکارچی وا لـــــە ســـــارادا بـــــە گوللـــەی تاپـــڕی
غەرقی خـــاک و خـــوێن ئـــەبوو پۆلـــێ نـــەچیری باڵـــدار

راویـــــاری مـــــەرگ داوێکـــــی بـــــە دەوریـــــدا تـــــەنی
کەوتـــە نێـــوی بـــەو هـــەموو پـــارێزەوە بـــێ ئیختیـــار

ناتوانـــێ هـــیچ کـــەس لـــەم داوە خـــۆ لادا بـــە عـــەقڵ
یـــا لـــە چنگـــی ڕاویـــارێ وا تەســـەور کـــا فـــەرار

کـــوا لـــە بـــاغی عالـــەما مـــەوجوودە دارێکـــی وەهـــا
عاقیبەت ڕیشەی لە خاکـا مـەرگ نەبـڕێ وەک مشـار

بـــا بکـــا شـــیوەن عەشـــیرە بـــۆ پیـــاوی وا زەریـــف
سەیلی فرمێسک لە هەر دیدە بـە خـوڕ بـا بێتـە خـوار

چـــون شـــەوی ماتـــەم بـــە جـــارێ ڕۆشـــنایی کـــرد گـــوم
ئاوری حەسـرەت لـە خـۆ بـا بەربـدا شـەمعی هـەژار

بـــیری ســـەیری بـــاغ ناکریـــێ هـــەتا پـــایز نـــەیێ
قـــەدری گـــوڵ نـــازانرێ هـــەر تـــاوەکوو نـــەڕوا بـــەهار

جــــام بشـــکێ، بـــــادە بـــڕژێ بــــەزم کۆتـابـــێ دوای

پیاوەکـــانی زیـــرەک و خــــاوەن شــــعوور و هۆشـــیار

«شـێربەگی» خـۆ تـازە نــابینن بــە عـومری خـۆ بــەچاو

سەرپەرسـتێ وا لـــە خۆیانـــا رەئـــووف و نـــاودار

گــــورگ مـــــردن خۆشەویســـــانی دزی دانەچڵـــەکان

ئــاە! بــۆ وا کــوێرە، نابینایــە، دیــدەی ئیعتیبــار

بــەر لـــەوەی ئــێعلانی ئـــەم کۆچـــە بـــە دیـــوارا درێ

لــەم هــەوارە تۆشــەیێ ئامــادە کــەن بـۆ ئــەو هــەوار

گشــت ئــەزانن بــێ دەوامــە و بــێ نەتیجــە، بــێ سـپاس

نیعمـــەتی ئـــەمن و فـــەراغ و ســێحەتی ســـەرمایەدار

ئـــــارەزووی هەڵـــگرتنی خەرمـــەن خەیاڵـــی باتڵـــە

بــێ ئــەوەی توویـــێ لـــە خاکـا دابشــارێ جووتیـــار

گەر غەرەز هەر خواردن و خــەو بــێ لــە ئیجـادی بەشــەر

کامـــە فـــەرقی ئـــادەمی و گـــاو و گـــورگ و کـــەمتیار؟

رەســــتگاری وا لــــە موڵـــکی خواپەرەســـتیدا ئەگـــەر

لێـــرەدا توویـــێ بچـــێنی رەســـتگاری، رەســـتگار

ئـــەم هـــەموو پیاوانـــە رۆیشـــتن لەگەڵـــیانا نـــەچوو

غەیری کردە، تیکە نانــێ، شــەربەتێ بـۆ قــەبری تــار

ئیشـــی بەدبـــەختی نـــەبێ بـــۆچی ئـــەبێ دەرکـــا لـــە دڵ

خـــۆفی ئـــەم خـــەوگا بزانـــێ زیـــرەک و پارێزگـــار

وای بـــۆ ئـــەم کـــۆچی حەســـرەتباری یارانـــە غـــەمم

هەمزبانـــە، هەمدەمـــە، هــەم ئیســتیکانە، هــەمقــەتار

بـــەهرەیێ نـــادا ئەســـەف «زاری» ســـەبووری چاکـــە چـــون

ئەهلی سەبرن خــاوەنی ئــەجری عــەزیم و بــێ شــومار

## ١۴

**لە جواوی پارچە هەڵبەستێکی کاک عەلی موتەخەلیس بە شێواو ئەم هۆنراوەم نووسیوە**

**وام زانی من کە ئەو نامــە لــە جەننــەت هاتــە خــوار**
**چــون بــە جــارێ پــایزی کـردم بــە گولــزاری بــەهار**

**نامەی کێ بوو عەلی، کامین عــەلی؟ رۆڵــەی ســەلیم**
**ئــەو ســەلیمە وا لــە ماڵــی رەحمــەتا گــرتی قــەرار**

**کــاکی شــێواوم، نەشــێوێ نــاز و بــازاڕی وەفــای**
**ئیلتیفــاتی کــرد و کــردی لــەم فــەقیرە پرســیار**

**شــادمانی دا بــە دڵ قــاڵاوی میحنــەت هەڵــفڕی**
**هــەر وەکــوو ئــاهووی ســەحرایی لــە خــۆفی راویــار**

**گیانی مــن شــێوەی ئەمیرانــە ئەگــەر راســت ئــەوێ**
**لــەم فەقیرانــە کــە بــڕوانن بــە رەحمــەت جاروبــار**

**غیرەت و مەردی و هیممــەت ئیرســی خاســی ئێوەیــە**
**بۆ لە دەستی بەر ئەدەن بــۆ بــەزمی تریــاک و قومــار**

**ژیــر بــن، ژیرانــە رێ بگــرن لــە رێگــە لامــەدەن**
**کــام رێگــە، رێگــەی باپیرەکــانی هۆشــیار**

**روو بە کێوی نەگبــەتی پــڕ مــار و پــڕ ئــازار ئــەڕۆن**
**پێچەوانــەی پێشــوانی خۆبکــەن رێ ئیختیــار**

**پێشوانی ئێمە ئــەی«زاری» بــە رەحمــەت بــن ئەڵــێن**
**هیچ جێگەی شک نییە، گوڵ، گوڵ ئەدات و خار، خــار**

## ١۵

**گلــەی نووســی لــە دارێکــی کوهــەن بــەر**
**بــە شــەرحێ وەک دەڵــێ پــیری موکــەددەر**

**جــــواوی داوە پیرانــــە بــــە نــــەرمی**
**وتیئەینــووری چــاو ئــەی ئەفســەری ســەر**

**گلۆکێ بووی بە ســەرمۆ هــەر وەکــوو تــاج**
**گیانــێ بــووی لــە خاترمــا مســەووەر**

بە هۆی تۆوە گەلێ پڕژی شکانم
پلاری دار و بەردی ئەهلی مەعبەر

گەلێ گەرمی و سەردیم ئیختیار کرد
کە بەڵکوو میوە شیرین بێت و دڵبەر

زەمانی نوخشە هات و خەرمەنم دی
بڕێ خاشاک و خۆڵی میحنەت ئاوەر

«ان اشکر» کوا؟ لە «و احفض» بۆ نەما ناو
مەگەر بەرباده دین «الله اکبر»

مەکە مەفتووح دەم بۆ رەنجشی باب
بە فتحە و ضەممەیە فەرقی «کُر» و «کَر»

«نە ما را در میان عهد و وفا بود؟»
بە قەولی «مصلح الدین» هونەروەر

«جفا کردی و بد عهدی نمودی»
فریبت خوارد ئێمەت کرد موکەددەر

«کنونت گر سر صلح است باز آی»
سەلاحەت ئێسە خۆشە مەیخە مەحشەر

«کزان محبوبتر باشی کە بودی»
بە گەردێ نابێ دەریایێ موغەییەر

لە بەر تۆ بوو قرەی «زاری» ئەوێستەش
وەرە ئەو نووری چاوەی بووی لە مەوبەر

## ۱۶

بەهار هات و لەشکری زسان کەوتە بەر
گورزی شەماڵ و نێزەی خورشیدی شوعلەوەر

رەحمی بە حاڵی تینوانی ئەم بەهارە کرد
باری بە بارشێکی موفەسسەڵ نە موختەسەر

دوێ غونچە لە باغا کزو بێ ئاب و ناتەوان
دەم پڕ لە خاک وخۆڵ و خەفەتبار و قوڕ بەسەر

«امروز حمد خدا با هزار دلبری
خندان و شاد و قبای زمردی بەبر»

وەک مانگی دڵ ئەفرۆز لە بورجی شکۆفەوە
دەرهاتووە بێپەردەیە روخساری کەوتە دەر

دەم پڕ لە شوکری خوایێ کە بەبارانی رەحمەتی
رەنگی بەهەشتی گرتووە سارا و دەشت و دەر

یانی، ئەخاتە حیرەت و دەریای جەهلەوە
نەققاشی سونعی بە ئارایشی سەمەن بکا نەزەر

کێ سۆسەنی رازانەوە بەم شێوە دڵ ئارا
زوڵفی بە شانە کردووە دەرژێتە سەر کەمەر

کێ قەندی دا بە چۆنەر و هەنگوینی دا بە هەنگ
زەهری بە مار دا و حەلاوەت بە نەیشەکەر

ئاساری سونعی زاتی بێ میسالی بارییە
ئەنواعی نەقش و رەنگ، بۆ و لەززەت و سەمەر

تا ئەمری ئەو نەبێت لە گوڵزارەدا چلۆن
لالە کڵاوی لەعلی بەدەخشان ئەنێتە سەر

ئەم هەموو عەجیبەی لە نەبوون ئافەریدە کرد
بێ مادە و بێ کۆمەک و تەدبیری کاریگەر

تەدبیری کێیە گیانە بە غەیری خودای پاک
تەغییری فەسڵەکانی رۆژگاری دەورەدەر

کۆتا کە «زاری» بەسە ئەم قەسیدەیە و بڵێ
یارەببی هەر ئەتۆی خوداوەندی بەحر و بەڕ

## ١٧

نەورۆز هاتوچەمەن بەرگی سەوزی کردەبەر — پشکووت شکۆفەی گوڵ و روخساری خستە دەر

سروەی نەسیمی ساف بەیانی لە گوڵشەنا — دێت و دەچێت و بە بولبول لە گوڵ ئەدا خەبەر

بێ دەر لە کونجی میحنەت و بروانە لالەزار — شێوەی‌بەهەشت ئەدات لە هەر لا ئەکەی نەزەر

سەرما فەراری کردووە پۆلی گوڵاڵە هات — سارا و دەشت و کێوی بە جارێک گرتە بەر

زستان کۆچی کرد و کرێوە ملی شکا — گوڵبن کڵاوی لەعلی بەدەخشانی کردە سەر

ئاوێ بڕێژە بەسەر ئاوری غەما وەهای — سەردۆ کە لە تینی کە نەمێنێت یەک ئەسەر

عەتتاری هەوا رژانی بە خاکدا گوڵاو — خەرمانی موشکی چینە چیاکانی دەشت و دەر

رووبەند لابراوە لە سەر غونچە تەلعەتی — دەرکەوتووە وەک مانگ لە هەورا کە بێتە دەر

سەد شەمع هەڵکراوە لە هەر شاخ و گوڵبنێ — زەرد و بەنەفش و ئاڵ، حیرەت ئاوەری بەشەر

زولفی بە دەستی ناز شانە کرد شۆڕەبی — خاو و درێژ و دڵبەرە ئەڕژێتە سەر کەمەر

سەفای سینەیە سەیری خەرامی سەروی باغ — ناز دێتە جووڵە بە بادی دەمی سەحەر

بەعیشوە چاوی هەڵێناوە لالە چاوەڕێی — نەسیمی سوبح کڵاوی کە فڕێدا لە سەر

بە تاری زولف باوەشێنی روو ئەکا سەمەن — دەمێ سەبا بە میهر بە هەردا ئەکا گوزەر

سەرسامی حوسنی سوورەتی بووکانی گوڵشەنین — پەروین و ئافتاب و زوهرە، موشتەری، قەمەر

ئینسان بێ نیاز لە تار و روباب ئەکەن — سەدای کەو و کۆتر و ئاوازی زەردیوەر

بێ سەیری لالەزار هەتا ئێشی جەوری دەی — هەوای رۆح بەخش لەسینەت بکاتە دەر

بە پێکەنین غونچە، دڵی بولبولی رفاند — وامەست و بێخودە ئاگەی نییە لە پاو سەر

نەرگس بە ناز هاتە گوڵشەن و وەنەوشە خۆی — هاویتە خاکی رێگەی و سوجدەی ئەباتە بەر

ئەم قەترە شەونمانە لە سەر بەرگی گوڵ وەکوو — دوڕڕێکی دانراوە لە سەر سینێکی زەر

بەم هەمو چاوە سەیری جوانی چەمەن ئەکا — «زاری» میسالی ئەتۆ ئاسمانی دەورە دەر

## ١٨

ئاسمان تەختی وەکوو بەختم ببێ زێر و زەبەر

خۆشیەکی پێ نەدام ئیللا غەم و خوێنی جگەر

دەست بەردارم نەبوو باری غەمی خۆ بنمە کۆڵ

سەنگی باری زەحمەتی، دنیایەکی هێنامە سەر

ئای بۆ یارانی حەسرەت پەروەر و غەم ئاشنا

خاتر ئازوردە بە ناکامی لە دنیا چوونە دەر

کــــۆچی هاومـــــاڵان رووخـــــانی بناغـــــەی زینــــدەگیم
رۆیــین و لایانــەوە بــۆ کــەس نــەهاتۆ یــەک خەبــەر
دیــدەنی یــارانی رۆیشــتوو بــە دڵــما هــات و چــووم
دیم هەموو خەوتوون ئەمما خەوتوویـەکی قورِبـە سـەر

بــێ ســەرین و دۆشــەک و بــێ لێفــە و بــێ تــەختخاب
بــێرەفێــق و هەمســەر و تــەنها ، غــەریب و دەربــەدەر
هۆشــیار و بــێ ســەدا خاڵــی لــە عــەرز و بــێ جــواز
ســاکن و بی جووڵــە ، چــاوەڕوانی ئــیعلانی ســەفەر
بێ تەماشا کە لــە تــۆی خاکــا بــە تــۆی لــەش خــەوتوون
ســەد هــەزاران نــازک ئەنــدامانی قامــەت نەیشــەکەر
یــەک نموونــەی تەلعــەتی ئــەو خەوتوانــەن بــێ گومــان
ئــەم هــەموو غونچــە جوانانــە لــە خــاکۆ دێنــە دەر
ئەو رەفێقە دوێ وەکوو بولبول بــە ســەد نــەوعی دەخوێنــد
ئێسە مات و بێ سەدا ، بێ نوتقە وەک نەخشــی حەجــەر
هــەر وەکــوو ئاشــێ کــە ئــاوی کــەوتبێ بــێ جووڵــە مــان
رەنگ پەڕیو ، ئەعزا هــەموو بی زەربــەتی تــیر و تەبــەر
گــوێ نــەبیس و چــاو بــێ نــوور و زبــان بــێ هێــز و لاڵ
ئــەم هــەموو جیرانــە نەزدیکــە لــە یــەکتر بــێ خەبــەر
ئــــــاقلانی دەهـــــر لـــــەم گێـــــژاوەدا سەرلێشـــــەواو
هــیچ کەســێ نــەیزانی ئــەم رۆحــە چلــۆن ئەڕواتــە دەر
هاتـــە ئـــاخر عـــومرم و فیکـــری دەلیلـــێکم نـــەکرد
تـــــازەگی وا دێتـــــە گـــــوێم ئـــــاوازی (كَلَّـــا لا وَزَر)
رۆزگــار و عــومر بــەم جــۆرە کــە بــێ میهــر و وەفــان
بــۆ بــە غەفڵــەت رائیــەبوێری بەشــەر نی تــۆ مەگــەر
غافڵــی تاکــەی کــە هــەر رۆژێ ئــەبینی ســەد ســوار
بــۆ ولاتی بــێ دەنگــی لــەم شــارەوە ئەڕواتــە دەر

بەهــ چ موڵـکی بــێ شــەڕ و شـۆرە لــەوا یەکســانە خەڵـق
شــاە بــێ تــاج و گــەدا بــێ بــاج و قــازی بــێ نــەزەر
عیللــەتی فــەوز و شــەقا غــەیری عەمــەل چــی دی نییــە
بــۆ بەهەشــتە رەهنومــا، چاکــە و خراپــە بــۆ ســەقەر
تۆشــــەیێ ئامـــــادە کــــە و ئامــــادە بــــە هاکـــــا درا
ئاگەهی کۆچــت بــە دیــوارا لــە هــەر کووچــە و گــوزەر
بۆ لە خــەو راناپــەڕی ئــەی دڵ کــە لــەرزەی خســتە ئــەرز
«اقتـــرابی ســــاعەت و ئیعلامـــی وانشـــق القمـــر»
گیــانی مــن مەشغوولــی کــارێ بــە بــەرێ بــا، تەمبەڵــی
غــــەیری رووزەردی و سەرداخســــتوویی نــــادا ســــەمەر
بــــاغی تـــــەقوا ئـــــاودێری کــــە هـــــەتا هێـــــزت هەیـــــە
ریشەیی تاعەت بە قــووەت کــە و بــڕۆ بــێ دەردی ســەر
بــۆ ئــەوەی لــەو رەحمەتــە بــێ ئینتیهــا بێبــەش نــەبی
دەس بە تەقوا بگرە تا لــەم غەفڵــەت ئــاوا ئەچییــە دەر
هـــیچ دەســـت ئـــاوێزێ ئـــیللا رەحمـــەتی بـــاری نییـــە
هـــیچ دەســـتگیرێ نییـــە ئـــیللا خـــودای دادگـــەر
«زاریـــا» بـــێ پشـــتیوانی لـــوتفی «رب العـــالمین»
بــۆ مــنی بــێ تاعـــەت و نامەســیا «ایـــن المفـــر»

## ١٩

لــە دایــرەی ئیتاعــەت ئــەولاد پــای کــە نــا دەر
کــوڕ بــێ ئەبێتــە کــوڕڕە، کــچ بــێ ئەبێتــە عەنتــەر
ئاداب و خووی شیرین، شــەیتان ئەکاتــە ئینســان
فیــز و هــەوا و تونــدی ئینســان ئەباتــە کــن کــەر
ئــەخلاقی چاکــە رۆڵــە ئاســاری ئادەمییــەت
نــەک کەوشــی برقــەدار و کــەوا و کــۆت و مێــزەر

بەسـیە بێبـاکی بـرا بـەس، کۆکـەوە فکـری بـڵاو
لـەم هـەموو تـەغییرە ئـەی چـاوم کـەمێ وردۆکـە چـاو
وامەزانـە ئادەمییـەت خـواردنی گوشـتە و پـڵاو
خـۆفی رۆژی مەحشـەرت بێـت و غـەمی وەخـتی حەسـاو
نەک خەیاڵی چێشتی چەور و تۆشە و نـوقڵ و نـەبات

کـوا سـەفی مەحبووبـەکانی دڵـبەری ناسـک بـەدەن؟
کـوا کـەوای سـەوزی زومـوڕڕەد رەنگـی لاوانی چەمـەن؟
کـوا خومـاری نـەرگس و نـازی وەنەوشـە و یاسـەمەن؟
کـوا نیـازی بولبـولی عاشـق بـە غونچـەی سیم تـەن؟
هەر بە فوویێ پاییز ئەم هەموەی بە جارێ کـرد مـات

تـۆ تەسـەوور وا نەکـەی بێـژی لـە مانـە زیـاتری
سـاغی و جـوان و بـە قـووەت هـەر ئـەمێنی نـامری
سـاعەتی عـومرت ئەگـەر هاتـە موقـامی ئـاخری
سـەهلە بێـژم گیـا، لـە کاهـێ بـێ دەس و بـێ پـاتری
تۆشەیێ ئامادە فەرموو نەک ئەجەل موهڵـەت نـەدات

وەک تیـاتر وایـە عەینـەن گەردشـی دونیـای دوون
عەهدی گوڵ رۆیی وەکـوو بـەرق و چـووە پـەردەی نـەبوون
بێ تەماشـا کـە لـە جێـی گـوڵ، داری گـوڵ غـەرقی دڕوون
گوێ ئەگـەر بگـری ئەبیسـی هـەر کـە ئێسـتەش بێسـتوون
شینی زەخم و زۆخی جەرگی لەت لەتی فەرهاد ئەکات

بۆ عـەزا خـوانی بـە سـەد دەرد و غـەمۆ دوێ چوومـە بـاغ
دیم لە جێـی بولبـول، لـە پۆپـەی یاسـەمەن وێسـاوە زاغ
سـێو و هـەرمێ عـاجز و سـەرو و سـنەوبەر بـێ دەمـاغ
کـۆخ و هـەنجیر و هـەنارم دی هـەموو دڵ پـڕ لـە داغ
بـێ گـەڵا و میـوە مـردوو، مـردووێکن غـەم خـەڵات

غـەرقی ئەنـدووە و پەرێشـان و کـز و شـادی بـەتاڵ
پسـتە و نـارنج ولیمـۆ و بـەهێ و پرتـەقاڵ
بـادەم وگـێلاس و قەیسـی و هڵـوو بـێ کـەیف و حـاڵ
ئەرغـەوان و مـازو و کـوت و بـەڕوو روو گـرژ و تـاڵ
قوڕ بە سەر گۆیژ لە سینەی هەڵچەقی خـاری نـەهات

وێــوڵ و چوالــە و زریشــک و ســنجوو و شــیلان و هــوول
وەک شــەهێن و تــوو هەڵــووژە و گوگجــە مــات و مــەلوول
ژاڵــە دەردی زەردەیــی گــرت و گــەڵا بــێئــاو و لــوول
لەشــکری پــایز وەبــەر خــۆی داوە دنیــا عــەرز و تــوول
کەس نەماوە زەخمی کەڵپەی ئەم پڵنگەی پێ نــەگات

رەهنومــای ئینســانە ئــەوزاعی گــەڕانی چــەرخی پــیر
بــۆ وجــودی ســانعی حــەیی و تــەوانا و بەســیر
ئــەوەللی بــێ ئیبتــدا و ئــاخرێکی بــێنــەزیر
بــێ ژن و ئــەولاد و دانــا، بــێ شــەریک و بــێ وەزیــر
واحــدێکی بــێنیــاز و خــالقی مــەوت و حــەیات

عەبدی ئەو بە، ئەو بناسە لەو تەڵەب کە ئارەزوو
بــاری ئــەمری هەڵــگرە تــا ببیــە ســالاری هــەموو
هەڵــگری ئــەم بــارە مــەردە و هەڵــنەگر بــێ ئابــڕوو
ڕوو بــە مــەنزڵ هــیچ ڕێگــە غــەیری ئــەم ڕێگــا نــەچوو
بێ بــڕۆ بــەم ڕێگــەدا ئــەم ڕێگەیــە ڕێگــەی نــەجات

عاشــقی دنیــا نــەبی ئــەم ســاحیرە ئەتخاتــە داو
سەد هــەزار شــووی کــرد و شــوویێکی نــەبوو نەیخاتــە داو
لــەو شــوانەن بەهمــەن و کەیخســرەو و ئەفراســیاو
ســەد وەکــوو فیرعــەون و هامــان و جــەمی کێشــا قــوڕاو
کوشتنی، فرمێسکێ بۆ کــەس لــە چــاوی دەرنــەهات

نەوبەهاری عومر، ئـەی «زاری» وەکـوو گـوڵ چـوو بـە بـا
رەونــەق و جۆشــی جــەوانی تێپــەڕی ڕۆیــی نــەما
گیــان و تــەن میســلی هــەدەف ئامــادە بــۆ تــیری بــەلا
پــاییزی پــیری دەدا هــەر لــەحزە ئــیعلانی فــەنا
هەی نەما وەختی بەقا، دەی بــارە بــۆ ماڵــی بــەقات

## ٥

### دەردە دڵ لە ئەتواری زستانی بەدڕەفتار و بیرکردنەوە لە دەوری ڕۆژگار

پـــایز و هـــاوین و ئـــەوزاعی بـــەهارت دی عـــەیان
تێگەیشـــتی چـــۆن ئـــەڕۆن و تـــا چ حـــەددێ بێوەفـــان
چـــۆن ئەســـوورِێن و چ جـــۆرن چـــەن لـــە ئـــەتوارا جیـــان
چەنـــدە بـــێمیهـــر و ســـەبات و بـــێدەوام و بـــێبـــەقان
لازمـــە شـــەرحێ لـــە جـــەوری هـــەوری بەدتـــەوری زســـان
هـــەر بـــە مـــەحزی هـــاتنی، دڵ بێقـــەراره و پـــڕ لـــە ژان
تـــرش و تـــاڵ و کینـــەجۆ و ناکـــەس و نامیهرەبـــان
دێتـــە هـــاتوچۆ بـــە رووگـــرژی ئەپۆشـــێ ئاسمـــان
ڕۆژ ئەشارێتۆ وەکوو دەس ڕۆییوی ئەم عەســرە نــان
تیپـــی بـــۆران و کـــرِێوەی هـــەر دەقیقـــە کەوتـــە کـــار
گێژەڵووکەی دێ بـــە یەکـــدا راس و چـــەپ وەک گـــورگی هـــار
دائەپۆشـــێ یـــەکنەفـــەس بـــەرزی و چاڵـــی بـــەرد و دار
خـــەو ئەبێتـــە مـــردن و خـــۆراک ئەبێتـــە زەهـــری مـــار
ســـەلبی ئاســـایش لـــە مـــەخلووقات ئـــەبێ لـــەیل و نـــەهـــار
پـــڕ لـــە ئـــاه و ناڵـــە و هـــاوار ئـــەبێ لادێ و شـــار
قاتڵـــە بـــۆ وەحشـــی و سەرلێشـــێوێنی رێبـــوار
غوولـــە بـــۆ دەســـتەی پیـــادە، بـــۆ ســـوار و بـــۆ قـــەتار
دوژمـــنی گیـــانی فـــەقیری بـــێ لیبـــاس و خـــان ومـــان

پڕلــە تــەم ســارایە کێــو و شــیو و ئەشــکەوت و کــەناو
وەحشــیانی بــێ پــەنا ســەرمازەدە و تاقــەت نــەماو
گەهـــ لــە ترســی راویــار و گەهـــ لــە ترســی مــاری داو
ئاسمـــان هــەور و هـــەوا ســەرد و زەوی بــەفر و قـــوڕاو
هەفتــەیێ یــەک دەفعــە نــابینی جەماڵــی ئافتـــاو
بــەرگی کـــافووریی وەبـــەردا کـــردووە دنیـــا تـــەواو
گۆشـــوارەی ســـیخواری کـــردە گـــوێ داری بنـــاو
بازنــەی یــەخیان لــە دەســت و پێیــە بووکـانی شــەتاو
بێ کـەنیز و پـێ خەسـوو خـاتر پەشـێو و ناتـەوان
لەشـــکری یـــاجووجی ســـەرما یۆرشـــی هـــاوردووە
هەڵمەتی بـۆ شـەش جیهـەت وەک مـاری جـەنگی بـردووە
ســەددی ســەختی حــەزرەتی ئەســکەندەری کـون کـردووە
غـــارەت و بێـــداد و کوشـــتاری لـــە حـــەد دەرکـــرددووە
پێشــــڕەو زریانــــە بەیــــداخی مــــژی هەڵـــکردووە
عالــەمی یەکســەر لــە بــەفر و زوقــم و یــەخ پـڕ کـردووە
ســـاکنانی بـــەڕو و بـــەحری سەربەســـەر قـــڕ کـــردووە
دەور دەوری بەهمەنـــــە چونکــــە تەهەمتــــەن مـــردووە
عاقیبــەت بــێ رۆســتەمی پشــتی فەرامــەرزی شـکان
دەی‌لە جەستەی سەرو ئەکا هەر دەم بەســەردی ســەد بـرین
کەوتـــە ماڵـــی گوڵـــبنانی بێنـــەوا شـــین و گـــرین
وا لـــە حەبســـی بەهمــــەنا پۆلـــێ گوڵاڵـــەی نـــازەنین
هــەر فوغــان و ناڵــەیە، هــەر شـیوەنە و رووەمــەت رنـین
ســـەیری تـــابووری کـــرێوەی کـــە پەیاپـــەی دێ بـــەقـین
تـووش و نائــەهل و چــەتوون و شــەڕ فـرۆش و نائــەمین
زاڵــم و بــێ‌موهڵــەت و نامــەرد و بــێ ئینســاف و دیــن
بـــۆ بـــڕینی ریشـــەیی باغـــات ئەکێشـــێ تێغـــی کـــین
لەشـکری چـــەنگیزە دێ بـــۆ غـــارەتی خواڕەزمیـــان

گەردەلوولی بـەفرە نـەعرەی سەڕسـەڕە حەربـە و خەتـەر
هـــاژەیی گـــورزە، بریقـــەی تێغـــە، ئـــاوازی ســـپەر
نالـــەیی گۆپالـــە دەنگـــی تـــیرە قـــاڕەی گاوەســـەر
بـەزمی ڕەزمـی کاکـە بۆرانـە لـە حەوشـە و بـان و دەر
زەلزەلـەی حەشـرە لـە ئـەولادی نییـە دایـک خەبـەر
هەڵـمەتی مـژ بـۆ چیـا، بـۆ کێـو و سـەحرا، ڕەهگـوزەر
تـووڕە و تینـوو بـە خـوێنی ئیرەجـە یـاخۆ مەگـەر
بەهمەنـە بـو ئینتیقـامی (ڕویـینتـەن) بەسـتی کەمـەر
سەخرەیە ئەنگوشتەری دەستی (سـولەیمان)ی ڕفـان

تێئـەفکری چـۆن ئەکـەن ئـەم چـوار فەسڵـە هـاتوچوو
چـی بەسـەر بـاغ و چەمـەن دێنـێ زسـتانی تونـد خـوو
بـێ دەمـاخ و مـات وبـێ کـەیف و کـزن هـەنجیر و تـوو
ئەرغـەوانی قوڕبەسـەر سـەرما بـڕی ڕەنگـی لـە ڕوو
مـوتریبی گوڵـزار ئەوێسـتا کێیـە زاغـە و کونـدەبوو
گوڵـبنان بـێ زینـەت و ئـارایش و دڵ پـڕ دڕوو
وان لـە ئیحتـرامی حـەجا سـەر ڕووت و پێخـاوس هـەموو
دەس بـە حەڵـقەی کەعبـەوە یـا ڕەب نـەجاتێ زووبـەزوو
لـەم تـەپ و تـۆز و کـڕێوە و زمهـەڕیرە ئەلئـەمان

نوکتەیـەکت عـەرز ئەکـەم گـوێ بگـرە ئـەی گیـانی بـرات
داوێنـت ئـەگرم وەکـوو مـن بەرنـەدەی ڕێگـەی نـەجات
دوێ گوڵـێ بـووی تـازە پشـکووتوو لـە گوڵـزاری حـەیات
ڕۆیـی هـاوین و بـەهار و پـاییز و زسـتانت هـات
مووی سپی مـەئمووری مەرگـە جـارێ حـازر بـاش ئـەدات
بەنـد بەنـد ئـەعزا لـە یـەکتر گـەردن ئـازادی ئـەکات
بـێ خەبـەر هاکـا کـتوپـڕ مـەرگ داوی خسـتە پـات
دەفعـەیێ لـەم ڕێگـەوە خۆفـێ بـە دڵـتا بـۆ نـەهات
چاوم ئاگا بـە نـەکا ناگـەهـ لـە دەس دەرچـێ ژیـان

عــەرزی پــیری مەیفرۆشــم کــرد ـ بەهەشــتی بــێ بــەجێ ـ
لـــەززەتی دنیـــا چییـــە تـــۆ بی خـــودا پێمـــی بڵـــێ؟
ئـــــاوڕێکی داوە مەردانــــــە، وتی راســـــتت ئــــەوێ
هەر غەمە هەر حەسرەتە، هــەر ئێشــە، هــەر پێچــە و گــرێ
هەمــدەمی ســەد خــارە، هــەر وەختــێ گوڵــێ پەیــدا ئــەبێ
مــا لــە شــاهانی بــەروو چــاک و خــراو ئایــا یــەکێ؟
کــێ نــەجاتی بــوو لەمــەکری ، کــێ لــە داوی دەرئــەچێ
نەسڵـــی ئـــادەم رێبـــوارن، بـــاوک ئـــەڕوا، رۆڵـــە دێ

عـــادەتی دنیـــا وەهایـــە تـــا بســـووڕێ ئاسمـــان

بــەهرەی ئــەم دنیــا چییــە؟ غــەیری ئیتاعــەی کردگــار
ئــا ئەمــە ســەردی زســان و ئــا ئــەوە دەردی بــەهار
دیوتــە هــاوینی گــەرمی پــڕ لــە ئێشــی مــێش و مــار
وەی لــــە تــــەغییری سروشـــتی پـــایزی ناســـازگار
گــاە ســەرد و گــاە گــەرم، گــاە رۆشــن، گــاە تــار
گــاە بــاد و گــاە بــاران، گــاە بــەفر ئەڕژێتــە خــوار
گیانەکــەم جــا خــۆ نیانــە ئــەم فسووڵــە ئیختیــار
هەڵئەســوورِن هــەر چلۆنــێ مــەیلی بــێ پــەروەردگار

وەک من و تــۆ عــاجز و بــێ دەســتەڵاتن بــێ گومــان

ئــەی بــرا وا پێــت ئەڵــێم هارووتــە دنیــا بــێ درۆ
ئــەی دەخیلــت بم فــریبی دانــە و ئــاوی مــەخۆ
ســاحیرە ئەتخاتــە چــا بێــرۆ بــە شــوێنیدا مــەچۆ
خۆ لــە وەحشــی جیــا کــەوە تــا کــەی تــەماعی کــا و جــۆ
بــێ لــە جۆگــەی فیکــرەدا رۆژی دەم و چــاوێ بشــۆ
دیقــەتێ کــە لــەم شــەو و رۆژە کــە ئــەم دێ ئــەو ئــەڕۆ
رێگـــەی ئاســـانە هەقناســـی بـــە لاڕێدا مـــەڕۆ
ئاشـــەوانێکی هەیــە ئـــەم ئاشـــە «زاری» ســـەربەخۆ

ناگەڕێ بەم جۆرە بێ نەقس و خەلەل، بــێ ئاشــەوان

## ٦

دیم هاتـــەوە لـــە بێـــری ئـــەو گوڵـــعوزارە بـــۆ مـــاڵ
بـــە شـــێوەیێکی وا شـــۆخ، زوبـــان لـــە وەسـفی ئـــەو لاڵ
لای بردبـــوو لـــەســـەر رووی ســـروەی شـــەماڵ، دەسمـــاڵ
دوگمـــەی یەخـــەی تـــرازا و دەرکـــەوتبوو خـــەت و خـــاڵ
دوو کوڵمی دوو گوڵاڵـە پەرچـەم سـیاه و چـاو کـاڵ

بـــە پەنجـــەکانی نـــازک تەشـــی ئەگـــەر ئـــەدا پـــل
بـــە ئاسمـــانی پـــیری چـــەرخانی یـــاد ئـــەدا خـــول
هـــەودای رێـــک و کـــرژی هـــەر تاڵـــی داوی ســـەد مـــل
بـــاڵای ســـەروی بـــاغی دڵان و چـــاوی پـــڕ کـــل
ئـــارام و هـــۆش و فکـــر و قـــەراری کـــرد پامـــاڵ

قـــەترەی عـــەرەق بـــە روویـــا دەهاتـــە خـــوار وەک دوڕ
لـــە قـــەلبی عاشـــقانی بـــە خەنـــدە بـــەر ئـــەدا گـــڕ
ســـەبرم نـــەما و ســـووتام لێمـــی نـــەداوە ئـــاوڕ
ســـاقی بـــە یـــادی چـــاوی کـــەرەم کـــە پیاڵـــەیێ پـــڕ
بـــۆ دەفعـــی بێقـــەراری شـــەفایە شـــەربەتی تـــاڵ

چ دڵـــــڕفێنە شـــــێوەی هـــــەنگاوانی بـــــە لەنجـــــە
بـــەرەسمی نازەنینـــان ئـــەڕوا بـــە نـــووکی پەنجـــە
دوو مـــاری بـــێ ئیجـــازە نگاهبـــانی گەنجـــە
کـــەلامی قـــووتی رۆح و شـــفای دەرد و رەنجـــە
ســـەیری جەماڵـــی، بـــاغی بـــەهاری پـــیر و منـــداڵ

وێنـــــەی نـــــەدیوە دونیـــــا لـــــە نـــــاز پەروەریـــــدا

تـــــەنها و بـــــێ نـــــەزیرە لـــــە ئـــــادەمی و پەریـــــدا

دووچـــاوی دوو گـــەلاوێژ لـــە حوســـن و دولبەریـــدا

تلـــووعی دابـــوو خورشـــید لـــە بـــورجی موشـــتەریدا

ئـــەبرۆ هـــیلالی مشـــکین گـــەردن بلـــوور و لێوئـــاڵ

لـــە ژێـــری هـــەوری رەشـــدا تەوێڵـــی ئافتـــاوی

وەدەرئەخســـت و ئـــاهووی خـــەتا ئەکەوتـــە داوی

ســـەد شـــاهبازی پـــا بەســـت بـــە تاڵـــێ زوڵـــفی خـــاوی

بڕوانـــە بـــاغی ســـینە ببینـــە دوو گـــوڵاوی

نـــە دوو گـــوڵاوی بەڵـــکوو دوو قوببـــە نـــوقرەیی قـــاڵ

ســـەیری کـــە دێ لـــە رێـــوە میســـالی ئـــاهووی بـــەڕ

بـــە پـــۆلی نازەنینـــان ئـــەدات زینـــەت و فـــەڕ

گیســـووی موشـــکباری پـــەرژینی لـــۆی لـــۆی تـــەڕ

غـــوڵامی خاڵـــی نافـــەی خـــەتا و ســـینە مەڕمـــەڕ

برژانگی دڵ بـــە تـــاڵان ئـــەبات و ســـەر لـــە گـــەڵ مـــاڵ

بـــە عیشـــوە ئـــاوڕیدا لـــە پـــۆلی ئینتیـــزاری

بـــە نـــاز لێـــوی بـــزوان شـــەکەر رژا لـــە زاری

شـــکانی قـــەدری سووســـەن بـــە نەرگســـی خومـــاری

وەنەوشـــە عـــەتری وەرگـــرت لـــە زولفـــی موشـــکباری

لە دەوری شـــەمعی ســـەدها پەروانـــە بـــێ پـــەڕ و بـــاڵ

تـــەکان ئـــەدا بـــە گیســـووی ســـەبا لـــە رێگـــوزەردا

عـــەتر بـــڵاو ئـــەبێتۆ بـــە هـــەرد و دەشـــت و دەردا

بـــۆ دڵ ڕفـــێنی عـــەقرەب کشـــا بـــە ســـەر قەمـــەردا

گەشـــاوە ئـــاوری شـــەوق لـــە قـــەلبی پـــڕ شـــەرەردا

لـــە «زاری» تێبفکـــرە بـــە جـــارێ بـــوو بـــە زووخـــاڵ

## ٧

**غەواسی دەریای فەهیمی، ئاغا محمدخانی سەلیمی گۆی بدێریّ ئەم گەوهەرانەم بە خەزێنەداری فیکر بسپێریّ ئاغام چ خێرە؟ کە بەینێکە لێم ناپرسیّ ئەڵبەت ئەفەرمووی فڵان مەلایە و من ئاغام لێم ناترسیّ یا خوا نەخواستە فکرت بڵاوە و تاقەتی جارانت نەماوە، گوێ بگرە لێم بزانە چی ئەڵێم، ددانی گازی دووری رەگی حەیاتی لەبەدەن دەر هاوردم هەوای بەهاری دیداری یار تەعریفێکی بەهاری پیّ کردم مەحرەمێ نەبوو بۆتی بنێرم خۆم هاوردم... شێعر بۆیە ئەڵێم تۆ بیخوێنیتەوە و من گوێی لیّبگرم ئەگەر تاقەتت هەیە فەرموو بابیبیسم نەکا بمرم... ئاوارەی دیاری نادیاری «زاری»**

هـــەوا بـــە داری بـــیّ گـــەڵا بەشـــارەتی بـــەهار ئـــەدا
بـــەهار زینـــەت و ســـەفا بـــە ســـەحنی لالـــەزار ئـــەدا
لالـــە نەویـــدی وەسڵـــی گـــوڵ بـــە بولبـــولی هـــەزار ئـــەدا
لـــە بـــەزمی گوڵســـتانەدا ســـەبا لـــە چـــەنگ و تـــار ئـــەدا
زیوەر بە باغ و مێـرگ و بەهەشـت و کۆهسـار ئـەدا

بـــە بـــانگی بـــەرزی زەرگـــەری نەســـیم بانگـــەواز ئـــەکا
وجـــوود بـــەخش دەرگـــەهی هـــەماری جوودبـــاز ئـــەکا
لـــە زێـــوی بـــەفری زیـــوەری گوڵاڵـــەکان ســـاز ئـــەکا
بـــە خەلعـــەتێکی سندســـی چنـــار ســـەرفەراز ئـــەکا
لە حوسن و دڵبەری بە گـوڵ هـەزار ئیفتیخـار ئـەدا

گـــــەزیزە قاســـــدێکە دیّ لـــــە ئـــــاخری زســـــانەوە
خەبـــەر ئـــەدا توجـــاری حوســـن، دێتـــە گوڵســـتانەوە
بـــە موشـــک و عـــەتر و عەنبـــەر و عـــەبیر و ســـورمەدانەوە
بەعەبقـــەری و ئەتڵـــەس و حـــەریر و پەرنیانـــەوە
بـــە غونچـــەکان گوڵـــبونی مـــەتای زەڕنیگـــار ئـــەدا

هەزار تەعم و رەنگ و بـۆ لـە یـەک زمـین و یـەک هـەوا
درووس ئـــەکات بـــێگومـــان یـــەکێک دەرد و یـــەک دەوا
هەڵاتنی ئەسێرە ئـەو بـەدووی ئـەم، ئـەم بـەدووی ئـەوا
خورشـید و مانـگ دوو چـرا لـە بـەزمی رۆژ یـا شـەوا
فیکر لەمانـە مەعریفـەت بـە قـەلبی هۆشـیار ئـەدا

لـــە نەقشـــی حـــیرەت ئـــاوەری گوڵاڵـــەکانی دڵگوشـــا
لە رەنگ ڕێــژی قودرەتــێ کــە ئــەم گوڵانــە رەنــگ ئــەکا
دیققــەت بــە ئــەهلی دووربــین بکــە، بزانــە ئــەی بــرا
بــــە ڕێکـــــی و مورەتتــــەبی ئـــــەقیقی ئابــــدار وا
چ قادرێکــە دائــەنێ لـــە نێـــو یـــەک هـــەناردا

بــەهار بانــگ ئــەکا بەشــەر وەرە بــە ئــەقلی خۆنــەزەر
بکــە بپرســە تــۆ خەبــەر ببیســە قــەولی موعتەبــەر
لە سەوزە هەرکە دێتە دەر لە گــوڵ لــە خــار و نەیشــەکەر
لە گیا و داری دەشــت و دەر بــۆ دەفعــی واهیمــە و خەتــەر
ئــەحیای ســانەوی خــودا بــە جوملــە گیانــدار ئــەدا

رەعد بە هەور ئــەو دەمــەی کــە ئــەمری زوود بــاش ئــەکا
هـــەوا حـــەیات پـــەروەر و زەوی گـــوڵاو پـــاش ئـــەکا
بەغونچـــەکانی گوڵـــبونی ئـــیعلانی شـــادباش ئـــەکا
هـــەزار گوونـــە بـــۆنی خـــۆش لـــە لالـــەزار فـــاش ئـــەکا
شێوەی بەهەشتی عەنبەرین بە کەژ بە کۆهسار ئــەدا

زســـان چـــون ســـتەمگەری گەیانـــە بـــورجی موشـــتەری
بـــەهار تیپـــی عەســـکەری ڕژانـــە بـــورج و ســـەنگەری
شــکانی گــەردن و ســەری بــێ رۆحــی کــردە پەیکــەری
وەکــوو یــەهوود خەیبــەری بــە زەربــەکانی حەیــدەری
شەماڵــی تونــد و تیــژرەو نیشــانی زولفــەقار ئــەدا

لــە هــەر کڵێڵــە بــەفر ئــەدا شــەماڵ گــورزی رۆســتەمی
ئــەیکا بــە ئــاو و تێکەڵــی ئــەکا بــە خــاکی بــەردەمی
ســەرما فــەرار ئــەکات چــون فــەرارە مەرهــەمی غــەمی
نەســـیمی ســـوبح بـــۆ مـــژی زســـان مەرگـــە مەقـــدەمی
مەئمووری قەتڵی زوقم و یەخ جەلادە تەم لە دار ئــەدا

موزەییەنە چەمەن وەکــوو بەهەشــتی عەدنــە هــەر گوڵــێ
بــە قــودرەتی خــودا شــەمێکە هەڵــکرا لــە هــەر چڵــێ
بـــە بێـــدڵان ئـــەی نەســـیمی ســـوبحدەم بـــڕۆ بڵـــێ
وەرن نشـــات و شـــادییە لـــە هـــەر موقـــام و مەنزڵـــێ
هەزار دادی خۆشدڵی بە چــەنگ و عــوود و تــار ئــەدا

سـەرو بـەناز و دڵـبەری پۆشـیویە بـەرگی عەبقـەری
لـە خۆشـیا هەڵاڵـە دێ، لـە چـاوی ئـاوی گەوهـەری
لـــە گوڵســـتانەدا مەگـــەر رژاوە موشـــکی ئەزفـــەری
لـــە بیدموشـــکەوە بـــڵاو ئـــەبێت عـــەتری عەبهـــەری
سەمەن سـەفا لـە ژاڵـەوە بـە زوڵـفی تابـدار ئـەدا

سـروەی بـەهاری نیـک پـەی بـەزمی زسـانی کـرد تـەی
شـــکانی تیپـــی بەهمـــەن و ســـوپای نائـــەمینی دەی
لە بید و کۆخ و سەرو و توو، هـەرمێوهەناروسـێو و بـەی
تـەرتیبی داوە مەجلیسـی سـەفای وەخـت و بـەزمی مـەی
بە پێکـەنینی غونچـە و نەرگسـی پـڕ خومـار ئـەدا

تەیرانی خۆش نەوا بەجەم، بـە روود و عـوود و زیروبـەم
لەگـەڵ نەسـیمی خۆشـدەم لـە دڵ ئەشـۆنەوە ئەلـەم
وەکوو لە سینە گەردی غەم گوڵاڵـە سـوورە میسـلی شـەم
بووکی شـکۆفە هـەر کـە دەم ئەکاتـەوە بـە خەنـدە لـەم
جەژنە پەیامی تەهنییەت بـە سـەروی جۆیبـار ئـەدا

غونچــە لــە پــەردە هاتــە دەر بــە نــاز و پێکەنینــەوە
وەنەوشــە دەســتی وا بــەدەس نەرگســی نازەنینــەوە
وەکــوو کچــانی مەکتــەبی کــە بێنــە هەڵــپەڕینەوە
چــــەنگیزێکی دڵڕوبایــــە هــــاتووە لــــە چینــــەوە
لە خوێنی ئاشقان رەنـگ بـە لێـو و گوشـوار ئـەدا

لــە بەنــد ئــەوا خــەلاس بــوو مەحبووبــەکانی ماهــڕوو
خەریکی سەیر و سوحبەتن دەستە بـە دەسـتە دوو بـە دوو
لەماڵـی غونچـە دێنـە دەر بـە حوسـنی یۆسـفی هـەموو
لالـــە لـــە ســـوبحگاهەدا بـــە نـــاز دێتـــە هـــاتوچوو
لە ماچی خاڵی گـەردنی مـەزە بـە مەیگوسـار ئـەدا

ســەوزە بــە بەنــدەگی ســەری لــە ئاســتانەیی گــوڵ
دانـــاوە دەردە دڵ ئـــەکا لەگـــەڵ جـــەنابی بولـــبول
لـــەم سکڵـــە وا گەشـــاوەتۆ لـــەنـــاو بۆتـــەی دڵ
مـــەغز و دەمـــاغ و پێشـــە و رەگـــم، بـــە پێســـەوە کـــوڵ
تەعنە لە سۆزی ئـاوری جـەحیمی پـڕ شـەرار ئـەدا

دایکــی خــاک گــوڵ بــە خێــو ئــەکا بــە شــیری دڵــبەری
بــە مــەمکی میهــری گــۆچ ئــەکا منالــەکانی ئــازەری
لــــە لانکـــی نزاکـــەتا ئـــەکات رۆڵـــە پـــەروەری
لە ناز و عیشـوە تـاج و تـەوق ئەکاتـە گـەردن و سـەری
شەرابی خوسرەوی بە گوڵ لە ئاوی چەشمەسار ئـەدا

لــە پــاش جــەوری بەهمــەنی بــە قــەلبی دەردناکــەوە
چــووزەی گوڵاڵــە ئەودەمــەی کــە دەم ئــەنێ بــە خاکــەوە
فریشـــتە ئاگاداریــــە لــــە لای زاتی پاکـــــەوە
وەکـــوو ئەســـێرە دێتـــە دەر بـــە رووی تابناکـــەوە
شکسـتی نافـەیی خـەتا بـە زولفـی موشـکبار ئـەدا

تــەنینی پــەرنیان و ئــەم هــەموو حــەریرە خــەت خەتــە
بــێ تــان و پــۆ و دەفــە و مــەکۆ و گــورد و پــێ تەتــە
نە کـاری دەسـت و بـازووە، نـە دەخـل و ئیشـی ئالەتـە
خولاســـە یـــەک عەلامـــەتی ســـەحیح بـــۆ قیامەتـــە
بـەهار پەنـد و ئاگـەهی بـە ئـەهلی ئیعتیبـار ئـەدا

زەمــینی رووت و بــێ نــەوا خــزرە لــە ســەبزە پۆشــیا
ئـەم ئاسمانـە پشـت کـوورە رەقـس ئـەکا لـەخۆشـیا
هەمــدەمی حــۆری جەننەتــە لالــە لــە بــادە نۆشــیا
دایـــەنی بـــاغ ســـەد ســـەفی گوڵاڵـــە وا لـــە کۆشـــیا
بە دەستی تەربیەت غەزا بە تفڵـی شـیر خـوار ئـەدا

بۆ زیب و زینـەتی چەمـەن شمشـاد و سـەرو و یاسـەمەن
لیباسـی تـازە بـەر ئەکـەن بـە نـاز دێنـە ئەنجومـەن
لەدڵــبەرانی سـیمتـەن تـەبریکی نەوبـەهار ئەکـەن
ســـوپای رۆح پـــەروەری بـــەهار، هاتـــەوە چەمـــەن
بەتووتیانی خۆش نەوا شەکەر لە شـەوقی یـار ئـەدا

لـــە هـــەور ئـــاوی زینـــدەگی پشـــا بـــە دەشـــتەکاندا
بـــە گوڵـــبن و گوڵاڵـــە و گوڵـــی گوڵـــگەشـــتەکاندا
وەنەوشـــەزار نـــاز ئـــەکا بەســـەر بەهەشـــتەکاندا
دەوای وەسـڵ پـەخش ئـەکا بـە هیجـری چەشـتەکاندا
«دار الشـــفا»ی قودرەتـــە شـــفای دەردەدار ئـــەدا

دایـــەنی کێـــو جێگـــە بـــۆ گوڵاڵـــەکانی موشـــکبۆ
غەیری کـەناری کێـو و جـۆ بـۆ سـەیری گـوڵ دڵا مـەچۆ
حـەیاتی بـێ فـەنات ئـەوێ؟ لـەم ئاسـتانە قـەت مـەڕۆ
فیـدای ئـەو گوڵاڵـە بم مـەقامی وا لـە لێـوی جـۆ
کە بەنـدەگی رەهـی شـەهی بـە عـاجزانی زار ئـەدا

نسـیمی سـافی ئـەو دەرە عـەجیب رۆح پـەروەرە
جێگـەی ئەمانـە مەعبـەدی شـەتاوی ئـاوی کەوسـەرە
چ ئافتابـە؟ لێـرەدا بـە نـووری هـەق منـەووەرە
دەمـاغی دڵ بـە نافـەیی موحەببـەتی موعەتتـەرە
هـەوای سـەروی قامـەتی شـفای شـێت و هـار ئـەدا

ئیشـارە نـەفعی کـەی بـووە، سـەریح بێـژە تـا زووە
حـەیات بەخشـی مـردووە هـەوای بـاغی دووڕووە
«دارالسـلامە» خانـەقا تەسـنیم عـەینی بێلـووە
تـەبیبی ئێمـە لـیرەدا مـەقامی خـزری گرتـووە
لە بەحری هیممـەتی بەشـی گـەدا و شـەهریار ئـەدا

لـە خۆشـی تۆیـە گیانەکـەم زبانـە نوکتەزانەکـەم
تەبیعەتـە ڕەوانەکـەم، رمووزەکـەم، بەیانەکـەم
تـەرتیبی نەزمـە جوانەکـەم میـدادە دوڕفشـانەکەم
عیبارەتـە عەیانەکـەم تەرانـە ئاشـقانەکەم
بـە ئاشـنا و ئەجنـەبی شـەرابی خۆشـگەوار ئـەدا

عـومری عـەزیز «زاریـا» وەکـوو بـەهار فانییـە
بەشـەر بەشـی زەواڵـە بـۆ فەنایـە بـۆ بـەقا نییـە
بـەهاری سـاڵ ئەگـەر بـەهارە هـارە بـێ جـەفا نییـە
بـەهاری ئێمـە خۆشـە چـون هـەر یـادی یـاری جانییـە
هەر لەحزە تازە لەززەتێ بـە قـەلبی بێقـەرار ئـەدا

## ٨

**تەخمیسی زاری لە سەر غەزەلێکی مەرحووم خوالێخۆشبوو محەممەد خانی سەلیمی:**

ئـەوی دەرد و موسـیبەت بـوو لـە رێگـەی عیشـقدا دیمـان
چیـە دەرمـانی ئـەم دەردە، خـودا چـارە، خـودا دەرمـان
بـە شمشـیری برۆکانـت ئـەوا زەخمـارە دڵ، دیسـان
خـەدەنگی چـاوی بیمـارت کـە دێـت و دڵ دەکـا نیشـان
نییە خۆفێ لە رۆح و گیـان قسـەی فـەوتانی ئیمانـە

مـەزاقی تاڵـە تـووتی تـەبعی مـن بـێ قەنـدی گوفتـارت
حـەیاتم هـەر دەمـێ سـەد مردنـە، بـێ بـەزمی دیـدارت
فەلـەک رێگـەم کـە نـادا لـەحزەییێ تـا بێمـە گولـزارت
خەیاڵم نادە سەر سـەفحەی جەماڵـی رەنـگ و روخسـارت
شەهابی سـاقبت یـەک دەفعـە دڵـمی کـردە نیشـانە

لە سایەی چـاوی مەسـتی تـووە عالـەم پـڕ لـە غەوغایـە
لـە هـەر گۆشـە و کـەنارێکۆ تـەقالا بـۆ تەماشـایە
لـە مولـکی حوسـنەدا سـالارە، سـەردارە، شەهەنشـایە
ئەکـەم رۆحـم بـە قوربانـت هـەتا رۆحـم لـە بەردایـە
ئەگەر رۆحم بە قوربان کەم لەلام زۆر سووک و ئاسانە

بـە گـەرمی ئـاوری شـەوقی جەماڵـت سـینە سـووتاوم
لە تـاوی هیجـرت ئـەی گیـان ئـەمن دوو رووده دوو چـاوم
لـە شـاری عیشـقدا بڕوانـە کـانی ئـاور و ئـاوم
لە بەحری ئایەتی حوسـنت، عەجـەب مـەغرووق و دامـاوم
کـەنار و سـاحیلی عیشـقت چ ناپەیـدا و پایانـە

ئەڵـێن دەرمـان ئـەکا دەردی دڵـی پـڕژان و ئێشـاوم
ئەبەخشـێ نـووری دووبـارە بـە دیـدەی نـوور فـەوتاوم
بـە مێهمـانی کـە بێـت و پـا بنێتـە بـانی دوو چـاوم
خودایـا چەنـدە خۆشـە مێزبـانی قـەلبی فـەوتاوم
چ غەوغایـە لـە خاترمـا «مضـیف»ی شـاە سولـتانە

لـــە دووری تـــۆ نـــەکا هـــاوار خـــاتر پـــڕ ســـکاڵاکەت
بەدەسـتی لـوتفی هـەق بمخاتـە ژێـری سـایەی ئاڵاکـەت
هــەتا بیکــەم بــە ســورمەی چاوەکــانم گــەردی پاڵاکــەت
نەتـــەنها حـــازرە خـــاتر لـــە بـــۆ ئـــاوایی باڵاکـــەت
گلێنــەی چاوەکانیشــم دەکــەم بــۆ تــۆ بــە کاشــانە

ئەجــەل گــەر مۆڵــەتێکم پــێ بــدات ئــەی گیــانی شــیرینم
لـــەباتی پـــێ بەســـەر بێمـــە حـــوزوور ئـــەمجارە بتبیـــنم
یـــەقینم وایـــە بـــۆ دەفعـــی هـــەموو ئـــێش و نەخۆشـــینم
بـــە قوربـــانی ســـەرت کـــەم رۆح و گیـــان و دیـــن و ئـــایینم
هــەتا بیهێنمــەجێ نــەختێ ســزای ئیکــرامی میوانــە

بـــە بـــێ یـــادی جەماڵـــت گـــەر بڵـــێم دڵ شـــادە ناشـــادە
دڵـــی خاڵـــی لـــە شـــۆری عیشـــق وێرانەکـــەی ئابـــادە
خـــودا هـــەر پایـــەداری کـــات ئـــەو حوســـنە خـــودادادە
هەناسەیشــم بــە یــادی تــۆ ئەکــەم بــۆن خــۆش و ئامــادە
کــە بــا زوڵــفی پەرێشــانت تــا تــا بکــا شــانە

ئەوەی هۆشیارە بـێ هۆشـە لـە دەوری نەرگسـی شـەهلات
ئەسـیری زوڵـفی داوی پەرچـەمی تاتاتـە هەرکـەس هـات
دە سـاقی تێکـە سـاتۆ بیخـودا بـا غـەم لـە دڵ بـڕوات
ئەگـەر چـاوم بـە بەدبـەختی نـەبینێ قامـەتی زیبـات
بەقورئان سوێن دەخۆم شاهم، فەقەت کوێربوونی دەرمانە

مـــەتاعی عاشـــقی بیچـــارە هـــەر فیکـــر و خەیاڵاتـــە
بەڵـــێ هـــەر نـــووری ئـــەفکارە جلەوکێشـــی کەماڵاتـــە
وەکـــوو «زاری» «ســـەلیمی» موشـــتەری کـــالای باڵاتـــە
ئەوێســـتا قیبلەکـــەم عـــەکس و خەیاڵـــی قـــەد و باڵاتـــە
لە سایەی چاوەکانت (ئەحمەدئاوا) بـوو بـە بتخانـە

جەماڵـــی حـــەزرەتی لـــەیلا رەواجـــی دا بـــە مـــەجنوونی
دڵـــی بـــردم بـــە عیشـــوەی چـــاوی کـــاڵ و لێـــوی مـــەیگوونی
لـــە حەڵـــقەی زوڵـــفدا گـــیرە، محاڵـــە تـــازە بـــەربوونی
خوداوەنـــدا قـــەدیر و قـــادر و قـــەییوم و بێچـــوونی
کەرەم کە رەحمەتت با بێ، کـەرەم کـاری کەریمانـە

# ٩

نــازانم دڵــبەر بــۆچی لــە ســەرچی لــێم تــۆراوە
بــۆ رووی لــێ وەرگێــڕاوم بــەرم ناکاتــە لاوە
قـــینی لـــــە مـــــن هەســــــتاوە

لە شـەوقی گـەردن زەردان دڵ شـێواوە و سـەرگەردان
مەجنوونـە وێڵـی هـەردان ئاگـای لـە خـۆی بـڕاوە
شـــــێتە و هۆشـــــی نـــــەماوە

هـــەنگی دڵ ئاڵـــۆزاوە پـــوورەی لـــە زوڵـــفی داوە
وەحشـــە گـــیرۆدەی داوە غـــەریب پـــەنای هێنـــاوە
تێفکـــــرە چـــــۆن ســــــووتاوە

گێسووی وەک موشکی تاتار ئەڕژێتە گۆنـای گوڵـنار
لە دەوری بـاغی روخسـار، رەشمـارە حەڵـقەی داوە
پاســــــەبانە راکشــــــاوە

ئـەبێ بـۆچی نەناڵـم سـەراپا کـۆی زوخاڵـم
لە دەس چوو حاڵ و ماڵم چش لە ماڵ، حـاڵ نـەماوە
هـــــەردووم لــــــەدەس بــــــەرداوە

بــە هــەوای وردە خــاڵان هۆشـم رۆیـی بـە تـاڵان
بووم بـە شـەوچەرەی مـاڵان زەنگـم لـە عـام زڕاوە
شیشــــــەی نـــــاوم شــــــکاوە

بە شەو و رۆژ نەسرەوتم هەر وە دووی هەوەس کەوتم
ئێستە ئەهلی هەر حەوتم، هەشـتم لـە دەس بـەرداوە
رســــــوام و رەنـــــــدم نـــــاوە

بــە ئــاوی پەشـیمانی، ئەشـۆم گـەردی نـادانی
ئینسانم، ئینسان زادەم چم لـە خـووی شـەیتان داوە
لـــــــە رێگــــــەم بـــــــۆ لاداوە؟

بەس بۆ دنیا تەک و دەو، تا کەی بـیری ئـەم و ئـەو؟
بـۆچی هەڵنەسـم لـە خـەو، شـەوم بـەیانی داوە
شــــــەوی تـــــارم هـــــــەتاوە

بـۆ مەیـدانی مکافـات چـاک و خـراو کـە ئـەڕوات
بـەدکاری وەک مـن چبکـات بـە دەفتـەری سـیاوە
بـــــە نامـــــەی پـــــڕ خـــــەتاوە

«زاری» حەبسە لە چاهـا، سـەد خـاری وا لـە راهـا
لــە ژێـر بـاری گوناهـا وەکـوو گۆچـان چـەماوە
کــــــەوتووە، غـــــــەرقی قـــــــوڕاوە

## ١٠

**«لە وەسفی مەحبووبدا وێژرا، وەکوو گەوهەر بە یەخە و داوێنی عاشقانا رێژرا»**

لــەم شــەوی هیجــرەدا مەگــەر بــەدرە شــوعاع ئەداتــەوە
رۆژە تلـــووعی کـــرد؟ یـــا حەبیبـــە لا ئەکاتـــەوە
بـــە خـــاکپـــای عـــەرز کـــەن لـــە رووی ئیلتیفاتـــەوە
بـــە پـــەردەدار ئـــەمر کـــا کـــە پـــەردە دانەداتـــەوە
دەرگـــای میهـــر و مەرحەمـــەت لـــە ئێمـــە دانەخاتـــەوە

گەرچی لــە بــەزمی وەسڵــەدا هــەر تــاری زولفــە عــەقرەبێ
غــەیری ویســاڵ نیمــە مــن لــە هــەردوو کــەون مەتڵــەبێ
سـوووتاوی ئــاوری غــەمی فیراقـی ئێــوە کــەی ئــەبێ
بـــە ئـــاوی وەســـڵ تـــەڕبکا بـــە ئـــارەزووی خـــۆ لـــەبێ
شــەفای زەخمـی سـینە، وا بــە مەرهــەمی نیگاتــەوە

مەنعم لــە ناڵــە بــۆ ئەکــەن بــەم هــەمووە بــاری ئێشــەوە
فــەریاد و ناڵــە خۆشــە بــێ لــە ئەنــدەروونی رێشــەوە
لــەبی بــە خەنــدە پــێم ئەڵــێ مەترســە بێــرە پێشــەوە
مــژەی بــە قــەهر بانــگ ئــەکا دواوە! دەس بکێشــەوە
لافــاوی زەجــر ئــەم هــەوا لــە ســینە ناشــواتەوە

غـــوڵامی خـــاکی دەرگـــەهی پـــیرانی پـــاک تینـــەتم
کــە تــەوقی شــەوقی بەنــدەگی ئەوانــە زیــب و زینــەتم
ســەبا بــە شــاە گــوڵ بڵــێ فیــدای ئــەو جەبینــەتم
یــادی جەماڵــی تۆیــە هــەم ســروور هــەم ســەکینەتم
بــەقای رۆحــی ئێمــە وا بــە یــادی دڵگوشــاتەوە

قـــەدەح فـــڕێ دە ســـاقیا پیاڵـــە رزقـــی مـــردووە
بــە کووپــە بێنــە بــادە چــون بــە بــادە رۆح زینــدووە
لــە عیشــق زاوە تــەبعی مــن بــە بــادە گــۆچی گرتــووە
ئێـــرانی ئێمـــە جەننەتـــە و رزوانـــە شـــاە «دوڕووە»
جــەنابی خــزرە هــاتووە لــە چەشمــەی حەیاتــەوە

ئــەم ســەروی گوڵشــەنی ســەفا بــە ڕووی ڕەشک ماهــەوە
لــە جــەوری بــادی پــاییزی کــە هاتــە بــاغی شــاهەوە
ســـەد ئیحتــڕامی پـــێ درا لـــە شــاهی جــەم کولاهـــەوە
گۆیـــا بـــە خێـــرە مەقـــدەمی خـــەدەم لـــە بارەگاهـــەوە
لەببەیکی لێ کرا لــە هــەر کــەنار و هــەر جیهاتــەوە
لــە دەوری شــەمعی ئــەنوەری پەروانــە جــەمعی بەســتووە
یـــەکێ شـــەهیدی ئـــەبرووە یـــەکێ نـــەچیری گێســـووە
حەشــرە هەرایــە ناڵــەیە شــیوەن لـــە حـــەد دەرچـــووە
چ ئاورێکـــە ئـــەی خـــودا لـــە عاشـــقانی بـــەربووە
ئەمیری شــەوقی هــاتووە ئەســیری خــۆی ئەباتــەوە
لــەم عەســرە پــڕ لــە فیتنــەدا کــە ڕۆژەکــانی وەک شــەوە
هــەوەس وەزیــری ئــەعزەم و هــەوا جــەنابی خوســرەوە
تــەقوا غــەریب و دەربــەدەر بــێ کــەیف و نــاز و پرتــەوە
فەرمانـــڕەوان و موتتـــەفیق، فجـــوور و جـــەور پێکـــەوە
بە نــووری ئــەم چــرا بــرا بــڕۆ لــە ڕێــی نەجاتــەوە
نـــەمامی بـــاغی مەعریفـــەت هـــەوری بـــەڕێژی ڕەحمەتـــە
مەنبـــەعی فـــەیز و ئابـــڕوو مەعـــدەنی حـــیلم و حیکمەتـــە
ڕێگـــــەنوێنی راســــــتی، چــــــرای دیــــــن ومیللەتـــــە
مەزهـــەری لـــوتفی ئیـــزەدی ئەختـــەری بـــورجی عیززەتـــە
پەنا بە خاکپــای ئەبــەن لــە غــەرب و خۆرهەڵاتــەوە
ســـاقی لـــە بـــەزمی شـــاهدا بەشـــارەتی نـــەجات ئـــەدا
مـــوژدە بـــەهاتنی شـــەوی پـــڕ شـــەڕەفی بـــەرات ئـــەدا
بــە کوشــتووانی زەهــری هیجــر، شــەربەتی حــەیات ئــەدا
بـــە رووتـــەکانی شـــاری عیشـــق، هەدییـــە و خـــەڵات ئـــەدا
لە ئێمەش ئــەی خــودا بــە لوتــف، ئــاوڕێ بداتــەوە
زانیوتـــە چۆنـــە بـــێ خەبـــەر؟ ئـــەوزاعی ناســـڵامەتت
نـــە زینـــدەگانی وا ئـــەبێ نـــە تۆشـــە بـــۆ قیامـــەتت
بڵـــێ بـــە شـــاە ئـــەی ســـەرم فیـــدای ســـەروی قامـــەتت
گـــەدایی بێنـــەوا بەشـــێ لـــە خەرمـــەنی کەرامـــەتت
تەڵــەب ئــەکات و چــاوی وا لــە ڕێــژەوی عەتاتــەوە

چ بارەگاهـــــە وا پـــڕە لـــــە زایـــرانی باشـــەڕەف
میسـالی کەعبـە زایـری بەڕێوەیـە لـە هـەر تـەڕەف
لـە دەور و پشـتی مەنزڵـی نـەچیرەکانی سـەف بـە سـەف
وێسـاون و بـە سـەد زبـان ئەڵـێن حەسـرەتا، ئەسـەف
بۆ ئەو کەسەی کـە زوو نەهاتـە سێبەری هوماتـەوە

چ ئاسـتانە؟ راسـتان غـولامی خـاکی دەرگـەهی
فـەقیرەکانی عـاجزن لـە تـەخت و ئەفسـەری شـەهی
شۆڵـەی چـرای روونی دڵ نـەجات ئـەدا لـە گومـڕەهی
بـێ ئیقتیبـاس لـەو شـەوی گـەر ئافتـاب یـا مـەهی
بـێ شـارەزای! ڕێ نـەڕۆی! مـار ئـەدا بـە پاتـەوە

چ ئاسـتانە؟ وا دەکـا بـە ئاسمـان بەرابـەری
بـە سـاکنین و رەفعـەت و بـە مانـگ و خـۆر و ئەختـەری
سـەری سـەرانە موفتەخـەر بـە گـەردی خـاکی بـەر دەری
لـە کێوەکـانی زاهـیرە نیشـانی عولـوو و بەرتـەری
کـە قوللـەیان وا لـە ژوور کێـوی هـەر ولاتـەوە

چ خۆشـە ئـەی دڵا لـە گـەڵ هـەزار زەخمـی نەشـتەرا
بژیـت و دابنێـی سـەرت لـە خـاکی پـای دڵـبەرا
ئـەو داری سـەدرە «جنـت المـاوا»ی وا لـە سـێبەرا
بەزەییـەکی بێـژە بـێ بـە سۆزشـی سـەمەندەرا
بـە پرسـیارێ دەفعـەیێ دڵخوشـییەکی باتـەوە

ئـەمیری موڵـکی دڵـبەری کـە ئـارەزووی شـکار ئـەکا
دانـە لـە خـاڵ و داوی دڵ لـە زولفـی تابـدار ئـەکا
بـە حوسـنی بـێ نـەزیرەوە کـە روو لـە لالـەزار ئـەکا
وەنەوشـە سـەرفکەندە و گولاڵـە شەرمەسـار ئـەکا
لـە ئیعتیـدالی قامـەتا گـرەو لـە سـەرو ئەباتـەوە

نیگـاری ئێمـە «زاریـا» لـە روو کـە پـەردە لائـەدا
بـە حـازران لـە لـەعلی لێـوی شـەربەتی بـەقا ئـەدا
بـە حوسـنی خولـق و زیـبی خـەلقی شێوەی بـەها ئـەدا
بـەها بـە دیـدەیی عـەلا و نـەجمی دیـن ضـیا ئـەدا
وەکوو چرای ئـەووەڵ ئـەم چرایـە شـەوق ئەداتـەوە

## ١١

چ نەشــــئەیێکە دڵگوشـــا لــــەو ڕشــــتە کۆهســــارەوە
زهـــوور ئـــەکات و بێـــدڵان ئەخاتـــە ســـەد خومـــارەوە
دەمـــێ ســـەحەر ئـــەدا خەبـــەر لـــە ئـــەرکی شـــەهریارەوە
عـــەتری بەهەشـــتی پێیـــە بـــا ، کـــە دێ لـــە لالـــەزارەوە
مـــوژدە بـــە بولبـــولان ئـــەدا لـــە لایـــەنی بـــەهارەوە

کـــە شـــێری ئـــەو حەریمـــە دەم دەمـــی فیـــوز بـــاز ئـــەکا
خـــزر لـــە ئـــاوی زینـــدەگی بێـــزار و بـــێ نیـــاز ئـــەکا
بە شەوقی پڕ لە شەرمەوە بولبول کـە عـەرزی راز ئـەکا
ســـەبا بـــە دەســـتی بەنـــدەگی یەخـــەی شـــکۆفە واز ئـــەکا
وەک ئافتـــاب دێتـــە دەر لـــە بـــورجی شاخســـارەوە

چ ئاورێکە بەرئـەبێ لـە دڵ، لـە سینە، جسـم و گیـان
ســـاقی کـــە دێتـــە بەزمـــەوە میســـالی مـــاهی ئاســـمـان
ســـەدای رۆح پـــەروەری، قووەیـــە، قووتـــە بـــۆ رەوان
نالـــەی تـــەزەرو و قومریـــە، زینـــەت ئەخاتـــە گوڵســـتان
ئەڵێن بە جووت پێکـەوە بـە شـەوقی بـێ شمـارەوە

بۆ دەفعی ئێشی زەخمـی دڵ، ئەگـەر جۆیـای مەرهـەمی
کەسـبی سـەفا و سـەفوەتێ بکـە لـە پڕتـەوی شـەمی
زسـتانی هیجـر بـاری کـرد، بـڕا لـە بـاغی دڵ تـەمی
هاتەوە دەوڵـەتی گـوڵ و زەمـانی عـەیش و بـێ غـەمی
تێکـە بخـۆ پیاڵـەیێ بـە دەنگـی چـەنگ و تـارەوە

لــە خــوا بخــوازە چاوەکــەم ڕەفاقــەتی شــەکەر لــەبێ
بێ بــەزمی ئاســەفی زەمــان هــەتا بگــەی بــە مەتلــەبێ
ئاگا بە نەقدی عــومر بــا لــە دەس، بێهــوودە دەرنــەچێ
دوور ڕۆژە عەهدی گوڵ نەکا فرسەت بــە کــامی دڵ نــەبێ
ساقی بــە کووپــە بێنــە مــەی پیاڵــە هــەر بشــارەوە

هەرزانــە موشــتەری وەرە دیــداری ســەروی ســیم بــەر
لە بەزمی مەهوەشــاندا ئــەدەن بــە گیــان و مــاڵ و ســەر
ســۆزە، گــودازە، ناڵــەیە هــاوارە شــیوەنە و چەمــەر
ڕووبەنــدی سۆســەنی دڕی نەســیم و زوڵــفی کەوتــە دەر
ئــاوری شــەوقی خســتە دڵ بولبــولی بێقــەرارەوە

لــە ئاســتانی نەرگســا عومــوومی غونچەکانــە جــەم
وەنەوشــە ســەر فکەنــدە وەک لــە رووی شــاهدا خــەدەم
پیاڵە نەشئە بەخشە بــۆ نــەجاتی دڵ لــە بــەحری غــەم
لــە ژاڵــە تــێ بفکــرە تــۆ لــە ســەر گــوڵانی ســوبحدەم
میسالی قــەترەیی عــەرەق بــە ڕوویــی گوڵــعوزارەوە

عــەزیزی میســری خــاترە لــە گوڵشــەنی حــەبیبیا
موتــازی عەســری حــازرە لــە مەعــدەنی نــەجیبیا
کــە ئــەم مەســیحە هاتــە دەر لــە مەعهــەدی تــەبیبیا
بــە ڕەنــگ و بــۆ و مــەنزەرە، چەمــەن لــە دڵــفریبیا
شێوەی بەهەشتی گرتــووە لــە هــەوری موشــکبارەوە

دیــداری یــارە حــەجی مــن، چ حــەج؟ حــەجی ئەکبــەرم
فــەدای خــاکی ڕێگەکــەی گیــان و مــاڵ و هــەم ســەرم
گێســووی عەترســا ئەگــەر وەدەر ئــەخات دڵــبەرم
خــەتا، خــەتا ئــەکا بڵــێ مــەکانی موشــکی ئەزفــەرم
خەرمــەنی موشــک وا بەســەر شــەهی کــڵاو لارەوە

لە خۆرهــەڵات و خۆرنشــین، بــۆ عاشــقانی دڵ حــەزین
هەر ئەمە مەرهــەمی بــرین، «رضــوانه» هاتــە ســەرزەمین
لە دەور و پشتی مەنزڵــی حەشــرە، چ حەشــر بــێ بــبین
سەفی گــوڵانی نــازەنین، خــاتر فریــب و مەهـــ جــەبین
سپی و سەوز و زەرد و شین بە چــاوی پــڕ خومــارەوە

وەکــوو دیــاری ئەیمەنـــە دیــارە نــووری ســـەرمەدی
بـــە ئیتیفـــاقی ئـــەهلی دڵ لـــە دار و بـــەرد مەعبـــەدی
دوو نەهرە پاک و پڕ گوهەر لە بەحری خولقی ئەحمــەدی
عەجەب جوانــە هەڵــکرا، بــە نــووری ســونعی ئیــزەدی
گوڵــی هــەنار وەک چــرا بــە ســەر چڵــی هــەنارەوە

چناری باغی بــەر ســەرا، بــە بــا کــە هــاتوچوون ئــەکا
تەســبێحی زاتی ئەقدەســی خــودای جوملــە بــوون ئــەکا
هـــەوای زەرڕە پـــەروەری، هـــەوای دڵ زەبـــوون ئـــەکا
مەگەر شــیرینی ئەرمەنــە، دیــدەن لــە بێســتوون ئــەکا
خـــەرام و نـــازی شـــۆڕەبی لـــە لێـــوی جۆیبـــارەوە

چ دڵڕوبایـــە تەلعـــەتی کـــە پـــەردە لائـــەدا لـــە روو
کـــەمانی ئـــەبروان ئـــەدەن لـــەســـینە تـــیر دوو بـــە دوو
حوســـنی بـــەهاری چـــون ئـــەدا بـــە نەوبـــەهار ئابـــڕوو
ســـەبا ئـــەدا لەشـــاخی گـــوڵ، شـــکۆفە دێتـــە هـــاتوچوو
رەققاســـی بـــەزمی بادەیـــە بـــە جـــامی زەڕنیگـــارەوە

چ ئیزدیحامـــە لـــەو دەرە، چ زەمزەمـــە، چ تەنتەنـــە
جۆشـــی بنۆشـــی بادەیـــە، هـــاوار دەف و دەفزەنـــە
جـــەژنی ویسالـــی دۆســـتان بـــە کـــوێری چـــاوی دوژمنـــە
مـــەتاعی عیشـــوە باریـــە، عـــازمی شـــاری گوڵشـــەنە
قـــەتاری لالـــە هاتـــەوە لەدەشـــت و کۆهســـارەوە

فیــدای رووتم ئــەی چـــرا لـــە ئێمـــە روو مەشــێرەوە
پابەنـــدی گێســـوانی عەنبـــەرینتم، لـــە دێـــرەوە
چ خۆشــە دێ سەبا،ســەحەر بــە عــەتری دڵــپەزێرەوە
عــەتاری یەســرەبی مەگــەر عوبــووری کــرد لێــرەوە
کە بێنی موشک دێ لــە هــەر دیــار و هــەر کــەنارەوە

شــوکری خــودا کــە لێــرەدا گــەییم بــە ئــارەزووی دڵ
کـــراوە دەرکـــی مـــەخزەنی عەتییـــە و شـــکا قـــوفڵ
بە بەرقی شەوقی روومەتی، دەروونی ســینە هاتــە کــوڵ
بــازاڕی نــازی غونچەیــە و عــەتر فرۆشــەکانی گــوڵ
لە هەر کــەنار و باغــەوە لــە هــەردی هــەر دیــارەوە

ئەمیری جینن و ئینس وەک خــاوەنی بــەیت موقەددەســە
پەروانــەکان کــۆوە بــن لــە دەوری شــەمعی مەجلیســە
دڵــێ غــولامی گــوڵ نــەبێ گەدایــە، رووتــە، موفلیســە
فیــدای خــاکی گوڵشــەنم کــە خەیمــەگاهی نەرگســە
جێگــەی نــزوولی رەحمەتــە لــەچــاوی هۆشــیارەوە

سەیری جەمالــی دڵــبەر و ئەنــدامی رێــک و خەندەکــەی
مەغبوونی «زاری»،گەر بدەی بە موڵکی ئەسفەهان و رەی
بە گیانی پیری مەیکەدە بــە زەوقــی بــادە، ســۆزی نــەی
هەوای یارە باعیســم بــۆ نــەزمی شــێعر و بــەزمی مــەی
وەگەرنـــە مـــن چ کارمـــە بـــە باســـی گیـــا و دارەوە

## ١٢

نازانـــێ کـــە مـــەجنوونی چ لاوێکـــە دڵـــی مـــن
گـــیراو و گرفتـــاری چ داوێکـــە دڵـــی مـــن
بێهـــۆش و بریـنـــداری چ چاوێکـــە دڵـــی مـــن
عاشـــق بـــە وەنەوشـــەی چ شـــەتاوێکە دڵـــی مـــن
یـا بولبـولی کـام سـەروی سـەرئاوێکە دڵـی مـن

بـــێ تەلعـــەتی ئـــەو دڵـــبەرە دڵ پـــڕ لـــە برینـــە
بـەو شـەوقی قـەد و روومەتـە وەک کـوورە بـە تینـە
کـــاری شـــەو و ڕۆژی هـــەموو هـــەر ناڵـــە و شـــینە
بـــێ تاقـــەت و بـــێ ســـەبر و پەرێشـــان و حەزینـــە
بڕوانـــە کـــە غـــەرقی چ زووخاوێکـــە دڵـــی مـــن

ئـــەو شـــۆخە کـــە لاکاتـــەوە بـــەم شـــێوە دڵ ئـــارا
نـــابینی، مەگـــەر بێخـــود و دێوانـــە لـــە شـــارا
نەمـــدیوە وەکـــوو پەرچـــەمی چـــابوک لـــە شـــکارا
نەیهێشـــتووە بـــێ زەخـــم نـــەچیرێ لـــە دیـــارا
ئـــەی وای کـــە گـــیری چ قولاوێکـــە دڵـــی مـــن

پـــی بێـــژە لـــە تـــۆی زوڵـــفەوە بڕوانـــە بەرووپشـــت
هـــەر تـــار مـــژە ســـەد عاشـــقی بی ســـەبر و دڵـــی کوشـــت
بۆ ماچێ لە لەعلی لـــەبی ســـەد ڕۆحـــە لـــە ســـەر مشـــت
پەنجەی کە بە خـــوێنی دڵـــەکەی لـــەت لـــەتی مـــن رشـــت
قەومینـــە عەجـــەب خانـــە خراوێکـــە دڵـــی مـــن

بـــێ پڕتـــەوی رووت ئـــەم دڵـــە پـــڕ ئـــێش و پـــەژارە
بێـــزارە لـــە گـــوڵ عـــاجزە لـــەم بـــاغ و بـــەهارە
مایـــل نـــە بـــە ســـەروە نـــە بـــە ســـێوە نـــە هـــەنارە
بـــێ قەنـــدی لـــەبت چـــا بـــە مـــەزاقی وەکـــوو ژارە
پـــەروەردە بـــە عـــەتری چ گوڵاوێکـــە دڵـــی مـــن

شـــوێنی گومـــە بەینێکـــە دڵـــەی پـــڕ خەتـــەری شـــووم
هەر جێگە کـە رێم کـەوتووە، هـەر لایـێ ئەگـەر چـووم
جیـددەن لـە هـەموو رێگـەوە جۆیـایی خەبـەر بـووم
هەرچەنـــدە ئەپرســـم خەبـــەرێکی نییـــە مـــەعلووم
مەعلوومـــە لـــە تـــۆی زوڵـــفە شـــێواوێکە دڵـــی مـــن

لـــەو ڕۆژەوە دڵ هەڵـــقەی ئـــەو زوڵـــفیە جێیـــە
مـــەیلی نـــە بـــە ســـارا نـــە بـــە شـــار و نـــە بـــە دێیـــە
وا بێخـــودە ئاگـــای، نـــە لـــە ســـەریە نـــە لـــە پێیـــە
«زاری» وەرە بیناســـەوە ئـــەم بێخـــودە کێیـــە
بـــەم پیرییـــە مەســـتی چ شـــەراوێکە دڵـــی مـــن

# ١٣

بولبـــولم ســـەیری گوڵاڵـــەی بـــاغی روخســـارت ئەکـــەم
دوو قســـەی ناســـک لـــەگـــەڵ لێـــوی شـــەکەربارت ئەکـــەم
بـــۆ تەماشـــا هـــاتووم خـــۆ مـــەحوی دیـــدارت ئەکـــەم
چـــاوی دڵ رۆشـــن بـــە شـــێوە و حوســـنی رەفتـــارت ئەکـــەم
سینە ئەسپەر بۆ موژەی بێ رەحم و خونخوارت ئەکەم

خـــاترم لـــەو رۆژەوە دەســـتی لـــە زولفـــت بـــەر بـــووە
دەوڵـــەتی عەقڵـــی لـــە دەس وەک موڵـــک هۆشـــی دەرچـــووە
ئـــاوری شـــەوقی چراکـــەی کوڵـــمی تـــۆی تێبـــەر بـــووە
وا ئـــەزانم چـــاوم ئێســـە رۆژ و شـــەو زولـــف و رووە
سەر بـە قوربـانی شـەمی گۆنـای گوڵـنارت ئەکـەم

خاڵـــت ئـــەو رۆژە کـــە خاســـەی کارەبـــایی پـــێ درا
ریشـــەیی جـــەرگم هـــەر ئـــەو رۆژە بـــە تـــیرت پێکـــرا
دڵ وەکـــوو کـــوورە لـــە شـــەوقت ئـــاورێکی تێخـــرا
یـــانی داغـــی شـــەوقی حوســـنی تەلعـــەتی تـــۆی پیـــانرا
وا دڵـم تەسـلیمی نـاز و رەمـزی گوفتـارت ئەکـەم

ئافتـــابی رووی تـــۆ دوێنـــێ ئەگـــەر گۆشـــەی نـــوان
رەونـــەقی بـــازاڕی رۆژی عالـــەم ئـــەفرووزی شـــکان
بـــۆ نـــەچیری دڵ لـــە رووی نـــازۆ بـــە زوڵـــفتدا تـــەکان
یـــانی بـــۆ تـــاڵانی فـــام و هۆشـــی مـــن هاتیتـــە بـــان
خـوێنی دڵ داوا لـە زولفـی موشـکی تاتـارت ئەکـەم

دۆزەخـــی دووریتـــە مایـــەی شـــیوەن و هـــاواری مـــن
گەرمـــە بـــازاڕی غـــەمت بـــێ ســـەیری ناڵـــەی زاری مـــن
پـــێ بنێـــرە ســـەر گلێنـــەی چـــاوی گەوهـــەر بـــاری مـــن
گـــوێ بـــدێرە لـــوتفی نـــەزم و سۆزشـــی ئەشـــعاری مـــن
تاچ تەحریرێ لە شـەوقی چـاوی مـەیخوارت ئەکـەم

دوێ ئیشـــارەی کردمـــێ قاســـید وتی حـــازر بـــە، دێـــت
چاوەکـــەم رۆحـــم ئـــەوا راخســـتوە بـــۆ فەرشـــی رێـــت
ســـەر گلێنـــەی چـــاوی دنیـــابینی موشـــتاقانە جێـــت
هـــەی نـــەگا ئـــازار ئاگـــا بـــە لـــە بـــرژانگم بـــە پێـــت
چاوی «زاری» چون مەقامی سەروی گوڵـزارت ئەکـەم

## ١٤

بۆ نـەگریم و نـەڕێژم خوێنـاو لـە هـەر دوو چـاوم
بـۆ شـوومی تاڵـەی سـیا، بـۆ بـەختی ناتـەواوم
بـــــۆ دەردی بـــــێ حەســـــاوم

چ بکـەم کـە دەسـتی کۆتـام ناگاتـە دایـەنی یـار
سـەد عـەرزی حاڵـم نووسـی نەهاتـەوە جـواوم
شـــــوێنێ نیـــــە جـــــواوم

ئـەم هـەموو ئیسـتیغنایە لـە زاتی دڵـبەرایە
ناڕوانـێ بـڕوام وایـە، لـە حـاڵاتی شـێواوم
خـــــوا چ لێقـــــــەوماوم

حاڵـی دەروون پەشـێوە کـوورەی ئـاور لـە نێـوە
یانی لە شـەوقی ئێـوە، سـەر تـا قـەدەم سـووتاوم
ســـــەراپا هەڵـــــــقرچاوم

تـاوی دڵ زۆری هـاورد پـەنام سـایەی سـەروت بـرد
تەقسیرم چی بوو؟ چیم کرد ئـاورت بـۆ تـێ بـەرداوم
بـــــۆ چـــــی ســـــینە کـــــەواوم

ئەی شاهی نازەنینان، ئـەی مـاهی مەهـ جـەبینان
ئەی شادی دڵ حـەزینان رەحمـێ بـە دڵـی سـووتاوم
لوتفـــــێ نەکـــــەی فـــــەوتاوم

ئـەی یۆسـفی کـەنعانی دەردەداری تـۆم یـانی
بـە پـەیکانت نـازانی لـە خوێنـاوا غەڵـتاوم
ریشـــــەی جگـــــەر بـــــڕوام

غولامی خاکی پاتان رووی هەروا لە دەرگاتان
زاهیر کە نیم لە لاتان دایم لەوێ وێساوم
غایب نین لە بەرچاوم

هەرشام و سەحەرگاهم یادی تۆیە هەمڕاهم
رەحمت ببێ ئەی شاهم وێڵ و خانە خراوم
شێتم سەر لێ شێواوم

بەستوویە دەستی تەقدیر هەر عوزوم بە سەد زنجیر
چییە تەدبیرم ئەی پیر گیرۆدەیی گێژاوم
کەشتیم و لە غەرقاوم

بە هەر زەڕڕە ئەندامم گرفتاری سەد زامم
ئەی کامی دڵ ناکامم بگرە دەستم داماوم
لە چای غەما خنکاوم

باری خاتر گرانە، بە زەحمەتی مەزانە
بە هیممەتی مەردانە، دەرێنە لە پا داوم
فریام کەوە نەماوم

«زاری» دڵی پڕ دەردە هەمدەمی ئاهی سەردە
هاوار ئەکا بێ پەردە بە تیری تۆ کوژراوم
تیرت لە قەلبی داوم

## ١٥

ئەی کەمەر زەڕین کـەمـەرچین جامـە دڵـبەر لـەب شـەکەر
نـــازەنینی گوڵــبەدەن ســووڕەت پـــەری تەلعـــەت قەمـــەر
مەهوەشـــی گـــەردن بلـــووری دڵـــڕفێنی ســـیم بـــەر
جـان نسـاری گـەردی کەوشـی پـات ئەکـەم ڕۆژێ ئەگـەر
پەردە لەو روخسارە لادەیـت و بـە عیشـوە بیتـە دەر

جەژنـــە ڕۆژی عـــەیش و بـــەزمی عەشـــرەت و ئازادییـــە
چـاوی مەسـتت بـۆ لـە گـەڵ مـن مـایلی بێدادییـە
هـەر کەسـێ ئەمـڕۆ لـە گـەڵ یـارێ خـەریکی شـادییە
چـون ئـەتۆ شـیرینی ئـەمنیش ئـارەزووم فەرهادییـە
گەر وەکوو پـیرۆزە جـارێ سـێبەرم فـڕ دەیتـە سـەر

ئـادەمیزادی پـەری یـا حـۆر یـا مانگـە شـەوی؟
دڵ بـە ئومێـدی دیـداری تـۆ بـە شـەوقێکی قـەوی
هاتـە حەقڵـەی بەزمـەوە بـۆ دەرسـی عیشـقی خوسـرەوی
عەسـکەری برژانگـی تـۆ بـوو وەک وەزیفـەی پەهلـەوی
دایـە بـەر شەسـتیری نـاز و تیربـارانی نـەزەر

عاشـقت وا گیـان ئـەدا بـۆمـاچی خاڵـی بـەردەمت
کەشـتی ئـارامی شـکا وا کەوتـە نێـو بـەحری غـەمت
پەڕتـەوی رووتی کـە دی دڵ بـوو بـە پەروانـەی شـەمـت
بولبـولێکی نابەڵـەد بـوو کەوتـە حەڵـقەی پەرچـەمت
تـا قیامـەت موشکوڵـە ڕێگـەی نـەجاتی بێتـە بـەر

مـن بـە سـۆزی نـاری عیشـق و ئەشـکی وێنـەی سـەیلەوە
تـۆ بـە زەردەی پێکـەنین و خـاتری بـێ مەیلـەوە
بـەم جگـەر برژاوییـە و سـینەی لـە سـەودا کەیلـەوە
روو لـە سـارا میسـلی مـەجنوونم بـە تاسـەی لەیلـەوە
عاشـقی تـۆعاقیبـەت سـەحرا ئـەبێ بگرێتـە بـەر

دێتە سەر جۆگـە بـە شـەوق و شەعشـەعەی رووخسـارەوە
مـانگی تابـانی ئەڵـێم یـا ڕۆژی دێتـە خـوارەوە
سـا لـە رووی نـازۆ بـە خەنـدەی لێـوی شـەککەربارەوە
بێـژە هـا ماچـێ بـە کـوێری حاسـد و ئـەغیارەوە
بـا نـەمامی ئـارەزووی سـالاری «زاری» بێتـە بـەر

## ١٦

دڵان ئــەبا بــە تــاڵان چــاوانی پــڕ خومــاری
شکست ئەدا بــە سۆســەن بــە حوسـنی بـێ شـوماری
خــەرمانی موشـکی نــا ژێــر گۆشــەی کــڵاوی لاری
دوگمــەی یەخــەی تــرازا دەرکــەوت دوو هــەناری
فــەریاد و ناڵــە کەوتــە نێــو عاشــقانی زاری

نقــابی دا لــە پەرچــەم بــە تەلعــەتی قەمــەردا
بــە قامــەتی شکســتی بــە ســەرو و نەیشــەکەر دا
گەشــاوە نــاری شــەوقی لــە قــەلبی پــڕ شــەرەردا
لــە تــۆی شــەوی سـیاوە شــەفەق بــەیانی بــەردا
تلــووعی کــرد خورشـید لــە هــەوری موشـک بــاری

شــەمی گۆنــای دەرخســت لــە بــەزمی دڵــبەریدا
ســەوادی موشـکی چــینی بــە زولفــی عەنبــەری دا
بــە تــاقی ئــەبروانی لــە وەسمــە زیــوەری دا
کەوتــە تــەواف عــەقرەب بــە دەوری موشــتەری دا
بــە هــار هــات و سەرســام، ســەفای لالــەزاری

زولفــی بــڵاو و خــاوی داوی بەڵایــە بــۆ دڵ
لــەم داوە خــاوە رێگــەی نەجاتمانــە موشــکوڵ
لــە بــورجی دڵــبەریدا گرتوویــە یــار مــەنزڵ
غونچــە کــە هاتــە خەنــدە شـکانی قیمــەتی گــوڵ
ئــاوی حــەیات ئــەڕژێ لــە لــەعلی ئابــداری

بەڵــێ کــە رۆژ هەڵــبێت ئــەبێ ســوها نــەمێنێ
یۆسـف کـە بێتـە بـازاڕ عـەزیز ئـەو ئەسـێنێ
لــە گــەڵ شیشــەی گــوڵاوا گــوڵاو نانوێنــێ
بـە نـاز و عیشـوە چـاوان سۆسـەن ئەگـەر هەڵـێنێ
ئـەبێ وەنەوشـە داخـا سـەری بـە شەرمەسـاری

غونچــە گوڵــی لــە نێــوان پەڕەنـد و پــەڕنیانا
جــوان و دڵڕوبــا وەک پــەروین لــە ئاسمانــا
بــە رەسمــی نازەنینــان لــە ســەحنی گوڵســتانا
خــەرامی دا بــە ســەروی لــە بــەزمی عاشــقانا
فــەدای ســەروی قــەددی ســەد ســەروی جۆیبــاری

بــرینی دڵ بەســۆیە زەخمــاری تــیری تۆیــە
مــەجنوونی وێــڵ و ناکــام فــەرهادی رەنجەڕۆیــە
سـەیلی خوێنـاو و زووخـاو جـاری میسـالی جۆیـە
لــە بــورجی عەقرەبایــە هــیلالی موشـک بۆیــە
مەشــهووری عامــە ئەمــڕۆ دڵــم بــە بێقــەراری

بــەری هــەنارە، ســێوە نــەمامی قامــەتی یــار
نارنجــە، پڕتەقاڵــە وەلــێ لــە ســیمی عــەییار
دوو کوڵــمی دوو گوڵاڵــەی رەونــەق فــەزای گوڵــزار
ئــەزانی چۆنــە وەختــێ عــەرەق ئەخاتــە روخســار
شـەونم کـە دێتـە سـەر بـەرگ گـوڵانی نەوبـەهاری

بە نـووکی نـاز وغـەمزە ریشـەی حـەیاتی هەڵـکەند
هۆشـی لـە هۆشـیاران بـە نـازی نەرگسـی سـەند
بەهای موڵـکی چینـە لـە لێـوی یـەک شـەکەرخەند
لــە جەننــەتی نــەعیما تــەڵا بــە لەعلــە پەیوەنــد
بڕوانــە بــۆ چــەپ و راس دوو بــەدری گۆشــواری

گرپـــەی گــڕی دەروون و هـــاژەی فرمێســکی خـــوێنین
بەشـــی مـــنی هـــەژارە لـــە گـــەڵ فوغـــان و ناڵـــین
لەبەرچی زیزە لێمـان لەسـەرچی هاتـە سـەر قـین؟
ئێمەی کـە دێتـە بـەرچاو ئەخاتـە تەلعـەتی، چـین
حەســـاری دەوری چینـــــە، ســـــپاهی زەنگبـــاری

ئـــارامی گیـــان و شـــادی دڵـــەی بەســـۆز و کوڵـــمی
مایـــەی حـــەیات و قـــووتی ڕەوان و هێـــزی دڵـــمی
بڕوانـە لـێم هـەتا کـەی مایـل بـە جـەور و زوڵـمی
وەختـــێ کـــە زولفـــی لادا لـــە ســـەر چـــرای کوڵـــمی
پەروانە کەوتـە پـەرواز بـۆ ڕەقـس و جـان نسـاری

ئـــەم حوســـنە دڵـــفریبە کـــەوا لـــە رووی یـــارا
بـــە نـــاز ئەگـــەر گـــوزەر کـــا دەمـــێ بـــە لالـــەزارا
گوڵ سـەر ئەخاتـە بـەرپای لەگـەڵ سـەد ئیفتیخـارا
سـەد کارەبـا بـە قوربـان ئـەو گەردنـە دڵ ئـارا
ئەو پووش ئەبات و خاشاک، ئەم فکر و هۆشی «زاری»

## ١٧

**بەهاری پڕ سەوزە و سەفا بۆ ئەهلی سۆز و وەفا، جا دڵی بۆ خاڵی کە و چاو لە دەرکەی شەماڵی کە بزانە لە گەڵ تینی هەتاو چلۆن بەفر ئەکا بە ئاو**

تەڵەب ئەکات دڵ خودا لە ئاستانی ئەکبەری
بەهاری وەسڵی پێ بدەی زستانی هیجر لابەری
دوێ بڵاوی کردەوە خەبەر نیگاری داوەری
شوکر بەهار هاتەوە بەسەد هەزار دڵبەری
نەسیمی سوبحدەم ئەدا نەویدی غونچە پەروەری

بۆ لالەزار بولبولی هەژار تاقەتی چووە
لە سینە ئاوری شەوقی جەماڵی یار، بەر بووە
لە شاری گوڵستانەوە پەیامی غونچە هاتووە
لە گوڵبونان موژدە بێ زسان مرد و بەم زووە
لە گوڵستان رائەخا سەبا بەساتی عەبقەری

ئەسیرەکانی بەهمەنی ئەوا لەحەبس بەرئەدەن
جەفای بەفر و جەوری یەخ لە باغەکان دەر ئەکەن
بەکوێری هەر دوو چاوی شکۆفە زولف دەرئەخەن
بە هاتنی زەمانی گوڵ عەجەب جوانە بەر ئەکەن
چەمەن عەبای ئەخزەر و لالە کراسی ئەحمەری

لە بولبولان بانگ ئەکەن گوڵاڵەکان هەی وەرن
لە نیعمەتی دیداری ئەم گوڵانە لەززەتێ بەرن
چەمەن بەهەشتە، جۆگەکانی جۆی شەهد و شەککەرن
شەتاوەکانی ئەم کەژە چ دڵگوشا و دڵبەرن
شیرین و سەرد و پڕ سەفا میسالی ئاوی کەوسەری

لە گوڵشەنایە سوحبەتی گوڵاڵەکانی موشکبۆ
بە غەیری گوڵشەن ئەی دڵا بە هیچ مەنزەرێ مەچۆ
فریبی غەیری نەرگسی تەبیبەکانی دڵ مەخۆ
چ دڵگوشایە دایەنی کەژ و کەناری باغ و جۆ
حەیات بەخشی خاترە شەمیمی عەتری عەبهەری

چ مەجمەعێکە ئەهلی دڵ کە دێن لە هەر مەکانەوە
لە کوێستانەکانەوە لە دەشتی گەرمیانەوە
بە گەنجی ئارەزوو ئەگەن لە لوتفی موستەعانەوە
میسالی سەلسەبیلە دێ لە کێوە بەرزەکانەوە
ئەم نەهرە ساف و جارییە «دوو روود»ئەبێتە مەعبەری

سوبحان ئەو خودایە وا بە غونچە ڕەنگ و بۆ ئەدا
بە دڵ خەیاڵی ناسک و زبانی گوفتوگۆ ئەدا
بە بولبولان ناڵە و دەروونی میهرجۆ ئەدا
کافوورە دێتە سەر زەوی ئەم بەفرە قەترە قەترە وا
ئەبێتە ئاوی ڕۆشن و شەفاف و ساف و گەوهەری

سەفەر کە بۆ خودا بە دڵ بڕۆ لە کیشوەری تەنا
بگە بە ئارەزوو وەکوو مووسا لە شیوی ئەیمەنا
ببینە حوسنی سەنعەتی لە نەرگسا لە سۆسەنا
چ شادی بەخش نازران لە سەحنی پاکی گوڵشەنا
غونچە بەناز و عیشوەوە سەمەن بە زیب و زیوەری

ئوستادی عیشق لێرەدا بەهرە بە ئەهلی دڵ ئەدا
لە مەکتەبی نزاکەتا تەرتیبی غونچە گوڵ ئەدا
بە سۆزی دڵ کەسێ کە بێت جەرگی خۆ لە چڵ ئەدا
لە گوڵستانەدا سەبا کە جامی بادە خول ئەدا
شکۆفەکان فڕ ئەدەن لە سەر، کڵاوی ئەخزەری

ئەم بێدڵانە تۆ بڵێ لە ئێمە تەعنە بۆ ئەدەن
ئێمە لە جام و ساقی و لە بادە مەنع بۆ ئەکەن
مەگەر نەیانبیستووە وتوویە شەمعی ئەنجومەن
بە ناز و دڵبەری سەمەن کە دێتە دایەنی چەمەن
ئارامی بولبولان ئەبا بە گێسوانی عەنبەری

سەیری جەماڵی لالە کە لە هیممەتی بەهارەوە
سەدرنشینی گوڵشەنە بە رووی ئابدارەوە
وەرە لە جام و ساقی و لە بادە خۆ مەشارەوە
لە نەرگست خەبەر هەیە بە چاوی پڕ خومارەوە
لەگەڵ وەنەوشە دەستەمل لەسەر بەساتی مەخمەری

حەشرە، هەرایە، شۆڕشە، بەزمی دیداری یارە یا
یۆسفی میسرییانە، خۆ نیشانی مشتەری ئەدا؟
چ مەحشەرێکە پڕ سەدا چ مەنزەرێکە پڕ سەفا
شازادەکانی شاخی گوڵ بە شێوەیەکی دڵگوشا
قەبای سەندوسی بە بەر، بە فەرقی تاجی سەنجەری

دروست بگرە گوێ قسەی حەکیمەکانی راستگۆ
ئەم بەحرە قووڵە گیانی من بێ کەشتیبان تیمەچۆ
بەم رێگە پێچپێچەدا بە بێدەلیل قەت مەڕۆ
لە نازی سۆسەنی کەناری جۆگە تێبفکرە تۆ
دەروون روون ئەکاتەوە بە رووی شەمعی خاوەری

میسالی بەرق رۆیی ئەم زەمانی عومری ئێمە زوو
دریغ! فیکری تۆشە و حەساوی ئاخرم نەبوو
مەگەر بچینە دایرەی تەبیبەکانی ماهڕوو
نەمامەکانی گوڵشەنی بە با کە دێنە هاتوچوو
بە لەنجە هۆش و فیکر ئەبەن وەکوو بوتانی خوللەری

ئاگادار بە برا! نەفس لە رێت لانەدا
دێوی هەوات پەنجەیی عەقڵ و شعوور بانەدا
نەزانی بێ برۆ بە شۆن ماهیری بزانە دا
بە ئەمری کردگار ئەکەن لە لالەزارەکانەدا
هەوا گوڵاوپاشی و نەسیم عەتر پەروەری

لە کیمیاگەری ئەی برا! بە فکری نوکتەزاتەوە
بپرسە شەرحی رێگە و برۆ لە رێی نەجاتەوە
بێدەرسی تەربیەت کەسێ چ سەرفەیێ ئەباتەوە
دەمی سەحەرگەهی بە با کە غونچە دەم ئەکاتەوە
کەناری باغ پڕ ئەبێ لە دڵبەرانی ئازەری

ڕکووع ئەبا وەنەوشە ڕوو بە قیبلە پارسا سفەت
لە سوجدەدایە دایما سەری بە شوکری مەوهیبەت
بە غونچەکان یاد ئەدا سەبا خەساڵی مەحمیدەت
زبانی حاڵی لالە شەرح ئەدا تەریقی مەعریفەت
بۆساحیبانی دڵ وەکوو مەقالەکانی حەیدەری

محاڵە زەڕڕەیێ شەڕەف وەدەس کەوێ لە دوو سەرا
مەگەر لە سوحبەتی شەم و جەواری کیمیاگەرا
موراد وا لە قوربەتی خورشیدی زەڕڕەپەروەرا
پەڕەندەی دەشتی گوڵستان لە سێبەری سنەوبەرا
تێکەڵ بە یەکتری ئەبن نقووشی خۆر و سێبەری

لە ئێمە بێژی یاد کەن ئەوانە ئەهلی ئەو سەرەن
ئەوانە دێر بۆ گوڵاڵەکانی بۆبەرەن
بڵێ بەوانە ساکنی قسووری بەرزی ئەو دەرەن
شیرینی موڵکی ئەرمەنە بەرەنگ و شێوە نەستەرەن
یۆسفی میسری گوڵشەنە سەرو بە حوسنی پەیکەری

چ حیرەت ئاوەرە خودا غنج و دەلالی شۆڕەبی
لە شاری حوسنەدا کەسم بە زیب و نازی وانەدی
لە «صنع»ی موعجزە برا نەزەر کە تا بەڵەد ببی
لە بەزمی نەوبەهارەدا گوڵبون بە ئەمری ئێزەدی
زومورڕەدینە مەسنەدی شکۆفە تاجە بۆ سەری

وەنەوشە هات بولبولا برۆ بە پێشوازەوە
ڕکابەکانی ماچ کە، بە قەلبی پڕ نیازەوە
بڵێ بە شاهی غەزنەوی لە لایەنی ئەیازەوە
لە بورجی ئاب نیلووفەڕ بە سەد خەرام و نازەوە
تلووعی کرد هەر وەکوو تلووع ئەکات موشتەری

سەحەر کە دێتە بەزمەوە سەمەن بەزوڵفی موشکسا
بە ناز تاری گێسوان بە بادی سوبحدەم ئەدا
بە باوەشێنی دڵبەری ڕوخسار باوەشێن ئەکا
هەوا دەماغ پڕ ئەکا لە بۆی نافەیی خەتا
هەزار تەعن ئەدا چەمەن لە موشکی ئەزفەری

ئەی مورغی عەرش ئاشیان چ وەختی غەفڵەت و خەوە
لە عیزز و فەزڵی فەسڵی ئەم گوڵانە بێخەوەر مەوە
گوێ بگرە تایرانی قودس بانگ ئەکەن لە غەیبەوە
کە «مقصورات فی‌الخیام» دێنەدەر لە خەیمەوە
لەگەڵ بەهەشت لێ‌ئەدا بەهار لافی هەمسەری

گرینی هەور و خەندەی زەمین و نەشئەی هەوا
بە زەمزەمەی نەخۆشەکانی دەردی هیجر ئەدا شەفا
دەمی مەسێحە بێدرۆ ئەحیای مردوان ئەکا
بە سەبزەزارەدا سەبا ئەگەر عبوور ئەکا گیا
زیکری قیام ئەکەن هەموو وەکوو مریدی قادری

دڵا دەخیلتم وەرە جەواری فیکر پیشەیێ
لە ساقیانی بەزمی شاە بگرە بادە، شیشەیێ
عومر گوزەشت، بێنە دەس لە مەعریفەت مەعیشەیێ
لە لوتفی سەنعەتی خودا نەزەر کە تۆ لە ریشەیێ
درووس ئەکات گوڵ لە گەڵ هەزار نیشی نەشتەری

ناسینی کونهی زاتی حەق نییە لە تاقەتی کەسا
غەیری نیشاتی قودرەتی نییە شتێ لە دەسرەسا
«لَوکان» بەردی سەخت ئەدا بە زاری قسەهەڵبەسا
بێکارگاە و ئالەت و پەرگار و زەحمەتی وەسا
نەقاشی قودرەتی ئەکا لە سەر گەزیزە زەرگەری

ئەم مانگ و رۆژە دێ و ئەچن لەم چەرخە پڕ ستارەدا
نەهار دێ بە دووی شەوا و شەو بەدووی نەهارەدا
ئەم ئیختیلافی شێوە و زبانە وا لەکارەدا
ئەم سەوز بوونەوەی گیا لە فەسڵی نەوبەهارەدا
نموونەیەکی وازحە لە سەر قیامی مەحشەری

بۆعەدوی زندگانی ئەم زەمینە رووتە بێنەوا
بە خزر هەور قودرەتی ئاوی حەیاتی پێ‌ئەدا
ئەم قسە دڵپەسەندە تۆلە من ببیسە ئەی برا
رەعد نەزیری نەفخەی قیامی خەلقە، سەوزە وا
لە ژێری خاک دێنە دەر بە ئەمری پاکی داوەری

ئەم نیعمەتانە کێ،برا بزانە داویە بە تۆ
بە چاو نووری بینش و زبان زەوق و گوفتوگۆ
بە گوێتی داوە بیستن و بە لووتی داوە چێشی بۆ
ئەم ئینتیزامە رێکە لەم زەمین و ئاسمانە بۆ
وجووبی زاتی ئیزەدی بەشەر ئەکات رەهبەری

لە دەرکی وەسفی زاتی ئەو شمووسی فیکر «منکسف»
ئەهلی زەمین و ئاسمان بە مەجد و حەمدی «معترف»
هەوری برێژێ ئازەری لە بەحری جوودی «مُغترف»
بە کیبریا و عیززەت و بەقا و فەزل «متّصف»
لە باب و داک و رۆڵە و شەریک و میسل و ژن بەری

جسمی سەحیح پاڵی دا بە لای دەرد و ئێشەوە
قەلبی سەلیم عاجزە بە دەستی زووخ و رێشەوە
سوپای پیری هاتەوە بە سەد هەزار نێشەوە
بەهاری عومر «زاریا» خەزانی هاتە پێشەوە
وەرە بەهاری «تەوبە» گەر سەعید و پاک گەوهەری

# ١

## وتووێژی پەروانە و قەقنووس و سەمەندەر

پەروانە و قەقنووس لەگەڵ سەمەندەر      هەر یەک عیشقی خۆی هاوردە نەزەر

پەروانە وتی من لە پێش ترم      پەڕ و باڵ سووتاو خاتر رێش ترم

لە عاشقیدا مەردی مەیدانم      هیچ کەس ناتوانێ شان با لەم شانم

سەدای هەڵێنا وتی سەمەندەر      لەم مەیدانەدا من گۆم بردە دەر

وا بە ئاوی عیشق سەر تا پا تەڕم      لە ئاور دام و ناسووتێ پەڕم

قەقنووس ژنەوتی ئەم ئیددعایە      وتی ئەمانە ئەیڵێن بێ جایە

ئەگەر دەعواتان راسە نە بەتاڵ      بۆچی وێنەی من نابن بە زووخاڵ

دڵبەر کە جەماڵ وەک رۆژ بنوێنێ      چۆن ئەبێ عاشق خۆی نەسووتێنێ؟

ئافەرین قەقنووس بۆ جوابی خۆشت      بۆ کزەی دەروون پڕ سۆز و جۆشت

عاشق تا نەگری و نەگڕێ وێنەی شەم      نەوێ وە ئاور لە سەر تا قەدەم

نەسووتێ و نەوێ وە خۆڵەکەوە      رۆژی ئومێدی هێشتا هەر شەوە

نەوێ وە چرا بۆ بەزمی یاران      نەوێ وە مەتای موغازەی شاران

نەپشکوێ وێنەی غونچەی بەهاران      نەوێ وە دەوا بۆ دەردەداران

تەواوی ئازای نەوێ وە هەتاو      لە شاری عیشقا غەریب و بێ ناو

برا با ئێمەش عاشقێ وا بین      بۆ تاریکی شەو یاران چرا بین

بۆ یارێ نەگرین خاوەن وەفا وێ؟      بێ تەغییر باقی و دوور لە فەنا وێ

بۆ وەختی سەختی و تەنگی پەنا وێ      بۆ زام ناسۆری دڵمان دەوا وێ

بۆ بەو نەقاشە دڵ نەدەین تەواو      کە ئەم نەقشانەی ئەگرینە بەر چاو

با شیشەی هەوا پەراش پەراش کەین      روو لە ئاوێنەی زاتی نەقاش کەین

مەدە ئەی «زاری» دڵ بە زولف و خاڵ      بە موژە و ئەبرۆ چاو و لێوی ئاڵ

## ٢

برای بەڕێزم ئازیزم گیانم — بێ سەیری قرچەی دڵەی پڕ ژانم

سپای غەم شادی وا کردم تاراج — ئەبرژێم وێنەی برێشکەی سەر ساج

بۆ «شەریعەتی» شیوەنی «زاری» — بخوێنەرەوە بکە هاوکاری

با بەرزۆ ببێ سەدای ڕۆڕۆمان — نە تەنها بۆ ئەو زیاتر بۆ خۆمان

کاتێکت زانی کەوتین لە جووڵە — خستینیانە ناو ئەو چاڵە قووڵە

کتێو بێ خاوەن بە جێ بمێنێ — ئەولادێ نەوێ تیایا بخوێنێ

ئەڵبەت باڵاتر لە گشت ئەسەفێ — ئەوەیە نەیوێ مەلا خەلەفێ

دارای سەوادێ وا بێ بزانی — سەرفی کەلامی شەرعی قورئانی

کتێوەکانمان داخۆ کێ بیوا — وەرەقی بخا بەم دیو بەو دیوا

دونیا بەم جۆرە بێ فەقێ و مەلا — هاکا عیلم و دین بە جارێ فەوتا

لە وەختێ فەوتی وە بێقەراری — بروانە چلۆن ئەپرسێ «زاری»

وتم ئەم کۆچەت کەی بوو لە کەیدا — ریشەی جەرگت دام وە نێشی وەیدا

وتی نۆی تیربوو دووی «رجب‌الخیر» — ڕۆحم لە قەفەس دەرچوو وێنەی تەیر

بۆ خواحافیزی نەکرد لە خوێشان؟ — بۆ کوێ چوو بۆ چی ڕۆیی لە ناومان؟

بۆ خواحافیزی نەکرد لەگشت یارانی؟ — لای نەکردەوە لە نازدارانی؟

ئەم کۆچە چی بوو بە پەلە کردی؟ — چ مەعموورێ بوو بێ مۆڵەت بردی

بۆ خۆی شاردەوە وێنەی ڕۆژ لێمان؟ — ئای کتێوەکان بێ خاوەن جێمان

ئەگەر لامپی هۆش نەبووبێ باتڵ — ئەبیسێ لیان سەریح بە گوێی دڵ

ئەم وتوویژە ئەکەن لەگەڵ خۆ — بێ خاوەن کەوتین ئەی خاوەنمان ڕۆ

دەک فەلەک چرات نەمێنێ نووری — وا ئەخەیتە بەین ئازیزان دووری

مانگت ژێر باڵی هەوری ڕەش کەوێ — ئەسێرەی ڕۆژت چاوی گەش نەوێ

گەلاوێژت لێژ فەنا ڕێگەی وێ — سورەییات گێژگەی دەریا جێگەی وێ

شێرت وە مەودای شمشێر بجنرێ — ڕەگەزی خۆشت لە بێخ هەڵکەنرێ

گات، بەرخت بکا بە نووکی شاخۆ — قرژانگت بمرێ بە دەرد و داخۆ

ماسیت ئاوارەی سارای بێ ئاو بێ — کەفەی تەرازووت بشکێ لە ناو چێ

دووپشکت نێشی بە ئێش و کوڵ وێ — کارژەڵەت خۆراک دڕندەی چۆڵ وێ

جەوزات تاڵاوی مەرگی پێ بدەن — هەر چیت وا تێدا لە جووڵەی بخەن

ئاهی مەزڵوومان داوێنت بگرێ — زیاتر لە ئێمە جەزرەوەت بدرێ

تۆفانی فەنا تێک بدا بێخت ‌ ‌ ‌ تەنابت پارە هەڵکەنێ مێخت
نەزمت وەک بەزمی ئێمە بشێوێ ‌ ‌ ‌ بۆ کۆستت خستین ئەی کۆست کەوێ
بشکێ کۆڵەکەی خەیوەتی شینت ‌ ‌ ‌ عالەم رەها بێ لە جەور و کینت
بۆ بەزمی ئێمەت کرد بە شیوەنگا ‌ ‌ ‌ بۆ دەرگای شادیت لێمان پێوەدا
نەبوو نەمامێ کە سەردەرێنێ ‌ ‌ ‌ رەشەبای جەورت تێکی نەشکێنێ
گوڵێ نەپشکووت لە وەنەوشەزار ‌ ‌ ‌ نەکەی وە چاویا هەزارها خار
نەمبیستوە تاجت بە کەسێ داوێ ‌ ‌ ‌ مەغزت لە کەللەی دەرنەهێناوێ
هەر سەرداریکت گەیاندە ئەفلاک ‌ ‌ ‌ سواری دارت کرد خنیتە تۆی خاک
ئەو حەکیمانە وا بە یاری هۆش ‌ ‌ ‌ مایەی شەفا بوون بۆ سەدها نەخۆش
بێ وەفایی تۆ هۆشی لێسەندن ‌ ‌ ‌ بەرقی بەد عەهدیت ریشەی هەڵکەندن
ژیانێ کەوا جێگەی زەواڵ وێ ‌ ‌ ‌ ئەبێ بۆ سەرمان پێیەوە قاڵ وێ
ئایینەی یەقین بگرینە بەر چاو ‌ ‌ ‌ تەپ و تۆزی شک لاببەین لە ناو
رێگەی بەندەگی بەرنەدەین خاسە ‌ ‌ ‌ پیابڕۆین هەتا ئاخر هەناسە
«کل الینا راجعون» بەر چاو ‌ ‌ ‌ بگرین و غافڵ نەبین وێنەی پیاو
مەرگی هاوسەران ئیعلانی کۆچە ‌ ‌ ‌ سیمی تەلی هۆش پڕ پێچ و لۆچە
گوێی دڵ وە لۆکەی غەفڵەت خنیاوە ‌ ‌ ‌ پای گیر وە حەڵقەی راوی دونیاوە
گشت وا ئەزانین ئەهلی کەماڵین ‌ ‌ ‌ لە حەقیقەتا زەرفێکی خاڵین
باری یاڕەبی لە خەوگای تەنگا ‌ ‌ ‌ شیشەی رجامان نەدەی وە سەنگا
چرای هیدایەت بێرانە رێمان ‌ ‌ ‌ تا وەرگرێتۆ ئەمانەت لێمان
نیمە دەستاوێز ئیللا رجایێ ‌ ‌ ‌ خودا پەنایێ خودا پەنایێ
یاران وا یەک یەک رەختیان پێچاوە ‌ ‌ ‌ رۆیین و کەسیان نەهاتە دواوە
هاکا فەڕشی بەزم ئێمە کریا تەی ‌ ‌ ‌ شکانی بەردی ئەجەل کووپەی مەی
کۆبکەینەوە تۆشەیی چاکە ‌ ‌ ‌ هیوای مانەوە نەماوە کاکە
«شەریعەتی» وا رۆیی بە جارێ ‌ ‌ ‌ رەحمەتی خودا بە سەریا بارێ
«زاری» بێ مێژووی کۆچی دارێژە ‌ ‌ ‌ «رەببەنا خەوگای» جەننەت بێ، بێژە

رەببەنا خەوگای = ١٣٥٦

## ٣

ئەی چاو! بۆ لافاو خوێناو نارێژی
زوان! تۆ بۆ زەهر فەنا ناچێژی

سینە بۆ ئاور بەرنادەی لە خۆت
جگەر بو زووخاو لە جەرگت ناڕۆت

ئەی گیان ئەتۆ بۆ بار ناکەی لە ماڵ
تەن ئەی تەن تۆ بۆ ناوی وە زووخاڵ

تەمی زستانی دووری وا جۆشا
بەهاری دیدار ئازیزی پۆشا

بێدادی فەلەک دووری خستە بەین
ئای بۆ جیایی شیوەن بۆ نەکەین

تۆفانەکەی نووح با بژیێتەوە
«وفار التنور» نۆبەی بێتەوە

هەوری رەشی غەم بگرێ هەوای دڵ
بڕێژێ تەرزەی دەردی دووری گوڵ

سەیلی ئاوی چاو وەک شەتاوی خان
با سەرە و ژێر بێ بۆ یەخە و دامان

گرمە و لرفەی هەور بانگی بێشەرمم
هەورە تریشقەی هەناسەی گەرمم

شێوەی نەفخی سوور قیامەت ئەدەن
زەلزەلە سارا و کەژ و کۆ ئەخەن

دێتە گوێی خاتر لە پێشەوای قەوم
سەدای پەیاپەی «لا عاصم الیوم»

وەنەوشەی کەللەم غەرقە لەتەمدا
نزیکە چاوی بدا وەهەمدا

بڕژێ لافاو وەسەر «مەرخوز»دا
«مەلقەرەنی» با وەسەر «سەقز»دا

دەشتی «کارێزە» بکا وە دەریا
«بەردەسوور»یش خۆی نەگرێ لە بەریا

«کوک لاشکاوی» لە «گاڕەش» بەردا
چالاو با وەسەر «باوە خەنجەر»دا

لافاو هەی نەڕۆی بەرەو دوا بێرۆ
نەکا «ئاڵکەڵوو» ببێ بە ژێرۆ

وەتەنی ئازیز پەروەرشگامە
جێگای با و باپیر قەوم و برامە

مەزرەعەی سەوزی زیندەگانیمە
باغی رۆح ئەفزای عەهد جوانیمە

مەڵێن بەسیەتی کەم بدە چەنە
نیشانەی ئیمان حوببی وەتەنە

فەرامۆش ناکا «زاری» تا ماوە
شادی و سەفا و زەوق سەیری «سەر چاوە»

# ۴

## تەمەع سەربە باد ئەدا

ڕێویەکی برسی نزیک بە مردن     هێزی نەمابوو بۆ نەچیر کردن

کەوتە ملومۆ لە ئێرە و ئەوێ     ئەگەرا بەڵکوو ڕۆزی دەسکەوێ

زۆری نەمابوو گیانی بێتە دەر     کاڵە کۆنێکی کەوتە بەر نەزەر

بە بێدەسنوێژ سوجدەی شوکری برد     پاشان بە ئەدەب ددانی بۆ برد

هەڵیگرت ڕۆیی ڕووی کردە یاڵێ     بێغەم لی بخوا دوو سێ قەپاڵێ

ئارەزووی وا بوو دانیشێ تاوێ     کاڵە کۆن وێنەی کەباب بجاوێ

ڕوانی پۆل پۆل قاز و کەڵەشێر     مریشک و جووچک، بۆقلەی مێو و نێر

بێ خاوەن لە دێ هاتوونەتە دەر     هاتوچۆیانە بێخۆف و خەتەر

سەرگەرمی چینەن هەر یەک لە لایێ     بەرز ئەکەنەوە هەریەک سەدایێ

وتی وا چاکە کە فرسەت بێنم     بۆ نەهار یەکێ قەڵەو بڕفێنم

کاڵە کۆنی وا بێلەزەت و تام     کەی سزاوارە بۆ نەهار و شام

مەسڵەحەت وایە لێرە دایشارم     لە سینگی بۆقلە ساز کەم نەهارم

بە ماتەماتە لێیان چووە پێش     بە ڕووی زەویدا کلکی ئەکرد کێش

قازەوان زانی کە مامە ڕێوی     خەریکە کەباب ساز کا بۆ شێوی

باڵی هەڵماڵی و دەسی دا دارێ     خۆی لێ خزانە پەنای دیوارێ

خۆی ئامادە کرد ڕێوی فێڵەباز     بۆ ئەوە بۆقلە بڕفێنێ بە گاز

قازەوان هەستا و دایە بەر پلار     فرسەتی نەدا و شەلی کرد بە دار

بە تلاوەتل بە سەد دەردی سەر     بۆ لای کاڵە کۆن ڕێگەی گرتە بەر

هەتا هاتەوە بە ملی وردی     کاڵە کۆنەکەی قالاوێ بردی

لە داخا سەری خۆی دا وە بەردا     وا شکا مەغزی نەما لە سەردا

## ۵

### هۆشیار بە برا، گرەو دانەنی

کەروێشک وکیسەڵ جووت و گایان کرد     کە خەرمان سوور بوو ئەمسەودایان کرد
وتیان ئەو دارە وا لەو سەر کەلە     خەوگای شوان و پەچەی مێگەلە
هەر کام لە ئێمە زوو گەیشتە لای     خەرمان هی ئەو بێ چ دان و چ کای
نۆشی گیانی بێ زۆر بە حەڵاڵی     بیداتە دەرخوارد ماڵ ومناڵی
کیسەڵ کەوتەڕێ رووی کردە سەر کێو     چنگی گیر ئەکرد لە بەرد لە چێو
تلار ئەبۆوە، ئەخزا دووبارە     ئەکەوتەوە ڕێ بۆ لای ئەو دارە
هیلاک نەدەبوو لە چنگە کرێ     تا بەر لە رەفیق رێگە ببڕێ
وتی حەرام بێ لێم شام و نەهار     پشوویێ نەدەم تا دەگەمە دار
کەروێشک وتی من پێشی ئەکەوم     هیلاکم جاری کەمێ ئەخەوم
برسی و تینووم نان وئاو ئەخۆم     جا ئەوسا بە دوای رەفێقدا ئەڕۆم
وەها مەشغووڵ بوو بە خواردن و خەو     لە بیری نەما مەسئەلەی گرەو
یادی گرەوی کە هات بە دڵدا     روانی کە کیسەڵ وا لە مەنزڵدا
ئەیوت و ئەیکرد بە سەر خۆیا خۆڵ     گرەوی دانا کەروێشکی کوڵۆڵ
تێکۆشە وێنەی کیسەڵ بۆ کارت     تا وەکوو کەروێشک غەم نەبێ بارت

## ۶

### دوو کاڵەک بە دەسێ هەڵناگیرێ

نانەوایێ بوو بە نان فرۆشی     دەوڵەمەند ببوو کەوتبووە خۆشی
وتی ئەگەر من تووێ بچێنم     خاوەن خەرمان بم گەنم نەسێنم
لەمە زیاتر دەوڵەمەن ئەوم     لە کۆڵ فەقیری تەواو ئەکەوم
ئاموور و نیر و جووتێ گای کڕی     وەکوو جوتیاران زەوی شێو بڕی
رۆژێ لە جووت بوو رۆژێ لە دووکان     بەم دوو کارەوە خەستە و سەرگەردان
کە ئەچوو بۆ جووت دووکان بێحاسڵ     ئەهات بۆ دووکان جووت ئەبوو ماتڵ
هەرچەند ئەیکێشا دەردی سەری زۆر     ئەم دوو کاریە هەر بۆ نەبوو جۆر
زۆری پێنەچوو مایەی قوتار بوو     بێماڵ و بێمولک، گەدا و هەژار بوو
بەم دوو کارەوە وا گرفتار بوو     دارایی فەوتا، تەواو نەدار بوو
تەنیا کارێکی باش بگرە بەستە     ئیتر بۆ دوو کار خۆت مەکە خەستە

## ٧

### کار بۆ خوا بکە و بە ئارەزوو بگە

زەمانی ئادەم هاتە دنیاوە
پۆل پۆل جانەوەر لە هەموو لاوە

چوونە زیارەتی بە دڵ و بە گیان
تاکوو دوعایێ خێر بکا بۆیان

پۆلێکی ئاهووی شیرین خەت و خاڵ
تووک وێنەی مەخمەر شۆخ و چاو کەژاڵ

چوونە دیدەنی بێهیچ ئینتیزار
تا لە دیداری ببن بەرخوردار

ئادەم بە ڕووی خۆش بەرەوپیریان چوو
لە یەکایەکیان مەرحەبای فەرموو

ئیلتیفاتی کرد لە گەڵ گشتیانا
دەستی لوتفی دا بە سەر پشتیانا

بەو زیارەتە خالیسە یەکسەر
بوون بە کانگا بۆ مشکی ئەزفەر

باقی ئاهوان زانیان خەبەر
لە لەوەڕگادا کۆوە بوون یەکسەر

وتیان وەک یاران با بچین بۆ لای
تا بێبەش نەبین لە بەهرەی دوعای

چوون لە بەر دنیا دیدەنیان لێ کرد
لە دوعای خێری سەفەریان نەبرد

حەقیقەت ناسان، خاوەن بیرەکان
دوور لە هەواو فیز، دەستەی ژیرەکان

لە هەر جێگایێ هەر کارێ ئەکەن
ڕەزای ئیلاهی لەودا پێش ئەخەن

## ٨

### باوەڕ

پیاوێ عەبدێکی برد بیفرۆشێ
قیمەتی بڕیا بە چەن قرۆشێ

پیان وت عەبدت هیچ عەیبی نیە؟
بۆ ئەیفرۆشی؟ عیللەتی چییە؟

وتی غەیر ئەمە کە دوو زبانە
عەیبێ کەی نییە دوور لە نوقسانە

سوبح و نیمەڕۆ، عەسر وئێوارە
پشوویێ نادا خەریکی کارە

مشتەری وتی چش دوو زبانە
ئەیسێنم بۆ کار چون بە تەکانە

سەندی پوولی دا و بردیەوە بۆ ماڵ
لە معامەلە دڵخۆش و خۆشحاڵ

لەبەر چاو ئاغا خەریکی کاربوو
گورج و بەهێز و بە پەلامار بوو

ڕۆژێ بۆ مەتبەخ ئاوی ئەکێشا
هەناسەیەکی سەردی هەڵکێشا

لای ئاغا ژنی وتی نازانی
ئاغام خەریکە کە بە پەنهانی

ژنێ بخوازێ وێنەی مانگی شەو
جیا بکاتەوە لە تۆ جێگای خەو

ئەگەر بۆم بێنی دوو تاڵ لە ریشی     نایەڵم قەتعەن، سەر بگرێ ئیشی
بە سەر موویەدا ئەفسوون ئەخوێنم     فکری ژن هێنان لە دڵی دەردێنم
خانم بەم درۆ کە کردی باوەڕ     لای دا لە دۆسی پۆشای بەرگی شەڕ
چاوەڕێ کە شووی خەو بیباتەوە     بە تێغ لە ریشی موو بکاتەوە
پاش ئەوە داوی بۆ خانم ناوە     رۆیی تەکی دا بە لای ئاغاوە
ئاغا رووی تێکرد وتی بۆ ماتی     خەریکی چی بووی بۆ درەنگ هاتی؟
وتی خەریکی کاری ماڵۆ بووم     خەبەرێکم بیست پڕ خەتەر و شووم
خانم ناردوویە تا کاردێ بکڕێ     لەم شەوانەدا سەری تۆ ببڕێ
ئەمشەو بە عەمدەن خەو بخە لەخۆت     بزانە چلۆن هەڵمەت دێنێ بۆت
خەوت و ئەیڕاونی لە ژێرۆ بە چاو     چاوەڕوان بوو تا چۆن بێحەساو
چووە ژوور سەری خانم بە هێواش     بە دەسیەوە بوو کاردێکی مووتاش
دەسی درێژ کرد بۆ بڕینی موو     کوتوپڕ ئاغا لە خەو راسەو بوو
بیری لە ئەنجام کار نەکردەوە     سەر ژنی لە تەن جیا کردەوە
لەم کارەساتە دەمی بەیانی     کەس و کاری ژن خەبەریان زانی
هاتن بۆ کابرا بوو بە شەڕێ زل     تیا شکا خەیلێ سەروپاچ و قول
قسەی دوو زبان ئەگەر بژنەون     لەگەڵ بەدبەختی دەستەمل ئەون

## ٩

### چاڵ بۆ غەیر هەڵمەکەنن با تێنەکەون

پیاوێکی هۆشیار رەهنوما بۆخێر     لە حەقوێژیدا بێباک وێنەی شێر
عادەتی وا بوو تەواوی عومری     سەحەر هەڵئەسا زۆر بە بێسەبری
دوای ئەدای فەرز و سوننەت و دۆعا     بە پەلە ئەچوو بۆ مەجلیسی شا
ئەیفەرموو ئەی‌شا لەگەڵ چاکان‌چاک     معامەلەی کە و گوێ مەدە ناپاک
ناپاکان ئەڵبەت خراوی خۆیان     بۆ گرفتاری کافیە بۆیان
لە نەزەر شادا زۆر موحتەرەم بوو     حەتا ژوورکەوتووی سەدریئەعزەم بوو
وەزیرێکی بوو شا خەیلێ دەغەڵ     حەسوود و خایەن ناپاک و چەپەڵ

کینەی ئەو پیاوەی لە دڵدا چەقی
ویستی کەساس کا بازاڕی حەقی

ڕۆژێ بە شای وت ئەم درێژدڕە
هەموو ڕۆژێ دێ و ئەیکا وە قڕە

نۆرەی کەس نادا کە بێتە زبان
لە زۆر وێژی ئەو عاجزە دیوان

بیستم وتوویە پاشای ئەم شارە
دەمی بۆگەنە و کلێشەدارە

ئەگەر هاتەوە بانگی کە پێشۆ
ئیمتیحانی کە بۆ ڕاس و درۆ

بزانە چلۆن دەس بە لووتەوە
ئەگرێت و نانێ ڕوو بەڕووتەوە

پاشان چوو بۆ لای پیری ڕۆشندڵ
وتی ئەی زانا ئەی بۆ مەجلیس گوڵ

بەرلەوە تەشریف ببەی بۆ دیوان
مێهمانی منی سبەی بەرقلیان

بە جامەلۆسی بە حیلە و تەزویر
دایە دەرخواردی بەڵگە بەڵگە سیر

هەستا بە خاتر پڕ لە بیرەوە
ڕووی کردە دیوان بە بۆی سیرەوە

شا فەرمووی بۆچی وا درەنگ هاتی
وام دێتە بەرچاو ئەمڕۆکە ماتی

زوو زوو بێ بۆ لام نەسیحەت پیشە
بێرە پێشەوە دوور دامەنیشە

بۆ ئەوە پەردە با وە سەر سیردا
دەسی نا سەردەم هات وە تەقریردا

شا وتی قسەی وەزیرم ڕاسە
ئەم بێئەدەبە بیکوژم خاسە

قانوونی وابوو بۆ غەیری عەتا
خەتی شەخسی خۆی بەکەس نەدەدا

نووسی ئەیسەرهەنگ ئەمخەتە هەر کەس
هاوردی بۆ لات ئەو دەم ئەو نەفەس

بیکوژە و پێسی بخنەوە بە کا
حەواڵەی بکە بۆ دیوانی شا

خەتی شای وەرگرت هاتە دەرەوە
وەزیر نامەی دی چووە بەرەوە

وتی ئەم نامە چون خێزاندارم
بیبەخشە بە من زۆر منەتبارم

وەریگرت نامە بە ئومێدی گەنج
نەیزانی ئەبێ بۆی وە مایەی ڕەنج

بردی و گەیاندی سەرهەنگ وتی شا
نووسیویە پێستت پڕ بکەم لە کا

هەرچەند پاڕاوە بۆ ڕەزای خودا
مەمکوژن کوشتیان ڕۆحیان دەرهێنا

سوبحا ئەو دانا عادەتی وا بوو
بۆ مەجلیسی شا وێنەی ڕۆژان چوو

وەختێ خاتیمەی دا بە تەقریری
شانامەی دوێنێی خستەوە بیری

عەرزی کرد وەزیر ئەو نامەی لێم وەر
گرت و نازانم چی هاتووە بە سەر

شا فەرمووی دوێنێ هاتی بۆ لام تۆ
لەبەرچی دەستت وەختی گفتوگۆ

لە سەر لووت دانا راسی بڵێ پێم — تا راس و درۆ مەعلووم ببێ لێم
وتی دەعووەتی کردبووم وەزیر — خۆراکێکم خوارد تێکەڵ بوو بە سیر
بۆ ئەوەی بۆی سیر شا عاجز نەکا — دەسم بە پانۆ لە سەر دەم دانا
شا فەرمووی حەقە ئەم قسە راسە — جەزای بەد بەدی، هی خاسی خاسە
بۆ ئەو خێروێژە چاڵی کەند وەزیر — ئەو خوا پاراستی و ئەمی خستە بیر

## ١٠

### لە تەنگانەدا عەقڵی خۆلە دەس مەدە

رێویێ خەریک بوو لە برسا دەمرد — لە دڵی خۆیا ئەم تەدبیرەی کرد
وتی خۆم بکەم بە کەلاک خاسە — راکشێم لە خۆم ببڕم هەناسە
نەبزوێمەوە نەجووڵم لە جێ — بەڵکوو کۆترێ، قالاوێ، قەلێ
بنیشێتۆ لام دەنووک بێنێ بۆم — پەلاماری بەم بیگرم بیخۆم
بە هیوای نەچیر خۆی کرد بە مردوو — کەوتە سەر زەوی و دەس و پا شل بوو
قالاوێ هێواش هاتە ژوور سەری — وتی ئەزانم تۆ حیلەگەری
ئەزانم زیندوی، نەمردوی، ماوی — بەم کەلاکیشە بۆ نەچیر داوی
لە فێڵەبازیت دڵ بە ئەندێشم — وا بە دەورتدا خەتێ ئەکێشم
ئەلئانە ئەڕۆم سبەینێ کە بێم — سەرنجی ئەدەم مەعلووم ئەبێ لێم
بە شێواوی خەت یا نەشێواوی — لە چ حاڵێکای مردوو یا ماوی
قالاو هەڵفڕی و رێوی هەستا پا — بازی دا لە خەت رووی کردە سارا
سوبحا هاتەوە لەو جێگەدا کەوت — هەر خۆی بۆخۆی بوو بە «ملک الموت»
قالاویش دیسان هاتەوە سەری — کەوتە هاتوچۆ لە دەور وبەری
روانی لە خەتی کە نەشێواوە — لاشەی مامڕێویش هەروەک خۆی ماوە
چووە پێشەوە دایە بەر دەنووک — رێوی راسۆ بوو نایە دەمی سووک
قالاو ناعیلاج وتی ئەی ئەمیر — ئیسە کە منت گرتووە بە نەچیر
بەر لەوە ئەگەر خوێنم بڕژێنی — لازمە شوکری حەق بەجێ بێنی
چون شوکری نێعمەت نێعمەت زیاد ئەکا — ناشوکری، نێعمەت زوو بەرباد ئەکا
رێوی بۆ شوکر دەمی داچڕی — قالاو فرسەتی هێنا و هەڵفڕی
ئەقڵ بە کار دێ رۆژی تەنگانە — بۆ نەجات لە گێژ بەڵای زەمانە

## ١١

### ئاشنایەکی وا بگرن لە رۆژی تەنگانە بەکارتان بێ

پۆلێ کۆتری هاودەم و هاوسەر     ئەفڕین ئەگەڕان سارا و دەشت و دەر

بێ غەم لە زەخمی چنگاڵی هەڵۆ     لە تەڵە و فاقە و داوی ئەمن و تۆ

خەریکی سەیران لەم باغ بۆ ئەو باغ     تێر لە دان و ئاو، شاد و خۆش دەماغ

گەورەیەکیان بوو هۆشیار و ژیر     ئیفلاتوون حیکمەت، ئەرەستوو تەدبیر

لە گەڵیانا بوو بە رۆژ و بە شەو     ئاگای لێیان بوو بە بێداری و خەو

رۆژێ نیشتنەوە لە کەنار ئاوێ     بحەسێنەوە لە زەحمەت تاوێ

تەماشایان کرد لەو کەنار ئاوە     بە سەر خاکەدا دانە رژاوە

لی کۆبوونەوە چاویان تێبڕی     ئەو گەورەیانە نەچوو هەڵفڕی

بانگی کرد مەخۆن بێنە دواوە     ئەو دانە بە سەر داوا رژاوە

هەر ئەونە دەنووک ببەن بۆ دانە     وا بزانن ئەڵقەی داو لە ملتانە

رێگەی زیرەکی دەخیل وێڵ مەکەن     راویار بۆ نەچیر هەزار فێڵ ئەکەن

هەی مەکەن مەچن وەرن با بڕۆین     لە جێگایێ تر نان و ئاو ئەخۆین

قسەیان نەبیست رژانە سەر داو     بەر لە تێر خواردن پێوە بوون تەواو

هاواریان کردێ، وەختی یارییە     فریامان کەوە کارمان کارییە

وتی هاوارم نەکرد هەر ئەو کات؟     نەتانبیست قسەم تا واتان لێهات

مەترسن هەمە دۆسێ لەم هەردە     لەم زەمانەدا بە هیممەت فەردە

ئاگا لە رووداو ئایندە و پێش     مشکێکە زیرەک یەکجار دووریئەندێش

بە کۆمەکی ئەو هەموو بەر ئەبن     دیسان لە قسەم ئەگەر دەرنەچن

ئەمە تێکەوتن گۆمێکی قووڵە     هەریەک بە نەوعێ مەکەونە جووڵە

گشت بە یەک تەکان لینەون یەکجۆر     سنگی ئەم داوە هەڵکەنن بە زۆر

بەم قەرارەدا گشت بە یەک تەکان     داویان هەڵکەند وهاتن بۆ مەکان

ئەو موشکوڵ گوشای دەوری زەمانە     ئەو پەنای داماو رۆژی تەنگانە

باڵیان گرت، فڕین بە تەک و بەدەو     نەوێسان هەتا ئاسانەکەی ئەو

خەبەری زانی هاتە دەر لە ماڵ     بە چاوی خۆی دی کە چۆنە ئەحواڵ

سەردەســـــتەی کـــۆتر هاتـــە پێشـــەوە
بـــە دەروونێکـــی پـــڕ لـــە ئێشـــەوە

وتی ئـــــەی پـــەنای رۆژی دامـــــاویم
چـــاک تێبفکـــرە لـــە لـــێقـــەوماویم

خواهیشـــم هەیـــە بـــێســـەبر و تـــەئخیر
یـــارانم هـــەموو بـــەردەی لـــە زنجـــیر

وتی خواهیشـــت وا لـــە ســـەر چـــاوم
هـــیچ غـــەمت نـــەبێ داو وا ئـــەجاوم

کـــە لـــەتلـــەت ببـــێ و قولـــفەی نـــەمێنێ
هەریەک بـێزەحمـەت پـای خـۆی دەرێنـێ

داوی بـــێدرەنـــگ وەهـــا کـــرد پـــارە
کـــۆتر نـــەجاتیان بـــوو لـــە پـــەژارە

ئاشـــــــنایەکی وا بگـــــــرە گیانـــــــە
کـــە فریـــات کـــەوێ رۆژی تەنگانـــە

## ١٢

### خەیانەت مەکە با دوچاری زەرەر نەبی

مانگایـــــەکی بـــــوو پیـــــاوێکی هـــــەژار
ئەیدۆشـــی هـــەموو رۆژێ دوو ســـێ جـــار

شـــیرەکەی لەگـــەڵ ئـــاو تێکـــەڵ ئـــەکرد
جـــا ئەوســـا بـــۆ نـــاو مشـــتەری ئـــەبرد

ماڵـــی پێکـــۆ نـــا بـــە شیرفرۆشـــی
لـــە زیندەگیـــدا کـــەوتبووە خۆشـــی

بێخەبـــــەر لـــــەوە خەیانـــــەتکاری
ئەیخاتـــە گێـــژی دەریـــای نـــەداری

رۆژێ هـــــەورێکی رەش کەوتـــــە هـــــەوا
بـــە وێنـــەی پلووســـک ئـــاوی لـــێئـــەڕژا

ســـارا بـــە جـــارێ بـــوو بـــە دەریـــای ئـــاو
مانگـــای شـــیرفرۆش کەوتـــە بـــەر لافـــاو

شـــــەپۆلی لافـــــاو مانگاکـــــەی خنکـــــان
بێبـــەش مـــا لـــە مـــاس، شـــام و بـــەرقلیان

منداڵـــــێکی بـــــوو هۆشـــــیار و ژیـــــر
وتی بابـــە گیـــان هـــیچ مەبـــە دڵـــگیر

هـــەر ئـــەو ئـــاوە بـــوو تێکـــەڵ شـــیرت کـــرد
بـــوو بـــەم لافـــاوە مانگاکـــەتی بـــرد

تێفکـــرن ئەگـــەر هۆشـــتان لـــە لایـــە
خەیانـــەت پیشـــە ئـــاخری وایـــە

## ١٣

### بە بەرگی ئەم و ئەو لە خۆت دەرمەچۆ با نەبیتەوە بە خۆت

کـــەرێکی گـــەڕۆڵ، ســـندان لێـــدراو
لـــە بـــەر زەخمـــاری بەرەڵـــلا کـــراو

ئـــەیزانی وەک خـــۆی نییـــە کولۆڵـــێ
لـــە بـــەر دامـــاوی رووی کـــردە چۆڵـــێ

لـــە ترســـی مەگـــەس ئـــەخزیا لـــەناو
کـــەمتر ئـــەیوێرا بێتـــە بـــەر هـــەتاو

شەو تا بەیانی غەرقی چرا بوو
بە ڕۆژا خەوگای لە سێبەرا بوو

تا هێواش هێواش زامی چاکۆ بوو
لە کیم و زووخاو، برین پاکۆ بوو

ڕۆژێ ئەگەڕا بێخۆف و خەتەر
پێسی شێرێکی هاتە بەر نەزەر

وتی بە سووڕەت ئەگەرچی کەرم
وەلێ ئەم پێسە ئەکەمە بەرم

بە دەور ئاوایی ئەڕۆم با هەڵبێن
لێرە بەو لاوە بارم لێ نەنێن

دەس بەجێ پێسی شێری کردە بەر
ڕوو بە ئاوایی ڕێگەی گرتە بەر

ئەهل ئاوایی چاویان کەوت بە شێر
هەڵاتن یەکسەر تەواو مێ و نێر

ئاوایی چۆڵ بوو کەسی تیا نەما
کەر وتی ئەگەر هەڵبێنم سەدا

نێر و مێو ئەمرن گشتیان بە جارێ
هیچ کەس نامێنێ لێم بنێ بارێ

چون نەیئەزانی ئەم بێشعوورە
دەنگی شێر و کەر زۆر لە یەک دوورە

کە بەنیئادەم گەلێ حەساسن
سەدای کەر و شێر زۆر چاک ئەناسن

وەختێ زەڕانی زانیان کەرە
لی گردەوە بوون، بوو بە مەسخەرە

لە ژێر پێسی شێر هێنایانە دەر
خاوەنی ناسی و ئازا دایە بەر

بردیەوە بۆماڵ خستیە ژێر کۆپان
زەحمەت بەشی بوو تا وەختی تۆپان

تۆش ئەگەر بە پێس خۆ بکەی بە شێر
ڕێویش ئەتوانێ کە بتنێتە ژێر

جەوهەر ئەوەیە ئەگەر زاتییە
بێجەوهەر ئەمە بە سەرهاتییە

## ١٤

### هەر جنسێ لەگەڵ خۆیا یەک ئەکەوێ

گێڕاویانەتۆ لە چاکان پیاوێ
کە دەسنوێژ ئەگرێ لە قەراخ ئاوێ

لەو مەوقیعەدا مشکێکی هەژار
لە چنگ هەڵۆیێ ئەکەوێتە خوار

بەزەیی پیادێ و ئەیباتە مەنزڵ
خزمەتی ئەکا بە گیان و بە دڵ

دەرمانی ئەکا، دێنێتەوە هۆش
برینی ئازای ئەبێتەوە خۆش

ڕۆژێ ئەو پیاوە بە دڵێکی پاک
ئەپاڕێتەوە لە خودای بێباک

ئەڵێ ئەی خودای ئەرز و ئاسمان
ئەم جانەوەرە بکە بە ئینسان

ماڵم کە نییە لە ئاواییدا
با ڕەفیقم بێ لە تەنیاییدا

ئەم تیری دوعای کە لە دەم دەرچوو
بوو بە کچێکی تازە پاگرتوو

بە خۆشەویستی وای کرد پەروەردە
گەردنی دەتوت مینای بێگەردە

زەمانێ پای نا مەقامی ژنان
تەمەنی هاتە وەختی بەشوودان

بە زبانی خۆش بۆ دڵنەوایی
وتی ئەی دەوای دەردی تەنیایی

بۆ حیفزی شەرەف حەیا و ئابڕوو
وەختی ئەوەیە کە بتدەم بە شوو

بە ئارەزووی خۆت شوو هەڵبژێرە
چی لە دڵتایە لێم دامەشێرە

وتی بابە گیان شوویەکم ئەوێ
لەو پاڵەوانتر کەسێتر نەوێ

وتی کە وایە با بتدەم بە خۆر
مەرتەبەی بەرزە و ڕۆشنایی زۆر

ڕۆیی تەکی دا بە لای خۆرەوە
بە دەروونێکی پڕ لە شۆرەوە

وتی هاتووم ئەی شای ئەختەران
ڕۆشنایی بەخش بەزمی سەروەران

بەم قووەی نوورە کە تۆ مومتازی
کچێکم هەیە لێمی بخوازی

وتی هەور لە من پاڵەوانترە
بۆ ڕۆشنایی من، هەر ئەو بەرگرە

بچۆ بۆ لای ئەو واز بێنە لە من
هیچ کەیفم نیە لە ڕەفیقی ژن

ڕۆیی بۆ لای هەور مەتڵەبی گەیاند
هەور توورە بوو جارێکی نەڕاند

وتی کەی ئەمن هێزم تیایە
ئەو پاڵەوانە تۆ ئێژی «با»یە

نابینی کە با زۆرم بۆ دێنێ؟
لەم هەرد بۆ ئەو هەرد چۆنم ئەڕفێنێ

مەگەر لە لای با بگەی بە ئاوات
کارت سەر بگرێ و ببێ بە زاوات

بەم ئارەزووە کە هات بۆ لای با
با وتی ئەی پیر ئەی ژیری دانا

من پاڵەوان نیم، پاڵەوان کێوە
بەهێز و مەحکەم لە جێ نەبزێوە

ئەوەتا من هەم زەربەی لێ ئەدەم
سەرە موویەکم لێ نەکردووە کەم

بچۆ بۆ لای ئەو، تا زووە ڕاکە
خێشایەتی تۆ هەر بۆ ئەو چاکە

کە هات بۆ لای کێو بەم خەیاڵەوە
کێو هاتە جواو بە سەد ناڵەوە

وتی ئەی پیری بەرەکەت ئاسار
ئەی قسە ڕەوان ئەی شیرین گوفتار

بێ لێم بڕوانە چەن ناتەوانم
بێزار بێژارە سەر تا دامانم

ئەگەر بمبوایە زۆری شمشێرێ
نەمدەهێشت وا مشک زۆرم بۆ بێرێ

بە دەس مشکەوە حاڵم خراوە
جەرگی بڕیوم لە هەزار لاوە

ئـــەو پاڵـــەوانە کـــە تـــۆ ئەتـــەویٚ ئـــەبیٚ غـــەیری مشـک کەسـیٚ تـر نـەویٚ
پـــاش دەردی ســـەری زۆر و بـــیٚشـــومار ئـــەو پـــیرە وتی ئـــەی پـــەروەردگار
بیکـــەوە بـــە خـــۆی هـــەتاکوو زووە غـــەیری مشـک نییـە بـۆ ئـەو ئـەم شـووە
ئەمەیـــە بـــەری ئـــەم گفتوگۆیـــە هـــەر جنســـیٚ مایـــل بـــە جنســـی خۆیـــە

## ١٥

### شتێکت که لێ زەوت کراوە مەڵێ هی منە

مـام رێـوی لەگـەڵ یـەک دوو هـامفـەردیٚ لە نووچکەی کێـویٚ چوبـووە سـەر بـەردیٚ
ئـــەیوت هـــا ئـــەو دیٚ ئەگـــەر دیـــارە ئـــەو عەمارەتـــە و بـــورج و حەســـارە
ئـــەو بـــاغ و دارە ئـــەو بێشـــە و چۆمـــە مولـــکی حەلاڵـــی خالیســـی خۆمـــە
قەباڵـــەی شەشـــدانگ تـــەواوی وا پـــێم هـــەموو بـــزانن مـــن ئاغـــای ئـــەو دێم
رەفێقـــان وتیـــان کـــە وایـــە قوربـــان بـــەم ســـەرما ســـەختە بـــە چلـــەی زســـتان
لـــە ســـەر ئـــەم پـــردە بـــۆ هەڵـــتووتاوی ئەلـــەرزی ئێـــژی تووڵـــی نـــاو ئـــاوی
دەمـــیٚ بـــن بـــەردیٚ ســـاتیٚ بـــن داریٚ لـــە هـــیچ مـــەکانیٚ نیتـــە قـــەراریٚ
لـــە برســـا خـــۆ وا پشـــتت شـــکاوە هێـــزی دەس و پـــا و ئـــازات نـــەماوە
بـــۆ ناچیتـــە نـــاو ئـــەو قەســـرە خۆشـــە ئـــەو عەمارەتـــە پـــڕ عـــەیش و نۆشـــە
هاوســـەران لـــە خـــۆ کـــۆ بکەیتـــەوە ژەنگـــی غـــەم لـــە دڵ خـــۆ ببەیتـــەوە
لـــە قـــەوم و بـــرا پـــڕ بـــیٚ دەربـــارت لاقـــی فـــڕووج بـــیٚ شـــام و نـــەهارت
بـــە کـــاری چـــی دیٚ لاف و گـــەزافت خـــۆت وێڵـــی ســـارا و زەوت کـــریٚ مافـــت
ئـــەوا فـــەرزمان کـــرد ئاغـــای بەهەشـــتی فاییـــدەی چیـــە کـــە وێڵـــی دەشـــتی
وتی هاودەمـــان بـــەزمی دیـــوانم ئەساســـی خۆشـــی دەورەی ژیـــانم
تانـــەم لـــیٚ مـــەدەن ئـــەی مایـــەی گیـــانم ئـــەمن دەردی خـــۆم هـــەر خـــۆم ئـــەیزانم
لـــە ترســـی تـــاجی و تولـــە مەحالـــە رێگـــای دڵ بـــدەم قـــەت ئـــەم خەیاڵـــە
لـــە خـــۆفی ئـــەوان قەتعـــەن نـــاوێرم روو بـــە ئـــاوایی هـــەنگاو هەڵـــبێرم
بـــە ژەقنـــەمووت بـــیٚ بـــەهرەی مولـــکی وا دوژمـــن بـــە پـــانۆ بیجـــاویٚ و بیخـــوا؟
ئاغـــا رووت و قـــووت بێـــزار لـــە گیـــان ویٚ داگیرکـــەر خـــاوەن خەلـــە و خـــەرمان ویٚ
ئەقڵـــی ئـــەم قســـە لـــە پێشـــینانە نـــان هـــەر ئـــەو نانـــە، ئەمـــڕۆ لـــە خوانـــە

## ١٦

**فریای داماو کەوە با نائەهلیش بێ، تا لە داماوییا فریات کەون**

وشتر سوارێ ئەچوو بۆ سەفەر
تۆشەی هەڵگرت و ڕێگەی گرتە بەر

دی لە ڕێگادا پووش و پوارێ
ئاوری گرتووە لە ناویا مارێ

گیری خواردووە، ڕێگەی فەراری
نییە بۆ هیچ کوێ، موشکوڵە کاری

وتی ئەی هاوار ئەی وشتر سوار
دەسم دامانت جارێکە و ئەمجار

دەرم بێرانە بە جەوانمەردی
شێوەت دیارە بە مەردی فەردی

وتی ئەترسم ئەگەر بیتە دەر
گازم لێ بگری بمخەیتە خەتەر

ئەزانم ئێوە چەندە بێوەفان
نە هەر بۆ دوژمن بۆ دۆستیش جەفان

مار هاواری کرد وتی ئەی جەوان
شەرتە تا ئاخر هەناسەی ژیان

ببم بە خاک و بکەومە بەر پات
لەم تەنگانەدا کە بمدەی نەجات

وتی جا چلۆن دەسم بگا پێت
تەک بەمە بەرۆ ئازام ئەسووتێت

وتی دەخیلم ئەو خورجەت پێیە
کە تۆ شەوانە بۆ تۆشەی ڕێیە

بیدە لەو ڕمە درێژە وا پێت
دەستت درێژ کە بۆ لای من با بێت

خورجی دا لە ڕم تەکی دا بەرۆ
مار چووە ناوی کێشایە دەرۆ

سەری هەڵبڕی مار وتی خەستەم
بە جێم مەیەڵە بمنێرە بەردەم

دوو سێ هەنگاوێ بمبە بەو لاوە
با نەسووتم بەم گڕ و هالاوە

بەزەیی پیاهات نایە بەردەمی
نەیزانی ئەوێ وە مایەی غەمی

پاش ئەوە بەینێ ڕۆیین بەڕێوە
ئالا گەردنی ئەو شەیتان شێوە

وتی مۆڵەتت نادەم ئەتگەزم
لە عەداوەتتان من چۆن ئەبەزم؟

دوژمنی پێشووت بۆچی لەبیر چوو
بیری گیر خواردن ئەم ڕۆژەت نەبوو

ڕێبوار وتی کەی ڕەوایە کەی؟
لە جەزای چاکیم ئەتۆ پێمۆ بەی

وتی نابیسم من ئەم حەرفانە
ئەوەڵ ئارەزووی من پێوەدانە

ڕێبوار وتی بێحوکمی قازی
من بە کاری وا قەت نابم ڕازی

مانگایێ هەیە ژێر و دنیادیو
بەرتیل نەخۆرە ناخوا فریو

با بچین بۆ لای هەر جۆرێ فتوا
چوون بۆ لای مانگا شەرحی حاڵیان دا
بیری کردەوە کەمێ لەم کارە
هەستە بە قانوون ئادەمیزادە
من مانگای کوێخای دێ بووم زەمانێ
وەختێ لاغر و بێهێز و پیر بووم
وتی دەری کەن ئەم داڕزیوە
دوێ هات قەڵەوی هاتمە بەرچاو
ئاوایە وەفای ئادەمیزادە
مار بۆ پێوەدان دەمی داچڕی
وتی ئەی نامەرد ئەی خودا نەناس
کە نەجاتم دای لە گڕی ئاگر
وەرە با بڕۆین بۆ لای ئەو دارە
درێژە بدەین بەم گفتوگۆیە
چوون بۆ لای ئەو دار، پڕ گەڵا و میوە
بۆ محاکمە هاتووینەتە لات
وتی دەی بێژن بێفێڵەبازی
ئەم مارە کە وا لە من ئالاوە
ئیسە پێم ئەڵێ ئەبێ پێتۆ بەم
وتی بە قانوون ئادەمیزادە
ئەمن کە نیمە بۆ کەس زەرەرێ
بەنی ئادەمی خەستە لە ڕێوە
دوای حەسانەوە کە چاو هەڵدێنن
لە تەڕ و وشکم ناپارێزن دەس
ئەی مار! بە مەزهەب ئادەمیزادە
ڕێبوار وتی با بچین بۆ لای

بدا پێی رازیم «الحکم للّە»
مانگا سەر سووڕماو لە ئەحواڵیاندا
سەری بەرزۆ کرد وتی بەو مارە
ئازا پێوەی دەو عومری بە با دە
ساڵەها شیر و ماسم ئەدانێ
قسر مامەوە بێبەهرە و شیر بووم
بیوەن بەرەڵلای بکەن لەو شیوە
هیچ ماتڵ نەبوو دامی بە قەساو
پێوەی دە ئازا عومری بە با دە
ڕێبوار بە ناچار سەدای هەڵبڕی
ئەی دوور لە ئینساف سپڵەی ناسپاس
ئاوا بوو جەزای پیاوەتیم ئاخر؟
کە وا لە کەنار ئەو چەشمەسارە
ئایا حەق هی من وە یا هی تۆیە
وتیان ئەی دانا ئەی دنیا دیوە
کارمان کۆتا کە ئێحسانت ئەگات
ڕێبوار وتی جەنابی قازی
لە گڕی ئاگر نەجاتم داوە
عیلاجم چیە لە گەڵی چبکەم
حەق بە دەس ئەوە، قسەی تۆ بادە
خودا پێی داوم سێبەر و بەرێ
لە سێبەرمدا ئەحەسێنەوە
هەر خەڵفم جوان بێ ئەوە ئەشکێنن
منیش لە دەسیان خەیلێ گلەم هەس
زوو زوو پێوەیدە، عومری بە با دە
قازیەکی تر ئەویش گەر فتوای

وەهـــا دا ئیتـــر عـــوزرم نامێنـــێ
پێمـــۆ دە هـــەر جـــۆر کـــەیفت دەهێنـــێ

بـــەم خەتـــەرەوە ڕێگـــەی گرتـــە بـــەر
ناکـــاو ڕێویـــەکی هاتـــە بـــەر نـــەزەر

وتی مەرحـــــەبا هـــــای مامـــــە ڕەوی
مـــەڕۆ هـــاتووین فریامـــان کـــەوی

ئـــەزانم کـــاری مـــن و ئـــەم مـــارە
لـــە لای تـــۆ نـــەبێ نیـــەتی چـــارە

وتی ڕاس بـــڕۆن گـــوێ ئـــەگرم لێتـــان
جـــواوێ ســـەحێح ئـــەدەمۆ پێتـــان

ڕێبـــوار ڕووداوی ئەگـــەر کـــرد بـــەیان
ڕێـــوی تـــوڕە بـــوو ســـەری داتـــەکان

وتی مـــن بـــاوەڕ ناکـــەم بـــەم درۆ
مـــاری وا زەلام چـــون جێـــی ئـــەبێتۆ

لـــە خورجـــێ تەنگـــدا ئـــەم ئەژدیهایـــە
نـــەبووە ناگونجـــێ کـــەی جێـــی بڕوایـــە؟

مـــار وتی قـــازی بـــۆ سەرســـام مـــاوی
ئیجـــازەم بـــدە ئەچمـــەوە نـــاوی

وتی تی بچـــــۆ بـــــزانم ڕاســـــە
درۆی تیـــا نیـــە ، حەقیقـــەت واســـە؟

مـــار قەفقـــەف لـــە مـــل ڕێبـــوار هاتـــە خـــوار
لـــە نـــاو خورجێنـــدا گـــورج گـــرتی قـــەرار

مـــام ڕێـــوی بـــە چـــاو کـــردی ئیشـــارە
وتی بیکـــــوژە کوشـــــتنی چـــــارە

ڕێبـــوار چـــاوی لـــەو ئیشـــارە بـــوو
دای بـــە ئـــەرزدا پـــارە پـــارە بـــوو

چـــۆن تێکۆشـــابوو بـــە ڕاســـی بـــۆ کـــار
خـــوا نـــەجاتی دا لـــە ســـەدەمەی مـــار

مـــاریش چـــون ڕێگـــەی لاری گرتـــە بـــەر
لـــە عاقیبەتـــدا ئـــاوای هـــات بـــە ســـەر

بـــرا گیـــان فریـــای دامـــاوان کـــەون
لـــە تەنگانـــەدا بـــا دامـــاو نـــەون

## ١٧

### فێڵ مەکەن با فێڵتان لێنەکرێ

مـــام ڕێـــوی ڕۆژێ لـــە قـــەراخ ئـــاوێ
بـــوو بـــە میـــوانی لەقلـــەقێ تـــاوێ

ئەونـــە برســـی بـــوو هێـــزی نـــەمابوو
لـــە برســـا تـــەواو ئـــەژنۆی شـــکابوو

چوو ئەوەنـدەی خـوارد بـە بـێبسـم اللـە
لـــە یـــەک ڕەواوە وێنـــەی ڕەشـــکە کـــا

لـــە پـــاش تێرخـــواردن دەمـــی لێســـاوە
لـــە ماڵـــی لەقلـــەق ســـەعاتێ مـــاوە

وتی ئـــەی دەنـــووک لـــەعلی بەدەخشـــان
بـــرای چەکمـــە ســـوور شـــیرینتر لـــە گیـــان

چـــــون ئیشـــــم زۆرە پەلەمـــــە ئـــــەڕۆم
ســـبەی ئـــەم کاتـــە چـــاوەڕوانی تـــۆم

کـــە تەشـــریف بێـــری ببیـــە میـــوانم
بمخـــە بـــەرپات هـــەم ســـەر هـــەم گیـــانم

گەڕاوە ڕێوی بە فێڵەبازی    کەوتە تەهییەی مێهمان‌نەوازی

لاوێچێ ئاردی تێکەڵ کرد بە ئاو    چێشتێکی لێنا ئەمما زۆر تراو

وەختێ کە لەقلەق نیشتەوە لای    بەرەو پیری چوو کەوتە خاکپای

زەمانێ مەشغووڵ بوون بە وتوویژ    مەنزڵیان بردە سەر بەردێکی لێژ

مام ڕێوی چێشتی وەبەردا ڕژان    وتی دەی فەرموو بخۆ براگیان

لەقلەق کە زانی قەزییە چییە    وتی کاکە گیان ئیجازەم نییە

نییەتی ڕۆژووم هێناوە ئەمشەو    نابێ هیچ بخۆم هەتا وەختی خەو

ڕێوی بێشەریک چێشتی بە زبان    لێساوە نەیهێشت لی بخوا میوان

ئەم لەم لا پەی پەی چێشتی ئەلێسا    ئەو لەو لا لە سەر لاقێ هەڵوێسا

دوای بەینێ فڕی وتی بێرەوە    لە ڕەفاقەتم خۆت مەشێرەوە

هەر ئەونە کفتەی ماسیت پێئەدەم    لە گەرووتەوە سەر بکا بۆ دەم

بیری کردەوە چ چێشتێ لێنێ    تا ئینتیقامی خۆی لێ بسێنێ

تۆنگێ درگا تەنگ مل بەرزی هاورد    لاوێچێ نۆکی کوڵاوی تێکرد

گەیشتە پێشۆ وەختی میوانی    بەرە وپیری چوو بە میهرەبانی

دوای بەجێهێنان ڕەسمی برایی    دەردەدڵ لە جەور ڕۆژی جیایی

بە دڵێکی خۆش پێکۆ هەر دوو یار    هاتن بۆ سەر خوان بۆ سەرفی نەهار

مام ڕێوی ئەگەر بە دیقەت ڕوانی    زۆر عەجایب ما لە سفرە و خوانی

باوێشکێکی دا و دوور هەڵترووشکا    وتی براگیان من ئەمشەو سەرما

سڕی کردووم ناتوانم تەعام    بخۆم زەڕڕەیێ نە نەهار نە شام

خەستەم لێم گەڕێ گیان قوربانت بێ    تەنها خۆت بیخۆ نۆشی گیانت بێ

ئەیوت ئەم دڕکە هەڵچەقی لە پێم    کردەوەی خۆمە وا هاتەوە ڕێم

لەقلەقیش ئاسان بە دەنووک زوو زوو    نۆکی ئەهێنا دەر یەک یەک و دوو دوو

کە قووتی ئەدا و دەمی ئەتەقان    ڕێوی ژیانی لێ ئەبوو بە ژان

چونکە فێڵەباز پاداشی وایە    ئێوە فێڵ و فەن مەکەن وە مایە

خوا کە ڕاسەو خۆشی لە ڕاس دێ    کاری لار مەکەن با کارتان ڕاس وێ

## ١٨

### تا کاریان پێت نەبێ ناکەویتە بیر

بۆسەر زەماوەن بانگ کریا کەرێ
کەر زۆر پێکەنی و جووڵانی سەرێ

وتی کەی ئەمن گۆرانی وێژم
رەنگی هەڵپەرکێ چلۆن بڕێژم

سەرچۆپی کێشان بەڵەد نیم تەواو
هەڵنەپەریوم نە کرژ و نە خاو

لە ئاشپەزیدا زۆر بێخەبەرم
لە چایی و قاوە دەرناچێ سەرم

رەسمی فەڕاشی فێر نەکراوم
بۆسەمای بەر بووک قەت نەبراوم

ئێستە کە قەدرم لە لای خوێشانە
بە خوا ئەم قەدرەم بۆ بارکێشانە

ئەینا تا ئیسە بۆ نەیانپرسی
ماوی یا مردووی تێری یا برسی

## ١٩

### شوێن مەحاڵ مەکەوە

کەرێ بوو کلکی لە بندا بڕاو
لە بەر بێکلکی دەروون پڕ زووخاو

بۆ کلک ئەگەڕا بە رۆژ و بە شەو
بێزار لە ژیان لە خۆراک و خەو

ئەگەڕا دێهات کووچە بە کووچە
چۆڵ و ئاوایی مووچە بە مووچە

لە دەشتەوان و شوان و رێبوار
پرسیاری ئەکرد رۆژێ هەزار جار

کلک لە کوێ هەیە بچم بسێنم
لەمە زیاتر بێ کلک نەمێنم

هاوسەران تاکەی پێبکەنن پێم
گۆشە و تاریکی بۆ بوێ بە جێم؟

بۆ بێبەش لە بەزم کایەی کەران بم
قوڵ و ناشیرین ناو هاوسەران بم

بە رۆژا لە بەر مێش و مێشوولە
ناوێرم بکەم لە جێگا جوولە

ئەزانن نیمە من باوەشێنێ
هەریەک بە جیا زۆرم بۆ دێنێ

بەم خەیاڵەوە لە ئێرەو ئەوێ
ئەیپرسی بەڵکوو کلکی دەس کەوێ

ناکاو برسیەتی زۆری بۆهاورد
چووە ناو زەرحات کابرایێ کورد

کابرا راسۆ بوو هەر دوو گوێی بڕی
هەر دوو گوێشی چوو کلکی نەکڕی

هەر کەس دووی کاری وا محاڵ کەوێ
حاڵی وەکوو حاڵ ئەو کەرە ئەوێ

# ٢٠

## وتووێژێ لە گەڵ زانست و دەربڕینی ئەسەف بۆ بێتەربیەتی منالە ژێرەکانی دێهات

زانست ئەتۆی ئاو دەردێنی لە خاک ... زانست تۆی ئەفڕی بۆ بانی ئەفلاک
زانست تۆی دەوای دەردە سەختەکان ... زانست تۆی نەجات بۆ بەدبەختەکان
زانست تۆی سفەت زات ئیلاهی ... زانست تۆی زینەت بۆ تاجی شاهی
زانست تۆی ئیکسیر بۆ مەسی بەشەر ... زانست تۆی میعمار ئەم دنیا یەکسەر
زانست تۆی غەواس دەریای بێکەنار ... زانست هەر ئەتۆی پەی ئەبەی بە کار
زانست تۆی شفا بۆ ئێش و ئازار ... زانست تۆی دەوای دەردی دەردەدار
زانست هەر ئەتۆی موشکوڵ گوشای عام ... تۆی عالەم ئارا و بۆ عالەم ئارام
زانست تۆ چرای تاریکی جەهلی ... ئەتۆ رەهنومای ئەهل و نائەهلی
بە هۆی ئەتۆوە بەشەر بەشەرە ... تۆ نەبی بەشەر، گایە یا کەرە
گوێ بۆ شکایەت ئەم جگەرپارە ... بگرەو مەردانە دەردم کە چارە
منالی لادێ دوڕی مەنشوورن ... یانی بە خیلقەت غیلمان و حوورن
سەوزەی نەوڕەستەی سارای ئینسانین ... دارای لیاقەت مەدرەسەی زانین
کانی وەفا و فەهم، پڕ ئیستیعدادن ... داخی بە جەرگم کە بێ ئوستادن
بەرەڵا و بێکار بچووک یا زلن ... زمستان خەریک قاپ و کەرخولن
کاریان بە رۆژا ئەم بان ئەو بانە ... شوغڵی موهیمیان لە یەک هەڵدانە
ئەگەر بەهار هات لەگەڵ گا و کەر ... ئەو مەزڵوومانە ساڵ ئەوەنە سەر
هەر لە بەیانی هەتا ئێوارە ... مەشغووڵی وەشە و وەحەن بێچارە
غەرقی گەمە و گەپ شەو تا بەیانی ... بێخەبەر لە کەسب شێوەی ئینسانی
چۆن لە جوانیدا بێ رێگە ئەڕۆن ... وەختێ پیر ئەون هەموو گیر ئەخۆن
دەرسی تەربیەت کەمتر ئەژنەون ... لە سەروچاوی یەکتر بەر ئەون
نە شوێنی ئەدەب، نە بۆی حەیایە ... زیاتر لە لادێ قڕەو هەرایە
لە رەفتاری چاک هەمووو کوێر و کەڕ ... یەکتر ئەکوژن لە سەر سەگە شەڕ
جەور و قەساوەت پێس و موویانە ... کینە و عەداوەت داب وخوویانە
بێسەبر و تاقەت، تووڕە و شەڕانی ... هەموو موبتەلای سەیلی نەزانی

کــــه بـــێ تەربیـــەت ئــــەبن پـــەروەردە
دنیـــا پـــڕ ئـــەبێ لــــە دز و جــــەردە

لــــە ئــــەخلاقی چـــاک بێبـــەش ئــــەمێنن
حــــەتا دارایــــی یـــــەکتر ئــــەڕفێنن

نــــــەواقیس زۆرە نایەتــــــە بـــــــەیان
بـــێ ئەدەبییـــە زیـــاتر تـــوول پێـــدان

تـــو خـــوا زانســـت تـــۆ بـــێ بزانـــە
چـــۆن دروس ئـــەوێ بەشـــەر لەمانـــە؟

ئاســـن کـــە خڵـــتەی بـــێئەنـــدازە بـــێ
خۆ بـه خـۆ تێغـی قـەت لـێ سـاز ئـەبێ؟

پــەتک چـۆن دەبـێ بـۆ شـەدە و رەشـتی
کەی لـە خشـتی کـاڵ دروس بـوو کەشـتی

هــــەتا مێعمـــــار و عەمەلــــە نــــەوێ
بـــــەنای باشـــکۆ چـــۆن دروس ئـــەوێ؟

بەڵـــکوو بـــە چـــاوی خۆمـــان لـــە زەرەر
نـــادانی لادەیـــن بـــوین بـــە بەشـــەر

لەمــــە زیـــاتر پەســـت و خـــوار نـــەبین
ســـەگی پێســـەخۆر، گـــورگی هـــار نـــەبین

بـــۆ خەلاســـیمان لـــەم عـــەیب و عـــارە
دێهــــات موحتــــاجی ئامووزگــــارە

چـــون زۆر محاڵـــە لـــەم قـــوڕە دەرچـــین
بـــە بـــێ مامۆســـتای دڵســـۆز و ئـــەمین

دەســـــتم دامانــــە زانســــت ســـا دێـــرە
وادەی کۆمەکــــــە تەشــــــریفت بێـــــرە

وەک شارســــــــــتانی دۆســــــــــتدارتە
ئــــــاخر دێهــــــاتیش تاســــــەخوارتە

**جوابی زانست و گلە لە ناڕەواجی بێمەیلی ئینسان لە گەڵ ئەو**

زانســـت هاتـــە جـــواب بـــە زبـــانی حـــاڵ
وتی ئـــەی «زاری» پەرێشـــان ئـــەحواڵ

راســــە مــــن رەواج کووچــــەی شــــارانم
مـــــەحبووبی نـــــەزەر تاجـــــدارانم

بازووبەنـــــدی بـــــاڵ شـــــەهریارانم
پایـــــــەی ئیقباڵـــــــی کامگـــــــارانم

ئـــــالای ســــــەربەرزی ســـــەرئەفرازانم
هێـــــزی بـــــاڵ و پـــــەڕ جوڕەبـــــازانم

جلەوکێشـــی خـــاس بـــۆ رێگـــەی راســـم
حەقیقـــەت وێـــژم، حەقیقـــەتناســـم

نیســــــبەتی ئــــــەمن مـــــــەدە وە لاری
بـــێفەرقـــە لـــە لام دێهـــاتی و شـــاری

وەلـــێ کاکـــە گیـــان وەهـــا مەزانـــە
حـــەقم جـــێ بێـــنن ئـــەهلی زەمانـــە

حــەق و یــا ناحــەق بــە مــن پەیـدا کــەن
راســـی بێتـــە بـــەین ناراســـی لابـــەن

پلــــەی مـــەکر و فـــێڵ بـــدرێ وە ئـــاودا
رەویـــە و رەســـمـــی لار، لاچـــێ لـــە نـــاودا

لــــــە هــــــەموو لاوە ئیســـــتیقبالم کـــــەن
وەک دنیـــا بـــۆ دیـــن ئیســـتیعمالم کـــەن

کـــــە تێئـــــەفکرم لای دۆس و دوژمـــــن
هـــەر بـــۆ دنیایـــە خۆشەویســـی مـــن

بـــۆ بەشـــی دنیـــام بـــوو ون بـــە ســـۆنە
هـــیچ کـــەس ناپرســـێ دیـــن چیـــە و چۆنـــە

لەم جیهەتەوە تەواو پەشێوم — بۆ نارەواجیم هەر قوڕ ئەپێوم
بۆ بەشی دینم بێموبالاتن — ئێژی بۆ مانی ئەبەدی هاتن
لیباسی تەقوا داکەنیا لە بەر — کڵاوی تەکلیف فڕدریا لە سەر
حەیا و سەداقەت رەختی پێچاوە — درۆ و دەسبڕی و هەرزەیی باوە
لە دەریای حیرسا عالەم وەها غەرق — بوو بۆ چاک و خراو نەما فەرق
بۆ ئوموری دین کاریان نەما پێم — هەر بۆ دنیایان تەکلیف ئەکەن لێم
دەمێ ئاوری عالەم سووتێنم — نەفەسێ دەریای بەشەر خنکێنم
زەمانێ داوی نەچیر کردنم — رۆژێ لەشکری غارەت بردنم
دەمێ بۆ فریب دەمێ بۆ جەفام — گیرۆدەی هەوای ئەهلی ئەم دنیام
ئەمن ئەسپاوێ بێئیختیارم — هەر چیم پێئەکەن خزمەتگوزارم
خەتای من چیە دێهاتی وەحشین — مشتەری جەهلن تالبی من نین
کەوتوونەتە شۆن شێوەی حەیوانی — بێزارن لە داب و دەرسی ئینسانی
«زاری» تۆبێژە تا حاڵیان وا وێ — بەر و بەهرەی من بۆ ئەوان ناوێ

## ٢١

دنیا کەشتییە ئەڕوا بەرێوە — ئێمە بێخەبەر هەر واین لە جێوە
ئاگامان نییە هەر تا لە ناکاو — ئەوێسێ و بارمان ئەخاتە گێژاو
دەورەی جوانی ئەوا باری کرد — قاسیدی پیری خەبەرداری کرد
ئێمە نابیسین گرانە گوێمان — بانگمان لێئەکەن، هەستن بە جێ مان
خەفەت بۆ نەخۆم قوڕ بۆنەپێوم — بە ئاهی حەسرەت نەسووتێ لێوم
دڵم بۆ نەوێ وە قرچەی کەواو — خوێن بۆنەرێژم لە دوو چاوەی چاو
وا نەتماوە بۆ خوێندنەوەی ئەشعار — شەوقەکەی پار و زەوقەکەی پێرار
کوانێ ئەو زەوق، ئەو فکر، ئەو خەیاڵ — ئەو شەوق ئەو کەیف ئەو شادی ئەحواڵ
ئەوقەهقەهەی خۆش ئەو خەندە ئەو دەنگ — ئەو رێکی قامەت ئەو شێوە ئەو رەنگ
ئەو نوتقی رەوان ئەو زەکا ئەو فام — ئەو بیر ئەو تەقریر ئەو حوسنی کەلام
ئەو شۆخی ئەو بەزم ئەو بەرزی دەماخ — ئەو نوکتەوێژی دوایی هات سەد ئاخ

های دنیا بۆ کێ وەفای بوو تا سەر ... لە ناز و نێعمەت کێی نەکردە دەر

جامی بادەی کێی نەدا وە بەردا ... کام سەری نەدا وە هەزار دەردا

کام تیپ و سپا و سانی قڕ نەکرد ... کەللەی کام شاهی لە خاک پڕ نەکرد

کام بالابەرزی قووت نەدا چون مار ... کاسەی کام بەزمی پڕ نەکرد لە ژار

کام شاسواری نەکرد پیادە ... کام قەلای سەختی نەکرد وە جادە

کام روویینتەنی نابینا نەکرد ... کام پیلەتەنی بۆ ناو چا نەبرد

کام کەیخوسرەوی وێڵی چۆڵ نەکرد ... مەغزی کام کاوەی تێکەڵ خۆڵ نەکرد

تەختی کام جەمی نەدا وە غارەت ... وە کام زوحاکی نەدا مەرارەت

ئەیوانی کامین کەسرای نەڕووخان ... لە کام خاقانی نەسەندەوە گیان

کامین قەیسەری نەهاڕی وەک ئارد ... یا کام هێرقەلی وە خاک دانەشارد

کامین قاڕوونی نەکێشا قوڕاو ... یا کام فیرعەونی نەخنکان وە ئاو

رەحمی بە پیری کام زەکەریا کرد ... ئازاری لە سەر کام یەحیا لابرد

کام نەمروود پامال مێشوولە نەبوو ... کام خەلیل بۆناو مەنجەنیق نەچوو

کام سولەیمانی لە مان تێر نەکرد ... کام ئەسکەندەری سەرەوژێر نەکرد

لاشەی کام لاوی نەکردە کەلاک ... کاسەی کام چاوی پڕ نەکرد لە خاک

کام ئیفلاتوونی تووناتوون نەکرد ... یا کام لوقمانی سەرنگوون نەکرد

کام غونچەی نەکرد وە هەزار پارە ... وە کام بولبولی نەدا پەژارە

کام دڵی نەکرد پڕ لە سۆز و تاو ... ریشەی کام جەرگی نەکرد وە کەواو

کام شای لە سەر تەخت نەهاوردە خوار ... کام خانی نەکرد نەقش دیوار

سینەی کام دارای بەخوێن سوور نەکرد ... کام دەزگای بەرزی ژێرەوژوور نەکرد

کامین یۆسفی نەهاویشتە بیر ... پای کام زولەیخای نەکرد وە زنجیر

کامین فەرهادی رەنج نەدا وە باد ... یا کام شیرینی هێشت وە خاتر شاد

کام مەجنوون نەیچەشت زەهری بێدادی ... کام لەیلای نەکوشت وە بێمورادی

کام پێکەنینی نەکرد وە گریان ... ریشەی کام دڵی نەکرد وە بریان

کام حەڵقەی لە یەک نەچڕی بە زۆر ... زەخمی کام سینەی نەخست وە ناسۆر

ئاوایە رەفتار دنیای جەفاجۆ ... ئیتر وە تەمای چی بین ئەمن و تۆ

با بیکەین بە ویرد هەر لەحزە هەر ئان　　ئیعلانی «کلُّ مَن عَلَیها فان»

لە حەقیقەتی درووس تێفکرین　　یەقین پەیدا کەین نامێنین ئەمرین

ناڕەحەت نەبین بەم کۆچ و بارە　　لەم دیارەوە بۆ ئەو دیارە

چونکە ئیرادەی ڕەببی بەشەرە　　با خۆ حازر کەین بۆ ئەم سەفەرە

بەهاری جوانی ڕەختی پێچاوە　　زستانی پیری حەملەی هێناوە

با چرایێ ساز کەین دیاری داوە　　نیشانەی سەفەر لە هەزار لاوە

بۆ ئەو مەنزڵە تاریک و تەنگە　　بۆ ئەو مقامە وەک شەوەزەنگە

بۆ ناو ئەو وەحشەت ئەو تەنهاییە　　بۆ ئەو چاڵە قووڵ بێ ڕۆشناییە

بێیار بێ یاوەر، بێ قەوم وبرا　　بێ فەڕش و پاڵشت ڕەفیق و چرا

پەنا و پشتیوان فەریادڕەس دەسگر　　کەس نییە ئیللا زاتەکەی نەمر

سەهووە غەڵەتە خیلافی ئەمری　　غەیری ئەو کێ هەس پەنای پێ بگری

با لە ڕێگەی لار بگەڕینەوە　　لە گێژگەی هەوا بپەڕیونەوە

بە ڕێگەی ڕاسا یەک دوو هەنگاوێ　　با بڕۆین ماڵمان خۆ خراو ناوێ

بینەوە حەڵقەی خاس و ڕاسەکان　　بکەوینە شۆن خواناسەکان

ڕوو بکەینە خێر لا بدەین لە شەڕ　　گۆشەی نەدامەت بکەین وە مقەڕ

بێژین بۆ عەفوی تەقسیر و گوناه　　استغفر اللە، استغفر اللە

بەڵکوو لەم ڕێوە بگەینە مەنزڵ　　دەس بکەینە مل ئارامەکەی دڵ

«زاری» لە کارا هەڵبگرە پایێ　　ئەم زۆروێژییە بە کارت نایێ

# ١

دڵــی ئاڵــۆز و شــێواوم هــەتا بــەختی لــە کــارا بــوو
هەمیشە جێگــەی ئــارامی لــە بــاغی وەسڵــی یــارا بــوو

ئەگــەر ئیقباڵــی وەرچــەرخا و رووخــا بــورجی ئــاواتی
دوچاری دەردی دووری بــەدری روخســاری دڵ ئــارا بــوو

بەهارێ پڕ ســەفا بــوو ئــەم وڵاتــەی ئێمــە تــا غونچــەی
جەماڵــی یــار لــەودا ئافتــاوی عالــەم ئــارا بــوو

بەهەشــتی پــڕ لــە نــاز و نیعمــەت و ئاســایش و شــادی
گــەداکانی بــە دارایــی یەکایــەک میســلی دارا بــوو

چەتوونی پاییزی بێ رەحمە ئــەو غونچــە ئەگــەر ژاکــان
عەوەز باغی بــە شــیوەنگــاه و خارســتان و خــارا بــوو

لــە ســەر تــەختی ســلێمان حاکمــێ دانیشــت دەمــزانی
وەکوو داوودە حوکمی، چــی زوحــاکی بــێ مــودارا بــوو

بە خوێنی بێگوناه ئەم موڵــکە وا رەنگــا کــە چــەنگیزیش
ئــــەکا هــاوار ئــەم کوشــتارە غــەدری ئاشــکارا بــوو

مەگەر ئەم عەسرە غــەیری قــەتڵ و غــارەت واجبێکــی تــر
نەبوو ئەمری کە پێ بکــرێ لــە لادێ یــا لــە شــارا بــوو

خــودا ئـــەو موفتییـــە رووزەردی دیـــوانی قیامـــەتکـــا
کە ئەم ئاوریــە هەڵگرســان و ئــەم فتــوای لــە زارا بــوو

گەلێ وەعدەی وەکــوو هــەنگوینی شــیرینان بــە عالــەمدا
وەلێ هەر قەترە هەر زەهرە لە گەڵ سەد کووپە ژارا بــوو

خــودا بیپێچیـــەوە ئـــەم ................کـــە بــۆ میللـــەت
نە هەر رۆژێ هەموو کاتێ لەگەڵ ســەدها خەســارا بــوو

بــە عــەدڵ و ئــەمن و ئاســایش ئەوەنــدە بانگــەواز کریــا
لە گەڵ زوڵم و درۆ و مــەکری بــێ حــەدد و شمــارا بــوو
بــە خــوێن ڕیــژی ئەساســێ دانەمــەزراوە دەوامــی بــێ
تەماشــای زاڵــمان کــەن لــە چــەرخی رۆژگــارا بــوو
بە کــۆچی ســەرو، لــەم گوڵــزارە مینــوو شــێوە بڕوانــە
کــە کێــو و دەشــت و شــار و دێ بــە گۆڕســتان رازابــوو
موکافـــاتی رەوییـــــەیی لاری خۆمانـــــە ئـــــەوی دەردە
درووس بــوونی لــە دایــەن کــاری ناهــەموار و لارا بــوو

## ٢

### هان دانی هاونیشتمانان بۆ وەرگرتنی ماف

تێبکۆشـــن بـــە دڵ بـــە دەس بـــە زبـــان
بـــە هـــەموو هێـــز بـــۆ لـــە دوژمـــن دان

ســـەبر تـــا کـــەی لـــە ئـــاوری زوڵـــما
لـــــە قـــــوڕاوی شـــــکەنجەدا خنکـــــان

تـــاکوو کـــەی ئەســـیر و ژێـــر پـــێ بـــین
هـــەر فـــەقیر و زەعیـــف و چـــاوەڕوان

بـــۆ بســـــووتین لـــــەم تەنوورەیـــــدا
بـــەس نییـــە برژیـــان و هەڵـــچۆقان

رۆڵـــەیی کـــورد دێـــرە مـــاتڵ چیـــت
باڵـــت هەڵماڵـــە راکـــە بـــۆ مەیـــدان

بـــۆ بڵـــێم تـــاکوو خـــۆ بناســـی بـــاش
شـــــێرن و بێشـــــەتانە کوردســـــتان

عەیبـــە رێـــوی لـــە بێشـــەی شـــێرا
بگـــەڕێ ســـەربەخۆ بـــدا فـــەرمان

شـــێر بـــێ جووڵـــە مـــات دانیشـــێ
ئـــەو خـــەریکی نچـــیر لانـــەولان

تـــاکوو ئەمـــڕۆ بـــە فێڵـــێ بێگانـــە
کەوڵـــی رێـــوی کرابـــووە بـــەرتان

ئـــەو تەلیســـمە شـــکا بەتاڵـــۆ بـــوو
خـــاوەنی وا ژیـــانی لـــێ بـــووە ژان

بـــەم هـــەراوی و پانییـــە دنیـــای
لا وەکـــوو قـــەبری تەنگـــە یـــا زینـــدان

جـــا ئەگـــەر مـــەرد و زیـــرەک و ژیـــرن
ئەمـــە مەیـــدان و گـــۆ ئەمـــەش گۆچـــان

تێکـــڕا نێـــر و مـــێ جـــوان و پـــیر
راپـــەڕەن تـــاکوو وەرگـــرن بەشـــتان

بێتـــو لـــەم کـــارەدا جیـــاوازی
بێتـــە بـــەین پـــڕ لـــە بـــا ئـــەبێ دەســـتان

پێشـــوانمان بـــە داخـــەوە مـــردن
رۆژگـــار فرســـەتێکی وای پێنـــەدان

مەیکەنە قیل و قاڵ و بۆچی و چۆن — یەک نەفەر یەک بەدەن بن و یەک گیان

چون جیاوازی نییەت و راوێژ — مڵک و میللەت ئەبا بەرەو فەوتان

یەکیەتی بێخی خایەنی هەڵکەند — وێڵ بوو کەس نەناس و سەرگەردان

بە دەسی یەکیەتی گرانتر کار — سەهل ئەبێ دەرد و زەحمەتە ئاسان

وای لەم عەسرە پڕ لە ئاشووبە — چی بە سەر هاتووە گەلی ئینسان

نییە دوو دڵ یەکێ بێ باوەڕیان — نییە دوو کەس یەکێک بێ رایان

عەیبە بۆ بەورەکانی ئەم خاکە — مامەڕێوی ببێتە ئاغایان

دەس بەنە دەستی یەکتر ئێرانی — فەرس و تورک و عەرەب لەگەڵ کوردان

کۆوە بن هەر وەکوو برای گیانی — یەک بۆ یەک ببنە یار و پشتیوان

دوڵەتێ ساز کەن نەیاندیبێ — بە خەو ئەسکەندەر و ئەنۆشیروان

بە کوێری دوو چاوی ئەو گورگە — رۆژێ مەڕ، رۆژێ کاوڕی ئەڕفان

بیستووتانە فایدەی دابێ — باغ بێ باغەوان و مەڕ بێ شوان

باخەوان و شوانی چا بگرن — تا بدەن باغ و مەڕ سەمەر پێتان

«زاری» هاوار کات یەک بن یەک — تا بە ئاسانی تەی ببێ رێتان

## ٣

### بانگەواز بۆ یەکیەتی

بگرن تا بگا بە مەتڵەب دەس — دایەنی یەکیەتی بە هەر دوو دەس

لە جیایی و تەفرەقە لادەن — بۆ ئەکەونە دوای دێوی هەوەس

ئەم جیاوازییە دوای خستین — ماینەوە بێ رەفێق و فریاڕەس

خوا یەک و دین یەک و پێغەمبەر یەک — ئەم قڕە و کێشە و هەرا بۆ چەس

لە خەتی موستەقیمی حوکمی خوا — نابێ کەس لابدا مەگەر ناکەس

بۆ دەوای دەردی پەرێشانیمان — «واعتصموا بحبل الله» بەس

سەددی فەرمانی «ادخلوا فی السّلم» — لە شەڕ و شۆڕ و سەرکەشی بەربەس

عەمەلی گەر نەکەین ئەم بەهرە — «ابد الدهر» خوار و پەستین پەس

تاوەکوو میسلی ئاو و ئاور بین — بە یەکۆ نالکێین نیو نەفەس

بۆ وەکوو ئاو و خاک ناسازن؟ ببنە مایەی ژیانی هەر چی هەس
جوانە دێوی هەوا بەرەڵلا کەین؟ مەلی عەقڵ و هۆش بکەینە قەفەس
کینە و بوغز و حەسوودی بۆ قەتعی ریشەی باغ یەکیەتین مەقەس
بە برایانی کورد بڵێ ئەی «زاری» بێژە با ئیختلاف بەس بێ بەس

## ٤

شوکور بۆ خودای یاریدەر کارسازی فەلا و کاریگەر
ئافتاوێ کە چاوەڕوانی بووین وا لە ئاسۆوە سەری هێنا دەر
ڕۆشنی کەوتە نیشتمانەکەمان تاریکی زوڵم و زۆری ها چووە دەر
مرد ئەو ئەژدها کە ئەیلووشی ڕۆژی سەد بێگوناهی خەستە جگەر
گورگ گوڕی گومە بە ئازادی لەم چراگایەدان بەرخ و مەڕ
نە قڕەی زاغ لە باغا ماوە نە دیارە هەڵۆی جووچک بەر
وەختی راوێژی گشتییە کە هەموو رێگەیێ بۆنەجات بگرنە بەر
شۆن فیز و هەوا و جاتەڵەبی مەکەون تا نەڕۆن بەرەو سەقەر
بۆ برایی خوێشی و خۆشی یەکتری حەوڵ دەن هەتانە ئەگەر
مەیلی بەربوون لە داوی بێگانە فکری دەرچوون لە راوی ئەفسوونگەر
چی برایی؟ برایییێ دینی نە برایی بڕێ ڕەگەز پەروەر
بنچینەیی یەکیەتی وەها دانێن کە نەگا پێی بە هیچ جۆر زەرەر
بۆ جڵەوگیری هەڵمەتی یەئجووج سەختتر بێ لە سەددی ئەسکەندەر
دابڕێژن لە دین دیوارێ کام دین؟ دینی پاکی پێغەمبەر
نە لە سەر خاکی بۆش و خۆڵەکەوە یا قوراوی بناغە رووخێنەر
لە قڕە کەی نەجات ئەدەن گەلتان تاوەکوو گیانی خۆ نەکەن بە سپەر
لە ئەمینی و زانستی و وەفا بۆ هەمیشە درووس بکەن سەنگەر
دوو زبان و درۆزن و خایەن ڕێ مەدەن بێنە ریزی ئەهلی نەزەر
مەسپێرن بە مادەپەرستان کار رشوەخۆران مەنێنە سەر دەفتەر
دەس بەنە باڵ ئەو هەژارانە کە نیانە خۆراک شام و سەحەر
کارگا لازمە موهەییا بێ تاکوو بێکار نەبن کاریگەر
بە هەژاران ئەگەر نەدەن کارێ لە ژیانا ئەکەون دەردی سەر

پیشەیێ فێر خۆنەواران کەن     عیلمی بێگاری دارێکە بێ بەر

من ئەبینم هەزار دیپلۆمی     زیرەک و هۆشیار و پڕ جەوهەر

ماتڵ و دەستەپاچە ناتوانن     کە بدوورن کراسێ بیکەنە بەر

تاکوو بێپیشە بین و بێوەستا     هەر ئەبێ بەندە بین و هەر نۆکەر

دەس بەنە دەستی یەک وەکوو مەردان     لەم بەرەو ژوورەوە راپەڕن بۆ سەر

چاوی میللەت بە جۆرێ بەسرابوو     هیچ کەس نەیئەزانی چۆنە خەبەر

تا بە جارێ تەواوی دارایی     دز رفانی بە جارێ بردیە دەر

ئێمە ماوینەوە بە مەزڵوومی     زاڵمی خستە بەر دەستی قەدەر

پای دز وا شکا بە لامانا     تازە مومکین نیە بکات گوزەر

ئەی برایان وەختێ ئەبنە پیاو     کە ببیسن نەسیحەتی رەهبەر

گەر گەرەکتانە ئاوەدانۆ بێ     نیشتمانی وێرانی پڕ لە خەتەر

خوێندن و پیشەسازی دەس پێکەن     غەیری ئەو خوێندنە کە بوو لەمەو بەر

خوێندنێ تامی خواناسی با     نەفعی بۆ گەل ببێ نە پڕ لە زەرەر

دەوڵەمەندی بە پیشەیە و زانست     نە بە شمشێر و گورز و زەرگ و تەبەر

پیشەیە پایەیی ئاوەدانی ملک     پیشەیە مایە بۆ ژیانی بەشەر

شاهی بێپیشە گەدایی سفرە     شاهی بێ تاج و تەختە کاریگەر

پیشەیێ گەر نەزانێ شاهەنشا     لە دزیدا ئەبێتە سەر دەفتەر

پیشەزانان شاهی مەملەکەتن     نە نەزان کارەکان بێ جەوهەر

«زاری» گەر پیشەیەکی ببوایە     نەئەبوو بە شوانی گا و کەر

## ٥

حەساوە خاتری خەستە و حەزینم     ژیاوە ئاوی چاوەی وشکی ژینم

لە زنجیر و کەلەپچە و جەور و ئازار     نەجاتی بوو وڵاتی نازەنینم

بڕا ئاساری نەگبەت لەم وڵاتە     بە شوکرانە لە سەر خاکە جەبینم

لە موڵکی شادمانیدا بە بێغەم     بە حەمدیللا کە ئەمڕۆ خۆشنشینم

جوانی هاتەوە جێگایی پیری     تماشا چۆپیکێشی هەڵپەڕینم

خوا بۆ تۆ سوپاسی بێنیهایەت     بە ئازادی خەریکی گوڵ چنینم

لــــە بـــاغی ئـــارەزوودا بـــێقـــڕەو قـــاو
پـــــیرۆزی خـــــواهی لاوانی موجاهیـــــد
برايـــــانی فیــــــدايی پێشكەشـــــتان
بـــە قوربـــانی زســـانێ بم، كـــە لـــەودا
نـــەبوو كـــارم لەمەوبـــەر غـــەيری «زاری»

چ تاغووتــــــێ؟ دژی دنیـــــا و ديـــــنم
لــــــە زاتی پـــــاكی «ربّ العـــــالمينم»
ســـلاوی گـــەرمی پـــڕ شـــەوق و بـــەتينم
بـــەهارێ وا بـــە چـــاوی خـــۆ ئـــەبينم
ئەوێســـا غـــەرقی شـــادی و پێكـــەنينم

## ٦

بـــڕا قەيـــد و شـــكا درگـــای زينـــدان
تلـــــووعی دا ئەســــێرەی رەســــتگاری
جەهەننـــەم بـــوو وەتـــەن دوێنـــێ ئەوێســـا
يـــەقين میـــوەی ئـــازادی بـــەری بـــاغ
بـــژی ئێـــرانی گـــەورە چونكـــە جێگـــای
وەرن بـــا پشـــتيوانی يـــەكتری بـــين
لـــە يـــەک جيـــا مەبنـــەوە چونكـــە جيـــايی
بـــە دەســـتی يەكيـــەتی هەڵـــكەندنی كێـــو
بـــزانن لـــەم جـــەهادەيـــدا خواتـــان
كـــە تێكۆشـــانە وا مايـــەی ژيـــانی
بـــەرەو حـــەق راپـــەڕن تـــەوفيقی بـــاری
بكۆشـــن چونكـــە دەس هێنـــانی ئـــاوات
سەروماڵـــی مـــن ئـــەی لاوانی كۆشـــا
زبـــــانی «زاری» بـــــۆ پيرۆزبـــــايی

تريقـــــەی پێكەنينـــــە و چەپڵـــــەڕێزان
درەخشـــانە، درەخشـــانە، درەخشـــان
گوڵســـــتانە گوڵســـــتانە گوڵســـــتان
شـــــەهيدانە، شـــــەهيدانە شـــــەهيدان
دلێرانـــــــە، دلێرانـــــــە، دلێـــــران
برايانـــــــە برايانـــــــە برايـــــان
زەرەرتانـــــە زەرەرتانـــــە زەرەرتـــــان
چ ئاســـــانە چ ئاســـــانە چ ئاســـــان
نیگەهبانـــــە، نیگەهبانـــــە، نیگـــــەهبان
وەتـــەنتانـــە، وەتـــەنتانـــە وەتـــەنتـــان
لەگەڵـــتانە، لەگەڵـــتانە لـــە گەڵـــتان
بـــە كۆشـــانە بـــە كۆشـــانە بـــە كۆشـــان
فيداتانـــــە فيداتانـــــە فيـــــداتان
دوڕئەفشـــانە دوڕ ئەفشـــانە دوڕئەفشـــان

# ٧

بــەهار ئەمســاڵ نــەیبوو زینــەتێ بــۆ بــاغ و گوڵــزاری
موعەتتــەل مــابوو بــۆ ئاڕایشــی ســارا و کۆســاری
نــە ســوور ئــاوێ جەماڵــی غونچــەکانی پــێ بــڕەنگێنێ
نە عەترێ بۆ وەنەوشەی سەرفگەندەی مات و غــەمباری
نە شانە تا شەواوی زوڵفی سەوزەی پــێ موڕەتتــەب کــا
نە سوورمە تا بــڕێژێ چــاوی نــەرگس بــۆ دڵ ئــازاری
بــە ناچــاری تــەقازای کۆمــەکی کــرد لــەم جوانانــە
کە یاری بەن بکەن کۆمەک بە خوێنی جەرگ بــۆ کــاری
قەبووڵــی ئــەم تــەقازا بــۆ جــەوانانی فیــدایی وا
بــە ســەریانا وەکــوو بــاران گوللــەی دوژمنــان بــاری
بە خوێنی سووری ئەم لاوانی هــۆزی کــوردە نووســراوە
لە هەر کووچە و شەقام و مــەنزڵ و هــەر دار و دیــواری
فەرامۆشی مەکەن ئەی هۆزی کورد ئــەم زوڵــمە تێکۆشــن
بــڕووخێنن بناغــەی دوژمــنی خــوێنمژ بــە یــەکجاری
هــەموو مەردانــە بازووتــان هەڵماڵــن بســێنن حــەق
لە شــاکردانی تــاغووتی و مــەئمووڕانی خوونخــواری
براکانــت لــە ســەنگەر دان و تــۆ ئاســوودە دانیشــتووی
ئەمە کەی شەرتە بۆیــاری و بــۆ مــەردی و غــەمخواری
ئەگــەر کــوردی کلاشــت پــێ کــە بــێ ڕێــزی برایانــت
لە خوا داوا کــە کۆمــەک تــا ئەگەیتــە شــاری رزگــاری
بەڵــێ بــۆبــاغی ئــازادی نــەمامی تــازە لازم بــوو
بنێــژرێ ریشــە قــایم کــات و بــاقی بێــت ئاســاری
بــە ســەد شــانازی بــۆ ئیجــادی بــاغێکی وەهــا پۆلــێ
لــــە لاوانی رەگــــەز خــــاوێن ئامــــادەی فیــــداکاری
لە گیانی پڕ لە شەوق و شۆری خۆیان بــۆ رەهــایی گــەل
بکــەن ئیجــاد بــاغی پــڕ ســەمەر بێــت و نــەمر داری
وەرە ئــەی باغــەبانی کــورد چــاودێری نــەمامت کــە
بە دڵ ئاگــات لــێ بــێ تــا نــەبێ کرمــۆڵ وەک «زاری»

مـــوعجیزاتی ئـــەم رەســـوڵانە خـــودا
زاهـــیری لـــەم مەعـــدەنی عیرفانـــە کـــرد

قـــەترەیێ بـــۆ دیـــنی هـــەر پێغەمبـــەرێ
حەق رەوانـــەی لـــەم چـــەمی ئیحســـانە کرد

کەســـبی روونـــاکی هـــەموو پێغەمبـــەران
یەک بە یەک لەم رۆژە نـــوور ئەفشـــانە کـــرد

دەوڵـــەتی دیـــدار و گـــەنجی ســـوحبەتی
هـــەر دوو رووی لـــەو تایفـــەی یارانـــە کـــرد

رۆژی روخســـاری لـــە هـــەر خاکـــێ هـــەڵات
بـــان و کـــۆڵانی مـــەلایک خانـــە کـــرد

ئاســـــەفێکی وایـــــە «زاری» کیمیـــــای
ســـوحبەتی ئـــەعرابی بـــەو خاســـانە کـــرد

## ١٧

حەجی فەقیرە جومعـــە هـــەر وەکـــوو فەرموویـــە پێغەمبـــەر
لـــــەم حەجـــــە فـــــەقیران هەتانـــــە یـــــەقین خەبـــــەر

بـــۆ دەوڵـــــەمەن خـــــودا حـــــەجی کـــــردووە مـــــەعلووم
ئێـــــوەن کـــــە هـــــەموو جومعـــــەیێ ئەکـــــەن ئەگـــــەر

لـــــە کـــــار دوو ســـــەعات ببـــــوورن لەبـــــەر ئـــــەدای
ئـــــەم فـــــەرزە بـــــۆ ڕەزای خوداوەنـــــدی دادگـــــەر

بـــــۆ مۆمینـــــان جەژنـــــە ئـــــەڕێژێ خـــــودا لـــــەوە
سەر ئـــەهلی دیـــن رەحمـــەت و فـــەزلی لـــە حـــەد بـــەدەر

ئـــــەی ئـــــەهلی دیـــــن کـــــردنی ئـــــەم نـــــوێژە چـــــاترە
لـــە گشـــت دەوڵـــەتی دنیـــا و هـــەموو کـــانی زێـــو و زەر

بـــێ عـــوزری شـــەرع تـــەرکی گونـــاهی کەبیرەیـــە
بـــۆ شـــاه و بـــۆ گـــەدا و بـــۆ بێکـــار و کاریگـــەر

ئـــەم نـــوێژە بـــە جـــەم لازمـــە بیکـــەین و نەفـــەوتێ
خۆمـــان بـــا نەکەینـــە دەســـتەچیلە بـــۆ ســـەقەر

زوڵـــمێکە ئـــەی بـــرای موسڵـــمان لـــە خـــۆت ئەکـــەی
فەوتانـــدی ئـــەم نـــوێژە لەبـــەر کـــاری بـــێ ســـەمەر

دارای لیباســـــی و لەشـــــت ســـــاغە توانـــــای
عیللـــەت چییـــە ئـــەم واجبـــە ئـــەچوێنی ئـــەی بەشـــەر

لە کوێوە هاتووی تێفکرە بۆ کوێ ئەڕۆی
بێ تۆشە ئەهلی هۆش، کەی ئەڕوات بۆ سەفەر

ئەمڕۆکە تێ بکۆشە ئابڕووت با نەچێ
ئەو ڕۆژە کە دیوانی کردەوەت ئەکەی نەزەر

یا ڕەببی بە ڕەحمەت بدە تەوفیقی ئێمە بۆ
ئەدای فەرزی خۆت و پەیڕەوی ئادابی پێغەمبەر

تۆ دەستی ئێمە نەگری لە بەحری گوناهدا
غەرقین نییە واسیتەیێ پێ بچینە دەر

سڵامی نوێژ کە دریاوە بڵاو بین، بکەن
داوای ڕزقی زۆر لە ڕەززاقی ڕۆزی دەر

بۆ ئێمە عارە «زاری» نەکەین خدمەتێ بە دین
هەر وەک ئەکەین خدمەتی کەوش و کەوا و پێچی سەر

## ١٨

غوباری خاکی ڕێگەت تاجە بۆ سەر
لە سایەی تۆوە دڵ کانێکە گەوهەر

فەقیرێکم پەناگرتوو بە زاتت
لە ئێستاوە هەتاکوو ڕۆژی مەحشەر

کە ناوت «رحمةً للعالمين»ە
بە قوربانت ئەکەم گیان و دڵ و سەر

دەمی بێ ناوی تۆ جسمێکە بێ ڕۆح
دڵی بێ مەیلی تۆ دارێکە بێ بەر

تکاکار و تکاگیراوی حەشری
بە تۆ دریا وەسیلە و ئاوی کەوسەر

هەموو پێغەمبەرانی گەورە یەک یەک
لە ژێر بەیداخی تۆدایە سەراسەر

شکۆفەی باغەکانی جەننەتی عەدن
بە خاکی شاری تۆ نابێ بەرابەر

بە گەردی بەخشش ناگەن ئەمیران
ببەخشن گەر وەک ئەو کێوانە گەوهەر

لە ئاسانەی جەلال و شەوکەتت دا
گەدایێ مل کەچن خاقان و قەیسەر

گەداکانی وڵاتی ئێوە نادەن
فەقیری خۆ بە سەد تاجی سکەندەر

لە تۆ داوا ئەکا «زاری» مورادی
کە هەر تۆ شک ئەبا بۆ ڕێگە ڕەهبەر

## ١٩

یـــا «ارحـــم الـــراحمین» بـــڕێژە ڕەحمـــەت بـــە ســـەر
«محمـــــد المصـــــطفی» ڕەسوولـــــی جیـــــنن و بەشـــــەر
ســـەر بـــاقی پێغەمـــەران و ئـــال و یـــارانی ئـــەو
هەر چاشت و هـەر نیمـەڕۆ هـەر عەسـر و شـام و سـەحەر
بـــڕێژە ســـەریان لـــە هـــەوری ڕەحمـــەتت دەمبـــەدەم
«صـــلاتی» بـــێ ئینتـــها ، ســـەلامی لـــە حـــەد بـــە دەر
ئـــەی تـــالبی مـــەدحی پـــڕ کەمالـــی «خـــیر الرســـول»
ئـــــەی عاشـــقی پەرتـــەوی جەمالـــی «خـــیر البشـــر»
گـــوێ بگـــرە ئەوســـافی دڵـــپەزیری ئـــەو ســـەروەرە
ڕەحمـــــی خـــــودا ڕاهنومــــا ، ئـــــەمانی ڕۆژی خەتـــــەر
بـــــەحری ســـــەفا و وەفـــــا شـــــەفێعی ڕۆژی جـــــەزا
هـــەم خاتـــەمی ئـــەنبیا هـــەم کـــانی فـــەتح و زەفـــەر
لـــە غـــەرق و حـــەرق و دمـــی نەهـــەنگ و داوی بـــەڵا
نـــــەجاتی نـــــۆح و خـــــەلیل و یـــــۆنس و بوالبشـــــر
کێـــوی وقـــار و ســـەبات و ســـەبر و شـــوکر و ڕەزا
چەشمـــەی حـــەیا و ســـەخا و عـــیلم و فـــەزل و هونـــەر
ئەسڵـــی وجـــوود و ئەساســـی زوهـــد و وەرع و کـــەرەم
ئـــەرکانی ســـدق و مـــرووەت ، حـــیلم و حـــەزم و حـــەزەر
بـــە هـــاتنی زاتی ئـــەم حەبیبـــە بـــۆ نەشـــری دیـــن
نـــە تـــەنها ڕەهبانـــە ، ئیـــبنی مەریەمـــە مـــوژدە دەر
لـــە بـــەحری عیلمـــی علـــوومی ئـــەنبیا قـــەترەیێ
ئـــەم ڕۆژە ڕوونـــە لـــە ڕۆژی تەلعـــەتی یـــەک شـــەرەر
فەســـــیحەکانی زەمانـــــە نوتقیـــــان بەســـــترا
لـــە دەرجـــی فکـــری کـــە دوڕی حیکمـــەتی خســـتە دەر
ئـــەنواری حوســـنی ڕەوییـــەی چـــاکی وەک ئافتـــاب
گـــرتی جنـــووب و شـــومال و خـــاوەر و باختـــەر
ڕەگـــی زبـــانی بەلیغـــەکانی یەکســـەر بـــڕی
بـــە تێغـــی بـــوڕڕای دەلیـــل و شـــیری ئایـــە و ســـووەر

خورشـیدی زاتی لــه مەککــە ئـەو دەمــەی وا هــەڵات
شۆ ڵــەی جەماڵــی بــە جــارێ عالــەمی گرتــە بــەر
بــێ بـاب و داک و موعــەللیم ئاشـنا بـوو بـە گشـت
ئــەخلاقی پــاک و تــەرەققی بەخشــی نــەوعی بەشــەر
ژیــا لەوێــدا بــێ کەسـبی خــەت و دەرسـی ئــەدەب
تــا جوبــڕەئیلی ئــەمین پــەیغامی هــاوردە ســەر
ئـەو بـوو بـە مایـەی هیدایـەت بـۆ تـەریقی نـەجات
ئــەو بــوو پایــەی ســەعادەت بــۆ ئەجننــە و بەشــەر
خولاســە ئــەولادی ئــادەم، ســەروەری ئــەنبیا
ئیمــامی پێغەمبــەرانی موڕســەل و موعتەبــەر
لــەوێ رەوانــە کــرا بــۆ ســەر عــەرەب و عەجــەم
یــانی خــەڵاتی رەفیعــەی بێعســەتی کــردە بــەر
دەســتووری دیــنی مــوبینی دەســبەجێ راگەیانــد
بــە مــەردومانی لــە حــەق و دیــنی حــەق بــێ خەبــەر
ئیســلامی ئەنســار لــەوێوە هەڵــکرا وەک چــرا
لــەوێ بـوو فــەرمانی گــەورەی هیجـرەتی هاتــە ســەر
لــە مەککــە دەعــوەت کـرا بــۆ ئەسـقا بـۆ مونتـەها
لــە ئاسمــان و لــە عــەرش و کورســی کــردی گــوزەر
بـۆ ئـەو بـوو بـێ واسـیتە کـەلام و روئیـەتی حـەق
بۆ ئەو بـوو روتبـەی (دنی)، بـۆ ئـەو بـوو شـەققی قەمـەر
وەزیفــەی خاســی ئــەوە «فاصـدع بمـا تـؤمر
ئــادابی راســی ئــەوە پەســەندی ئــەهلی نــەزەر
لە سووئی رەفتار و زوڵمی وجـوودی قـەومی قـوڕەیش
دڵــی کــە گــەردی مــەلال و میحنــەتی کەوتــە ســەر
لەگــەڵ رەفێقــی شــەفیقی غــارەدا دووبــەدوو
میســالی خورشــید و مانــگ رێگــەیان گرتــە بــەر
رووی کــردە شــاری مەدینــە رەحمــەتی دووســەرا
جــێ مــا بــۆ بەدخواهــەکانی زەحمــەت و دەردی ســەر
بــۆ شــادمانی نەکــەن بــەدر و بــەقیع و قوبــا؟
بـۆ نـەگری خـاکی حـەرەم کـە رۆحـی ئەڕواتـە دەر؟

حەسـرەت بـۆ کوفـاری نائومێـدە لـەم نیعمەتـە
خۆشـی بـۆ ئیسـلامە لـەم بەهەشـتە بـوون بـەهرەوەر
کەسـێ کـە ئـاهوو و گـورگی وەحشـی و سـووسمار
بێنـە زبـان و بـدەن بـە سـیدقی دەعـوای خەبـەر
بـە یـەک ئیشـارە لـە ڕەگ دەر بێـت و بێتـە حـوزوور
ڕێ بـۆ سـەلام و بچێتـۆ جێگەکـەی خـۆی شـەجەر
شـفای زەهـر بـێ تفـی، لـە بـەینی قامکیـەوە
ئەونـدە ئـاو هەڵقوڵـێ تێـر ئـاو بـێ سـەدها نەفـەر
لـە ئـێش و ژانی فیراقـی بێتـە ناڵـە و فوغـان
دارێکـی وشـکی بـڕاوی بـێ گـەڵاو سـەمەر
ئـەوەی بـە حـەقی نـەزانێ و بـاوەڕی پێـی نـەبێ
مەلعوونـە، شـەیتانە رووسـیایە و ئـەهلی سـەقەر
بە مشتە خۆڵێ کە خستی ڕووبـەڕووی قـەومی شـووم
گشت کـوێر و کـەڕ بـوون زەلیـل و خـوار، بـێ پـا و سـەر
چ خۆفـێ رووی تێـدەکا لـە حـەربی ئەعـدا کەسـێ
(واللـه یعصـمک) بـۆ ئـەو ببێتـە سـپەر
مەلەک سوپای بێـت و دەسـتی نەسـری حـەق یـاوەری
«روح الامـین»ی ڕەفێـق و هەمـدەم و هەمسـەفەر
نموونەیەکـە لـە خـوانی لـوتفی، بـاغی بەهەشـت
لـە تێغـی هەیبـەتی هـەر حـەو دۆزەخـە یـەک شـەرەر
خورشیدی بورجی رەسالـەت، شەمعی جەمعی ڕەسـووڵ
موختـار و مومتـاز و «مصـطفی» و والا گوهـەر
سوڵـتانی مسـکین نـەواز و شـاهی دیـن ئاشـنا
فـەقیری دارا غـوڵام و عەبـدی ئـەعلا قـەدەر
لـە خـۆفی تێغـی لـە ئەعـدا ڕۆژی فـەتحی مـوبین
گەیشـتە بـانی فەلـەک هـاواری (ایـن المفـر)
بـۆ بەنـدەگی ئـەم سوڵـتانی دینـە ئـەهلی حـەرەم
جـوان و پـیر و بچـووک و گـەورە بەسـتی کەمـەر
بـازاڕی لات و هوبـەل کەسـاس و بـێ مشـتەری
«منـات» و «عـزی» بی قـەدر و قیمـەت و قوڕبەسـەر

رۆژ هات و شـەو وەخـتی خـوی پێچـاوە، رۆی، نـەما
حـــەق هـــات و بـــاتڵ تـــەریقی عوزلـــەتی گرتـــە بـــەر
بـە دەسـتی وەحـدەت شـکا بـە یەکـدا جسـمی بتـان
بـــە نـــووری ئیمـــان بـــڕا لـــە بـــت پەرەســـتی خەبـــەر
لە گومڕەهی و لـە شـیرک و زوڵـم و جـەور و فجـوور
پـــاکۆ بـــوو کـــۆڵان و کووچـــە، رێگـــە و رێگـــوزەر
منـــەووەرە تـــا ئەبـــەد بـــەم نـــوورە «بیـــت الحـــرام»
مـــوزەووەرە، مـــەعموورە، گیـــانی تـــازەی هاتـــەوە بـــەر
سـەفا و زەمـزەم بـە سـەد سـەفا و سـەد زەمزەمـە
بـــە خـــاکی پـــای وەک مـــەقام و مو لتـــەزەم بـــەهرەوەر
میـزانی رەحمـەت ئەونـدەی رەحمـی حـەق لـێ رژا
پـڕ بـوو هـەموو حـەوش و مـاڵ و کووچـە و دەشـت و دەر
بـــۆ پێشـــواز و بـــۆ مـــاچی گـــەردی رێـــت
ئەسـوەد نزیـک بـوو لـە دیـوار دەرپـەڕێ بێتـە دەر
لـە تـاوی ئـەو کـۆچی ئێـوە ئـەی حـەبیبی خـودا
داوێـــنی مینـــا پـــڕە هێشـــتا لـــە خـــوێنی جگـــەر
چ خۆشەویســـێکە وا غوبـــاری نەعلـــەینی ئـــەو
«کحـــل الجـــواهر»ە نـــوورە، ســـورمەیە بـــۆ بەســـەر
دوعـــای دەوای شـــێت وهـــار و ئـــێش و دەرد و بـــەڵا
پـــەنای هـــەژار و غـــەریبی بـــێ کـــەس و دەربـــەدەر
ئەنیســـی داماوەکـــانی عـــاجز و بـــێنـــەوا
جەلیســـی ســـووتاوەکانی شـــەوق و دڵ پـــڕ شـــەرەر
دەســـتگیر و ئومێـــدی غەرقـــەکانی بـــەحری گونـــاه
دەلیلـــی رێگـــەی نـــەجاتی عاســـیان، لـــە خەتـــەر
ئەی رەحمەت، ئەی سەفوەت، ئەی ئەمانی ئەهلی خەتا
ئەی نیعمەت، ئەی عیسمەت، ئەی «نورالهدی» تـاجی سـەر
نیمـــە پـــەناهێ، ئومێـــدێ، دەســـتگیرێ بەغەیـــ
ـــری تۆلـــە حادیســـە و ســـووئی قـــەزا و قـــەدەر
ئـەم غـەرقی بـەحری گونـاهی خەجڵـەت و غەفڵـەتە
ئـەم گـیری داوی هـەوا ئـەم حـەق نەناسـە مەگـەر

نـۆحی شـەفاعەت و لوتـف و رەحمـەتی عـامی تـۆ
لـە گێـژی گێـژاوی بـەحری جـەهلی بێنێتـە دەر
یـا حـەی بـە حـەقی کـەلامی پـاک و ئایـاتی تـۆ
«تورات و انجیـل» ، «زبـور» «قورئـان» و جوملـەی سـوەر
بـە نـووری وەجهـی کـەریم و ناوەکانـت هـەموو
بە عـەرش و کورسـی و لـەوح و شـەمس و نـەجم و قەمـەر
بـە حـەقی پێغەمبـەرانی مورسـەل و موحتـەرەم
لـە خاتـەمی ئـەنبیا تـا نـۆح، تـا بوالبشـر
بـە ئـالی بـەیت و سـەحابەکانی پـاک و غـەیوور
مـوحیبی دیـن و عـەدووی کـوفر و تـەقوا سـیەر
سـەرانی ئەسـحاب، ئـەمیرەکانی «اولوالرشـد»
بووبـەکر و عوسمـان و عـەلی مورتـەزا و عومـەر
بـە پـیران و ئـەتباعی پەیـڕەوانی ئـەوان
بـە ئـەولیاکانی ئـەهلی زوهـد و وەرع و حـەزەر
یـاڕەب بـە حـەقی ئەوانـەی وا وتوومـە و ئـەوی
مـەحبووبی تۆیـە و لەوانـە فکـری مـن بـێ خەبـەر
ببـوورە لێمـان بـە رەحمـی بـێ ژومـارت خـودا
بمانبـە ماڵـی کـەرەم، مەمانخـە ماڵـی سـەقەر
بـە غـەیری عـەفوت خـودا نیمانـە رێگـەی نـەجات
بـە غـەیری رەحمـەتی تـۆ نیمانـە تۆشـەی سـەفەر
«زاری»م یـاڕەب بـە زاری لێـت ئەپاڕێمـەوە
ئـەم غـەرقی بـەحری خـەتا ببەخشـە بـە پێغەمبـەر

## ٢٠

یـا ئیلاهـی رەحمـەت بڕژێنـە سـەر
زاتی پـاکی حـەزرەتی «خـیر البشـر»
ئـەو رەسووڵـە وا خلیـل اللـە رجـای
کـرد تـا بێـت و ببێتـە راهبـەر
ئـەو رەسوڵـە وا «کلـیم اللـە» و مەسـیح
بـۆ زهـووری نـووری ئـەو دایـان خەبـەر
ئـەو رەسووڵـە وا لـە خـەلقت هەڵـبژارد
جەوهـەری ئینسـان و مومتـازی «مفـر»
ئەو رەسووڵە وا لـە نـووری ئـەو درووس
بـوو ئەسـێرە و رۆژی روونـاک و قەمـەر

ئەو ڕەسووڵە شەوڕەویت پێ کرد و هات
تا لە «سِدرە» تێپەڕی کردی گوزەر

«قم فانذر» وایە هەستان دانەنیشت
بێ عیبادەت لەحزەیێ شەو تا سەحەر

ئەوەڵێن شەمعی کە هەڵگرسا لە نوور
زاتی دانا و بینایی بێ بەسەر

«زاریا» داوا لە باری با بکەین
دایەنی ئەومان بخاتە دەس مەگەر

بێتە مەیدانی تکا خواهیش بکا
بۆ خەلاسیمان لە زیندانی سەقەر

بەم هیوا هاتینە ئاسانەت نەکەی
یا ئیلاهی ئەم ڕجایە بێ سەمەر

## ٢١

وەرن، سوێروو بە نەی، لەقلەق بە شمشاڵ
بڕازێنینەوە ئەم جەژنە ئەمساڵ

گەدەم دەریا ئەوەندەم خوارد حەسرەت
لە پێ کەوتم میسالی ئەسپی بێناڵ

بە ئاوازێ بکەن قەلبی نەخۆشم
لە خەڵتە و ژەنگی غەم وێنەی تەلا قاڵ

بەهارە جێژنی نەورۆزە دەبێ تەم
بڕۆ شادی بە سەر غەمدا ببێ زاڵ

موبارەک بێت جەژنی وا دڵ ئارا
لە پۆلی لاوەکانی خاوەنی ئێقباڵ

ئەوا پۆلی گوڵاڵە هاتە گوڵزار
سپی و سەوز و زەرد و ئاوی و ئاڵ

چریکەی بولبولی شەیدا لە سەر چڵ
دڵی لالەی بە جارێ کردە زوخاڵ

ئەتۆش موتریب بە ئاوازی دەف و نەی
دڵی مردووم تۆزێ بێنەوە حاڵ

لە گەڵ مندا زەمانە ئەونە تووشە
زوبانی بەستووم بۆ شەرحی ئەحواڵ

بدە ساقی لە ئاوی تاڵ جامێ
ئەڵێن بەو تاڵیە شیرین ئەوێ حاڵ

لە گەردن غونچەدایە دەستی بولبول
دەمێ رووی ماچ دەکات و دەفعەیێ خاڵ

ئەخوێنێتۆ سروودی عاشقانە
خەیاڵ و فیکر ئەکا یەک دەفعە پاماڵ

لە دەوری شەمعی ڕوخساری وەنەوشە
ئەسووتێنێت پەروانە پەڕ و باڵ

لە جەژنێکی وەهادا حەیفە شرکەت
نەکەن شێخ و مەلا و پیر و منداڵ

سەر و دەستی لە مل شمشاد دایە
بە زەوقی پێکەنین و ڕەقس سەرقاڵ

لە وێسانی قنووتایە سنەوبەر
وەنەوشە فەڕشی سەوزەی کردە پاماڵ

سەری ناوە سەمەن تاجی شکۆفە
وەکوو ئەهلی بەهەشتی شاد و خۆشحاڵ

نەمامانی چەمەن پۆشیویانە
لە ئیستەبرەق کە سەندی کۆت و شەڕواڵ

سەبا بۆ ڕەقس نەی دێنێتە جووڵە
بە سەد دەس هەڵئەسووڕێنێت دەسماڵ

بە هۆی ئەم جەژنە توججاری بەهاری
لە گوڵزارا هەڵیرێژاوە کۆتاڵ

لە چینۆ هات مشکی نابی پێیە
پەرەند و عەقد و مروارید و خرخاڵ

عەتر پاشی ئەکا شەونم هەموو شەو
لە هەر کێو و چیا و هەرد و لاپاڵ

لە باغا زیوەری بووکی بەهاری
بە خەرواره بە کۆگایە نە مسقاڵ

خەرامانێکە هەر سەروێ بە شێوە
وەکوو شیرینە گوڵبەرگی سپی و ئاڵ

لە سەحنی گوڵشەنا پۆلی گوڵاڵە
بە تەسبێحن هەموو سەرگەرم و ئەشغاڵ

تەماشاچی ئەڵێن «اللە اکبر»
فیکر سەرسام لەم سونعە و زوبان لاڵ

بە بێ‌پەرگار و بێ مادە چ وەستا
درووسی کرد گوڵباغ و دڕو و داڵ

ئەگەر دەهرە زەلیلی قەهری کێیە؟
ئەگەر ئاو و زەمینە کامە جەنجاڵ؟

ئەتۆ نەتوانی مێشوولە درووس کەی
بە خۆڕایی بە خۆ بۆ چی ئەدەی باڵ

عەقیدەی لارە لاری کرد رێگەت
ترنجانیویەتە شیو و دەڕە و چاڵ

وەکوو «زاری» بڵێ «اللە واحد»
نە «کفواً» هەس نەخێزان و نە منداڵ

## ۲۲

وەها گیراوی داوی شوغڵی دنیام
لە ئەوزاعت بە کوللی بێخەبەر مام

ئەتۆش جارێ هەواڵێکت نەپرسی
لە ئەحواڵی منی شێواو و ناکام

فەرامۆشت وەها کردم کە ناوت
لە سەفحەی خاترا یەکدەفعە فڕ دام

قەڵەم ئاگا بە سەهوێکی زلت کرد
چ مووریکم سولەیمان کا تەماشام ؟

بەهەشتی من دیداری دۆستانە
فەلەک ناری جەحیمی هیجری پێدام

لە گەرمی شەوقی دڵ مەغزم لە کەللە
نزیکە دەرپەڕێت و بێتە بەر پام

ئەترسم عاقیبەت ئەم شەمعی شەوقە
بسووتێنێ وەکوو پەروانە ئەعزام

ئەوی رەگ والە جەستەم دا یەکا یەک
ئەڵێ وەی‌وەی‌لە جەوری دەوری ئەییام

ئەوندەم گەردی میحنەت هاتە سەر تەن
بە خاک وخۆڵ مەستوورە سەراپام

بە رۆژا هەر وەکوو کۆندەی شەق و شڕ
لەبەر خۆرا عەرەق ئەڕژێ لە ئەعزام

هەتا دەستم ئەگاتە بەری مەقسوود
هەموو وەختێ وەکوو کەشتی لە ئاوام

فەلەک گەردێ لە دەردی کەم نەکردم
دووسەد بەردی لەیەک جامی ئەمەل دام

هەزاران کووپە و پیاڵەی شکانم
هەزاران جامی بادەی نابی رێژام

نیشانی دام ئەگەر نۆشێ لە خەودا
بە بێداری هەزاران نێشی لێ دام

هەتا کەی کەچڕەو ئەم بەرگی جەفایە
بە دەستی قەهر تەنگ ئەبڕی بە باڵام

ئەوا عومرم بە ئاخر هات ئاخر
لەمە زیاتر بەسە مەشکێنە مینام

دڵم گوم کرد و نازانم هەواڵی
وە کوو وەحشی بە بێ دڵ وێڵی سارام

ئەڵێن دڵ هەس، وەلێ من نیمە سەد حەیف
کەلامم بۆیە وا بێ تامە بێ تام

کەلامی دڵ وەکوو ئاوی حەیاتە
قسەی بێ دڵ تەعامی بێ مەزەو خام

بە دووی دڵدا لە گەردش دام و شۆنێ
نییە و نیمە قەرار و سەبر و ئارام

مەگەر ئیمدادی پیرانی «بیارە»
بە لوتفی خۆ خودا بیخاتە فریام

بە داوی هیممەت ئەم شابازە وەحشە
ببەستن باڵ و پەڕ رامی بکەن رام

«سـراج الـدینی سـانی» پـیری دووڕوو ئـەوەم کۆمـەک هەیـە بـۆ دیـن و دنیـام
لـــە بێـــدادی زەمانـــە نیمـــە «زاری» غـەمێ چونکـە لـە سـایەی ئـەو هومـا دام

## ٢٣

ساقی هەستە مـەی بـە کووپـە بێنـە بـۆم بـا لەمـە زیـاتر غـەمی دنیـا نـەخۆم
بۆ بە خـۆڕایی سـەرف بـێ نەقـدی عـومر چەنـــد رۆژێ ئێـــرە جێگامـــە ئـــەڕۆم
کـام ئەحمـەق عـومری وەک مـن رابـوارد وەی لـــە شـێوەی ئـادەمی بێگانـە خـۆم
غـــەیری کـــاری لار و ئـــەتواری قـــەبیح ئـەی نـەفس نیتـە ئـەمن رسـوا بـە تـۆم
دیـن و تـەقوا شـەرع و وەرع و سـوننەتم وەک ئەنگووسیلەی سولەیمان، خستە گـۆم
چم لە دەس دێ تـازە ئـەی خـاکم بەسـەر گـوێ گـران و چـاو کـوێر و پشـت کـۆم
عـــاجزی و سســـتی و بـــێ قـــووەتی هاتە جێگـەی هەڵـمەتی هـەر وەک هەڵـۆم
تێگەیشـتوو تێئـەگا نـەک بـێ شـعوور کـاری پـۆلا جـێ بـەجێ نابـێ بـە مـۆم
غافلانـە سـەد ئەسـەف بـێ مەنفەعـەت گەوهـەری قیمـەت گـرانم خسـتە چـۆم
هـیچ توججـاری مـنی نـاوێ بـە هـیچ وا بـە سـەر یەکـدا رزاوە تـان و پـۆم
روو بـە مـەنزڵ کـاروان ئـەڕوا کـەچی پێچەوانـــە مـــن بـــە رێگـــادا ئـــەڕۆم
دیـن وەکـوو دنیـا لـە دەسـتم دەرچـووە گەر بـە ئـاوی تەوبـە دەسنوێژێ نەشـۆم
یـا ئیلاهـی وا گـەڕامۆ سـەر شـەقام راســتی ئومێــدەواری عــەفوی تــۆم
کـێ هەیـە غـەیری ئـەتۆ عـەفووم بکـا تۆ دەرم کـەی ئـەی خـودا بـۆ کـوێ بـڕۆم؟
«زاری»یـا بـێ مەیکـەدەی «لاتقنطـوا» وا لـەوێـدا مەرهـەمی زامـی بـە سـۆم

## ٢٤

بـــێ رەفیـــق و غـــەریب وبـــێ یـــارم عـــاجز و دڵشـــکاو و غـــەمبارم
وام لـــە نـــاو دەســـتەیەکی وەحشـــیدا وا لـەگـەڵ عەمتـەرا سـەر و کـــارم
لەگـەڵ ئـەم قەومـەدا ئیلاهـی چـۆن زینـــدەگانی بکـــەم چییـــە چـــارم؟
دەسـتەڵاتم نییـە بـە سـەگ بێـژم چغـــە... لـــەم زیندەگیمـــە بێـــزارم
نییـە رۆژێ لـە کـاری بیدعـەتیان دەشـت و دەر پـڕ نـەکات هـــاوارم
ڕەشبەڵـەک حـەجی ئەکبـەرە لایـان گــەر بڵـێم وا مەکـەن وەکـوو خـارم
لـــە دڵ و جـەرگیان هەڵـئەچەقێم بـــێ شـــعوور و نـــەفام و هـــارم
دیـــن لـــە لادێ نـــەماوە ئاســـاری وا مـــەزانن درۆیـــە گوفتـــارم

کوفر ئەڵێ موشتەریم بێ حەدە    دین ئەڵێ ئاه بێ خەریدارم
وتم بۆ لا ئەدەی لە ڕێ کاکە    وتی چ بکەم بە نەفسە هەوسارم
وتم بێ دایرەی ئیتاعەی هەق    وتی بۆ نابی دەست بەردارم
پیرەدایک ئەڵێ بە قەولی مەلا    تێک نابێ بچێت ڕەفتارم
ڕەسمی باپیرەکان تێک مەدەن    ئەو نەزانە ئەمن خەبەر دارم
بەندەیی نەفسم و قسەت لەغوە    مەدە بێ سوود «زاری» ئازارم

## ٢٥

ئەوندەم وا لەسەر دڵ دووکەڵی غەم    وجوودی خۆم نابینم بە سەد شەم
بوخاری ڕۆژ ئەپۆشێ وا بزانن    هەناسەی دووکەڵاوی ئەمنە نەک تەم
لە سۆزێ وا لە سینەمدا پزیسکێ    بدا لەم کێوە بەرزانە بە یەکدەم
ئەتاوێنۆ بە سەر یەکدا ئەڕووخێن    وەکوو ڕووخاو سووتا تووری جەستەم
ئەسەف نەمکرد کارێ بۆ سبەینێ    بڕاوە ڕۆژگاری عومر کەم کەم
بە بێ دەسمایە، بێ نەقدی عیبادەت    ئەمن چارەم چییە ئەو ڕۆژە چ بکەم
خودا دەستم لە دامانی شەفیعێ    بئاڵێنە بە فەزلی خۆت موحکەم
لە تەوفیقت چرایێ گەر نەدەی پێم    بە تاریکی چلۆن ئەم ڕێگە تەی کەم
گرفتارم بە دەس نەفس و هەواوە    ئیلاهی داد لەو سەرکێشە، وەی لەم
هەوا گەردن شکێن و نەفس غەددار    ئەمن بێ دەستەڵات و دەستەپاچەم
ئەگەر یاری نەکا، موشکوڵ گوشایێ    لە داوی وان ئەبێ خۆ چۆن بەردەم
سەبەب ساز و سەبەب هەر تۆی یارەب    ئەدی بۆ کوێم ئەنێری، ڕوو لە کوێ کەم؟
خودا بۆ خاتری ئەسمای حوسنا    بە ئەوسافی کەریمە، زاتی ئەکرەم
بە پاکانێ کە غەیری بەندەگی تۆ    نیانە هیچ فیکر و غایلە و هەم
بە مەستانی جەماڵی لایەزالی    بە ناوی پاک و مەشهوورت بە «اعظم»
بە شاهی سوبح خیزانێ لە شەرما    لە سەر ئەژنۆیە ئەبرۆیان و قەد خەم
بە ئەسراری قەڵەم نووسی لە لەوحا    بە لەوحێ وا لەوا ڕووداوی عالەم
بە سڕڕی حەرفی ئەو «ام الکتابە»    لە وێوە نووری مونزەل هاتە سەر دەم
بە سەردارانی ڕۆحانی و ڕۆحی    کە «امراللە»یە، اللەیە بە ئەعلەم
بە دەستەی ئەنبیاکانی موقەددەس    لە ئادەم تا خلیل اللە و خاتەم
بە ئایات و کتابێ هات بۆیان    هەموو دەرسی خودا ناسین سەرجەم
بە ڕۆحی پاکی مەدفوونی مەدینە    «علی روحە صلی اللە و سلم»
بە ئالی تاهیرین و گشت یاران    خەلیفەی «ئەووەڵ» و «دوو» و «سێ» و «چوارەم»
بە زەووارانی کەعبەی ڕوکنی ئەسوەد    مەقام و حوجرەی ئیسماعیل و زەمزەم

بـە ئـاوی چـاوی مـەردانێ لـە خۆفـت
ئـەبارێنن لـە هـەوری دیـدە دەمـدەم
بـە حـەققی پەیـڕەوان و ئـەولیاکان
شـەهانی بائیمـان و «غـوث الاعظـم
ببـووره لـێم زامـاری گونـاهم
کـە عـەفوی تویـە بـۆ زامـار مەرهـەم
سـیاکارم، سـیانامە سـیاڕوو
لـە نامـەم دایـە بێعـاری هـەموو جـەم
ئیلاهـی تـۆ ئـەزانی تـا چ حـەددێ
گونـاهم بـێ ژمـاره و تاعـەتم کـەم
ئـەپاڕێمۆ لـە قـاپی رەحمـەتت دا
پـەناهێ غـەیری رەحمـت شک کـە نابـەم
نەکەی «زاری» لە رەحمـی خـۆت بـێبـەش
کـەلامی پـاکی خۆتـە «و هـو ارحـم»

## ٢٦

بـە تـۆ ئـەگرم پـەنا رەبـبی غـەفوورم
لـە مـەکری نەفسـی ئـەممارەی شـەروورم
مەگـەر رەحمـی ئـەتۆ یاریـدەرم بـێ
وەئـیللا غـەرقی گێـژاوی قسـوورم
بـە رێگـەی لارەدا ڕۆیـن هـەتا کـەی
مەگـەر مـن دەسـتەچیلە بـۆ تـەنوورم
لە دەس ئـەم نەفسـە سەرکێشـە خـودا، داد
چییـە چـارەی دڵـی خاڵـی لـە نـوورم؟
لـە دەفتـەرما نییـە یـەک زەڕڕە تاعـەت
لـە شـەڕدا خـاوەنی سـەدها کـرووورم
«یـدی بیضـا»ی ئـەوێ دۆزینـەوەی رێ
لـە سـەرگەردانەکانی دەشـتی تـوورم
ئـەوەی مایـەی ژیـانم بـوو بـڕاوه
لـە توغیانایـە سـەرچاوەی غـورووورم
بـەهارم پایزێکـە پـڕ تـەپ و تـۆز
کلیلـە بـەفره کێـوی شـارەزوورم
شـەو و رۆژی بەسـەرما دێـت و ئـەڕوا
میسـالی داسـە، عـومری پـێ ئـەدوورم
نەبەسـراوه هـەتا رێگـەی هەناسـە
هـەتاکوو مـاوه ئیـدراک و شـعوورم
هـەنگاوێ هەڵـگرم چاکـە بـەرەو حـەق
بـدەم حـەولی جـەوازێ بـۆ عبـوورم
بـە سـەر ئـەو پـردەدا بـێ خـۆفی کـەوتن
بـە تـەوفیقی ئیلاهـی رابـوورم
بـە غـەیری شەرمەسـاری نیمـە «زاری»
رەفیقـی رێگـەیی وا چـۆڵ و دوورم

## ٢٧

گێژەڵـووکەی پـایزە یـا خـۆ تـەپ و تـۆزی دڵـم
وا هـەوا تاریکـە ناناسـم نیشـانی مەنزڵـم
بـەم هـەوا تاریکـە لـەم وێرانـەدا سـەرگەرمی چـیم
وەی چ بـێ فیکـر و چ بێهـۆش و چ گێـژ و غافڵـم

کــــاروان وا تێپـــەڕی ڕۆیشـــت و نـــازانم ئـــەمن
لـــەم گوزەرگـــادا خـــەریکی چـــیم و بـــۆچی ماتڵـــم
جـــەژنی کـــۆچی ڕۆژووە ئـــەو کەســـانە وا بـــە قـــەدر
مانگی ڕۆژوویـــان ڕەوانـــە کـــرد بـــێ نەقســـی زوڵـــم
جا بە ئەمنی رووسیا چی! جـــەژنی وا گـــەورە و بـــەڕێز
هـــەر بـــەزم، پـــڕ بـــێ لـــە بێعـــاری لەوێـــدا داخڵـــم
نەوبـــەهاری زینـــدەگی کۆچـــانی کـــارێکم نـــەکرد
حەسرەتا بـــۆ زینـــدەگانی بـــێ بـــەر و بـــێ حاسڵـــم
مەدرەســـەی ئەقڵـــم نـــەدیوە وا لـــەڕێما ســـەد گـــرێ
ئـــاه بـــۆ ئامووزگـــارێ وا کـــە حـــەل کـــا موشکوڵـــم
کەسبی ئینســـانی بـــە شـــاگردی ئـــەقڵ ئـــەکرێ ئەگـــەر
نەبمە شـــاگردی لـــە کـــوێ ئینســـانم و کـــەی ئاقڵـــم
شـــوێنی زانایـــێ نەکـــەوتم فێـــری زانســـتێ بـــبم
ئـــەی خودایـــا ئـــەم نەزانیمـــە نەبێتـــە قاتڵـــم
عومرم ئـــاوا گـــەر بـــە غەفڵـــەت بگـــوزەرێ وا تێئەگـــەم
تـــا درێژتـــر بـــێ زیـــاتر جاهیـــل و ناکامڵـــم
خەســـتەگی بـــۆ کـــاری دنیـــایی، لەجەســـتەمدا نییـــە
چی لە ئـــەمری دینـــەدا، بـــێ تاقـــەت و بـــێ تامڵـــم
بـــەرگی تـــەقوا وا دڕا، پینـــە لـــە تاقەتـــدا نـــەما
گەر شەمی «لاتقنطـوا» شۆڵـــە نەخاتـــە ســـەر دڵـــم
«زاریـــا» ڕاســـت ئـــەوێ بـــێ ئـــاوری تۆبـــەی «نصـوح»
لەم تەنوورە سەردەدا قەت پوخـــت نـــاوم، ناکوڵـــم

# ٢٨

بە ئاخر هات دەورەی زیندەگانیم  دوچاری دەردی زەعف و ناتەوانیم

لە داری قامەتی دا بەرقی پیری  دەری هێنا رەگ و ریشەی جەوانیم

لە قەددی رێکی وەک ئەلفم بە دیققەت  تەماشا کە چ دالێکی کەوانیم

کە ئەم بادی خەزانەم هاتە گوڵزار  وەری بەرگی گوڵاڵەی شادمانیم

سەرم لەرزۆک و ئەفکارم پەرێشان  بە ناکامی عەوەز بوو کامەرانیم

بینایی دیدەکانم لێڵە، گوێ کەڕ  زەعیف و زەرد، وەک بەرگی خەزانیم

لە پا کەوتم وا پا تازە دەگرم  عەسا پامە رەفێقی هێزی پا نیم

سپیدی موو لە قەولی پیریۆ پێم  ئەڵێ ئاگابە من دەردم دەوا نیم

بەهاری عومر پامالی فەنا بوو  فەنا رێمە بە ئومێدی بەقا نیم

وەکوو کافوورە موشکی ئەزفەڕم چی  خەتا پۆشاکی بالامە خەتا نیم

غورووبی کرد خورشیدی جەوانیم  لەبەر تاوم لە تاریکی شەوانیم

قواکانم خەریکی کۆچن و من  وەها نازانم، ئەسڵەن کاروانیم

وەفاییکم نەبوو بۆ فەڕز و سوننەت  بە فەڕز و سوننەتی خۆم ئاشنا نیم

لە کێوی سەر، هەلات «الشیب نوری»  دڵم تاریکە دارای «ضیا» نیم

دەمی پیری دڵا وا هات تا کەی  نەکەم شەرمێ مەگەر ئەهلی حەیا نیم

بە ئێخلاسم نەنا سەر خاک روو قەت  چلۆن بێژم خودایا رووسیا نیم

لە دەس چوو عومرم و نەمکرد کارێ  لە داوی تەمبەڵی ئانێ رەها نیم

چەماوە پشت بۆ تەعزیمی پیری  جەوانی پشتی کردە پشتیوانیم

لە پەنجادام وا سەد لۆچی تێکەوت  تەوێڵی وەک بلووری راسەقانیم

لە قەبر و کفن و تابووتم ئەکا باس  زبانی حاڵی ئەعزاکانی فانیم

لە تاوی ئێشی پشت و لاق و ئەژنۆ  خەریکی ئاه و ناڵە تا بەیانیم

ئەوندەم گەردی غەفڵەت وا لە سەر دڵ  لە عومرێکا سەعاتێ بۆ خودا نیم

ئەسەف بۆ عومری رۆیشتوو بە غەفڵەت  بە بێ فیکری و جەهل و لێ نەزانیم

ئەگەر بێتو خودا بەم دەردە سەختە  نەکا رەحمێ بە ئومێدی شەفا نیم

ئەتۆ یارەببی«رحمن الرحیمی»  ئەمن عەبدێکی کەچ رەفتار و جانیم

ئیلاهــی غــەیری عــەفو و رەحمــەتی تــۆ
مــــنی بێچـــاره دارای پـــەنا نـــیم

پەشـــیمانم، پەشـــیمانم، پەشـــیمان
لــە کــردەی زشــتی پــەنهان و عــەیانیم

ئــەوا خــۆم خســته قــاپی رەحمــەتی تــۆ
کــە ئیــدی جێگــەیێ تــر شــارەزا نــیم

بــە فەزڵــی خــۆت بمبەخشــە ئەگــەر نــە
بــە کــرده لایــەقی عــەفو و عــەتا نــیم

لــەم ایــەی تاعــەتا گــەرچی فــەقیرم
لــە ئیمانــا شەهەنشــام و گــەدا نــیم

لــە مــەردانی خــودا دووریم ئەگــەر کــرد
مــوحیببی غــەیری مــەردانی خــودا نــیم

شوکور دوورم لــە یــەئس و ئــەمن هــەر دوو
هــەتا زینــدووم بــێ خــۆف و رجــا نــیم

چلــۆنم دەرئەکــەن «زاری» مەگــەر مــن
ســەگێکی پەیــڕەوانی «مصــطفی» نــیم؟

## ٢٩

### هەر دەقیقە، هەر زەمان

یــارەب لــە هــەوری رەحمــەت بــڕێژە وێنــەی بــاران
ســەر رۆحــی پێغەمبــەر و ئــال و تــەواوی یــاران

بــە یــاری نــاوی خــودا ئەخوێنینــەوە بــە گیــان
مەولوودنامــەی پــڕ ســەفای نــەوەی «نــزار» و عــەدنان

بــەری دوعــای ئیــبراهیم مــوژدەی مەســیح و کــەلیم
رەهنومایێکــە دڵســۆز، پێغەمبــەری ئیــنس و جــان

لــە زەمــانێکۆ بەشــەر رێیــان گــوم کردبــوو یەکســەر
ســوجدەیان لــە بــەرد ئــەبرد، لــە ئەســتێره و ئاسمــان

عــەقڵ وەهــا شــێواو بــوو حــەیا شــۆنی نــەمابوو
بــە دەوری «بیــت اللــه»دا ئەگــەڕان رووت و عوریــان

زیندەبــەگۆڕ ئــەکرا ئەغڵــەب کچــی بــێ خــەتا
ســەدها رەسمــی نــاڕەوا بــوو بــە جــوزئی مەزهــەبیان

نــەمابوو لــە دیــنی حــەق هــیچ نیشــان و ئاســارێ
هەر خوێن ڕێــژی بــوو ئــایین، هــەر غــارەت و هــەر تــاڵان

بــۆ دەفعــی ئــەم زوڵــماتە کــە ســەرمایەی نەهاتــە
نەســیمی لــوتفی خــودا بــزووت و کەوتــە جــەولان

تلــووعی دا بــە روخســار زاتی سەراســەر ئــەنوار
«محمـــد المصـــطفی» خاتـــەمی پێغەمبـــەران

وەختـــێ ئـــەم ڕۆژە هـــەڵات ڕۆشـــنی خســـتە وڵات
حەق هاتــەوە جێگــەی خــۆی، ناحــەق بــە جــارێ فــەوتان

بڕوانـــە لـــە ئـــادابی چـــەن دڵـــبەرە و دڵ ئـــاوێز
هەر عیففەتە و هەر عیسمەت، هەر نەسرەتە و هەر ئێحسـان

هــەر کەرەمــە و هــەر لوتفــە هــەر ڕاسیە و هــەر غــیرەت
هــەر حەملەیــە بــۆ ئەعــدا، هــەر دەعوەتــە بــۆ ئیمــان

«زاری» وەرە بـــا بێـــژین بـــۆ خـــاتری ئـــەم زاتـــە
یـــاڕەبی بمانبەخشـــە ئـــەو شـــافیع و تـــو ڕەحمـــان

## ٣٠

مەکـــەن ڕەشبەڵـــەک، ئـــەی موسڵـــمانەکان
مەئاڵـــێنە یـــەک خـــانم و خانـــەکان

جڵـــەوتان نەکێشـــێ هـــەوا بـــۆ ســـەقەر
فریبتـــان نـــەدا نـــەفس، دێوانـــەکان

مەکەونـــە تەڵـــە و داوی مـــەکری هـــەوەس
مەکـــەن پەیـــڕەوی پیرەنادانـــەکان

بـــە فتـــوای کـــێ ڕەشبەڵـــەک بـــوو حـــەڵاڵ؟
چ شـــەرعێک ئـــەی خـــزم و بێگانـــەکان؟

بەمـــە ڕازییـــە نێرومـــێ پێکـــەوە
بکـــەن ڕەقـــس وەک ورچـــی کوێستانەکان

بـــە تێغـــی جـــەفادا مـــەدەن جـــەرگی خـــۆ
مەکـــەن تـــەرکی ئـــایینی ڕێ زانـــەکان

وەکـــوو وەحـــش بـــۆ تێکەڵـــی یـــەک ئـــەبن؟
چ ڕەسمێکـــە ئـــەی شـــێوە شـــەیتانەکان

ژن و پیـــاو فـــڕەدەن لیباســـی حـــەیا؟
بڕەقســـێن وەک مەســـتی مەیخانـــەکان؟!

مەگـــەر دەربەســـی ئابـــڕوو نـــین، ئـــەدەن
بـــە دەس غـــەیرەوە دەســـتی کابانـــەکان

نەڵـــێن کـــەس بـــە ئێمـــەی نـــەوت وا ئەڵـــێم
مەکـــەن کـــاری وا لار حەیوانـــەکان

دەس و پەنجـــە و ڕوومـــەت و چـــاو و لێـــو
بـــە ئـــاور مەســـووتێنن ئـــەی جوانـــەکان

ئەمـــە شـــێوەی ئادەمییـــەت نییـــە
ڕەوییـــەی شـــەیاتینە ئینســـانەکان

نـــەکا خـــوا بـــڕێژێ بـــە ســـەرتاندا
غـــەزەب میســـلی فیرعـــەون و هامانـــەکان

ئـــەوا پـــێم وتـــن کـــەیفی خۆتانـــە، ئـــەی
بـــرا ســـم خـــرە پشـــت مـــل پانـــەکان

لـــە «زاری» هـــەموویان عـــالمترن
وەلـــێ کـــوێرە چـــاوی هـــەوەس ڕانـــەکان

## ٣١

خەجاڵـــەت نـــابی ئـــەی دڵ وەک منـــاڵان
بـــە خـــۆڕایی ئـــەدەی عـــومرت بـــە تـــاڵان

بـــە خـــۆڕایی ئـــەتۆ توونیـــت، هۆشـــت
بـــە خۆتـــۆ بـــێ، مـــەچۆ ڕیـــزی بـــەتاڵان

کـــەڕی، نابیســـی دەنگـــی «بمپەرســـتن»
پەیاپـــەی دێتـــە گـــوێی ســـاحیب کـــەماڵان

تەکانێ دە بە دووی خاوەن دڵانا — بڕۆ بێ دەر، لە حەڵقەی بەد خەیاڵان
پەرێشانی بە ئەحواڵت ئەبەخشێ — دەوامی تێکەڵی ئاشوفتە حاڵان
لە قەسری بەرز مەڕوانە ئەوانەی — لە قەسری بەرزەدا خەوتن لە چاڵان
لە شیرینی ژیانن دوور و بێ بەش — کەسانێ هەر کە لەم دنیایە ئاڵان
لە پیری مەدرەسەم دوێ بیست فەرمووی — چییە دنیا؟ جەماڵی بێ جەماڵان
کەنارێ لەم رەش و ڕووتانە بگرە — بنەت بێنە محەللەی گەورە ماڵان
لە پیریدا بەدەن لەرزۆک و گوێ کەڕ — لە ساغی بەش بڕاو و زار و ناڵان
لە هەشتا تێپەڕیوی عەیبە «زاری» — تەرک ناکەی رەوییەی هەژدە ساڵان

## ٣٢

گەر وەکوو عیسا بچینە ئاسمان — قەورە خەوگا بۆ خراو و خاسمان
داد لەم کردارە لار و ناڕەوا — وەی لە گوفتەی ناحەز و ناڕاسمان
ئا ئەمە کەی غیرەتە بۆ ئەهلی دین — خاوەنی دڵمانە «الخناسمان»
یادی«ئاخر» خۆڵە خاتردا نەما — غەرقی دنیایە هەموو حەوواسمان
وەک لە بازاڕا لە مزگەوتیشەدا — زیکری دنیایە تەواوی باسمان
من کە شێتم تۆ خودا پێمی بڵێ — کێیە حەقگۆ کامەیە حەق ناسمان
ئاه «زاری» موشکڵە رێگەی نەجات — گەر نەکا لوتفی ئیلاهی پاسمان

## ٣٣

ڕووناکی چاو و دڵمان
ئیمامی ئەنبیاکان
لەداری بێ هێز و گیان
وەک دێوانە ئەچەرخان
چوبوونە شکڵی شەیتان
هەر کوفران بوو هەر توغیان
دووکەڵی شیرکی فەوتان
خولاسە نەسڵی ئینسان
هەر رەحمەتە بۆ هەموان
هەر موژدەیە بۆ ئینسان
ئەو ناجی و تۆ رەحمان

## ٣٤

لــە ڕۆژێکــۆ کــە پــێم نــا عەرســەیی دنیــا هــەتا مــردن
پشوویێکم نەدا نەمدی بــە غــەیری ڕەنــج و میحنــەت مــن
خەلاســی لــەم قــوڕاوی عالەمــە نــابینم ئــیللا مــەرگ
ئەویش بۆ ئەو کەسانە هەر کە حەق لوتفی لەگــەڵ کــردن
بــە زاهــیر باغــە، گوڵــزارە بــەهارە، «جنــت المــاوا»
بــە بــاتن نــارە، مــارە عەقرەبــە بــۆ ئــادەمی گەســتن
فــریبی خــەت و خاڵــی بــێ وەفــای وا مــەخۆ شوغڵــی
لەگــەڵ چــاک و خــراوا دەســبڕینە و ئابــڕوو بــردن
کــە دنیــا خۆشــی ئــاوا بێــت و تــام و لــەززەتی ئــاوا
پەشــیمانە ئــەوەی خۆشــی بوێــت و پــی نەڵــێ دوژمــن
کەسێ لــەم باغــەدا میــوەی لــە داری ئــارەزوو نــەخوارد
دەخــیلم تــاکوو ئــەتوانن مــوحیبی دیــنی ئەحمــەد بــن
ڕەوییەی غەدرە دنیــا، میهــری قــەهرە، ئاشــتی جەنگــە
بە خاسییەت میسالی زەهرە شەهدی بــۆ بەشــەر کوشــتن
هــەتاکوو مــاوی «زاری» نابــێ چــاوەڕوانی ڕاحــەت بی
لە تۆی خاکا مەگەر دەس با بە بێ غەم لــەحزەیێ خــەوتن

## ٣٥

تۆ نــەبووی، بووی و نابیــت وئــەبیتۆ، دوا نــەبوون
عالــەمێ فەرمانبــەری تــۆ و ئــەتۆ فــەرمانەبــەر
جەهلــە ســەرپێچی لــە ئــەمری پادشــاهێکی وەهــا
بــۆ لــە کــۆچی ڕۆح ناکــەن بــەرگری ئەوســاعەتە
بــۆ ئەبــەد مــانی بەشــەر دەسناکــەوێ ڕێ، ڕاکــە زوو
وابــە کۆڵــی تــۆوە ئــەوبارەی کــە ئــەرز و ئاسمــان
ئەی لــە بــێسەبری درووس کریاوی، نــادانی شــەروور
هەملەگەڵ خۆت هەم لەگەڵ ئــەو عالەمــەی تێــدا ئــەژی

بگــرە گــوێ بــۆ بیســتنی «کــلٌّ الینــا راجعــون»
وای ئەگەر گوێ شــل نەکــەی بــۆ«یاعبــادی فــاتقون»
هەرکە نەتوانێ لە موڵکی یەک قەدەم بچیــە بــیروون
دێتـــە دەر دەڕوا و «انـــتم حینئـــذ تنظـــرون»
ســەر شــەقامی ڕاســی حــەق«السـابقون الســابقون»
تاقەتی هەڵــگرتنی ئــەویان نــەبوو ژێــری نــەچوون
نائـــەمینی کردنـــت بـــەم بـــارە بێدادێکـــە ڕوون
پرســیارت لــێ ئەکــەن حــەتتا لــە پــەنهانی دەروون

بەم هەموو نادانی و بێ سەبری و بێ هێزیە  بۆ ئەبێ یاغیگەری پیشەی بێ ئینسانی زەبوون

هیچ تێفکریوی ئەو وەختەی ددانێ دێتە ئێش  زیندەگانی تاڵ ئەبێ نامێنێ ئارام و سکوون

سەبریئەبیووبیدەوێ هەڵگر، هەتاکوو ئاقیبەت  وەرگری مشتێ لە خەرمانی «یوفی الصابرون»

والەگەڵتا کیسەبڕ، ئاگا بە تالانت نەکا  فێڵە بازە، خایەنە، غەددارە، مەککارەو چەتوون

دایەنی هیممەت بەلادا کە، مەترسە، راهی راست  بگرە بەر تا مەنزڵی خاڵی لە خۆفی «آمنون»

لەم لەوەڕگادا ئەوی لاچوو لەبەر چاوی شوان  گیری چنگاڵی درندەی توورە و بێ ڕەحم بوون

بۆ لە ریزی شارەزایانا ئەوێسی «زاری»یا  یانیها نەتبیستووە مەیڵێن ئەوی «لاتفعلون»

## ٣٦

ئەی ساحیبانی دین، برایانی موسلیمین  وا مانگی رۆژوو هات بەرەو پیری با بچین

مێهمانە، قەدری واجبە لە سەر موکەللیفان  بە زیکر و فیکر و تاعەتی مەولایی عالەمین

مانگی نزوولی رەحمەتی پەروەردگاری عالەمە  مانگی قبووڵی عوزر و تۆبەیە بۆ جەمعی تائیبین

ئەم مانگە هەر ئەو مانگەیە کەلامی خودا لەوا  نازڵ بووە سەر حەزرەتی سەرداری موڕسەلین

ئەم مانگە هەر ئەو مانگەیە کە حەربی بەدر لەوا  کرا و بوو بەدری منەووەر هیلالی دین

دارای شەوی قەدرە کە باڵاترە جەزای  لە یەک هەزار مانگ عیباداتی عابیدین

فریشتەکانی ئاسمانی ئەو شەوە بە ئیزنی  خودای گەورە لە گەڵ رۆح دێنە سەر زەمین

مەشغووڵی تاعەت و حەمد و سەنای زاتی پاک  خودان تا بەیان لەگەڵ جەمعی ساڵحین

هەستن لە خەوی غەفڵەت و بێدار ببنەوە  بێنۆ کە عەبدی خودا بین و غوڵامی هەوا نەبین

ئەم نەقدی عومرە حەیفە کە بێهوودە بگوزەرێ  تۆشەی نەجات واجبە ئەمڕۆکە هەڵگرین

یادێ لە مەرگ وقەبر و سوئالات و خۆفی رۆژ  حەساب بۆ نەکەین مەگەر ئێمە نامرین؟

بۆ راهی وا درێژ و پێچ پێچ و پڕ خەتەر  بێفکری تۆشە قەت نییە ئینسانی دووربین

تا عومر باقیە کارێ بکەن کە بێ عەمەڵ  نەدراوە بە کەس وەعدەیێ بۆ جەننەتی بەرین

کەشتی نەجات چاکەیە،نەک کردەوەی قەبێح  رۆژی عوبووری خەلق لە دەریای ئاتەشین

بێنۆ بچینە دایرەی ئەم دینە حەققە با  ئەهلی بەهەشت بین و جەحیم و سەقەر نەچین

بەم رێگە راسەدا خودا! بە رەهبەری رەسووڵ  بمانبە ناو مەنزڵی بێ خۆفی «آمنین»

بۆ تۆیە نوێژ و تاعەت و مەرگ و حەیاتمان  «ایاک نعبد» یا رەببی و «ایاک نستعین»

بێ غیرەتییە «زاری» تەنەففور لە دیانەت  بۆ ئێمە ئەگەر پەیڕەوی دینی موحەممەدین

## ٣٧

بـە هـەر دوو دەس ئـەبێ بـۆ قـوڕ نـەپێوین
بـە سـووڕەت ئـادەمی و کـردە دێـوین

لـە دەشـتی بـێ شـعووریدا بەرەڵـلا
لەگـەڵ جـەهلا برایـەکی حەسـێوین

ئـەبێ بـۆچی لـە جێگـەی چاکـەدا گـوم
لـە هـەرلا بیدعـەتێ بکـرێ لـەوێ ویـن

ئەگـەر ژن نـین و پیـاوێکی بەڕاسـین
لەگـەڵ یەکـدا ئـەبێ بـۆ وەک هـەوێ ویـن

بـە قـانوونی مـرووەت یـەک بەیـەکمان
سـزاواری تـف و تانـە و جنێـوین

مـەلا! بـۆ ئەونـە سـەرگەرمی بـە دنیـا
خەلیفـە بـۆ ئەوەنـدە شـێوە رێـوین

چییـە ئـەم قوولـە قوولـە کاکـە دەروێـش؟
لـە نـەورۆزۆ هـەتا زسـتان کێـوین

بـە دڵـتانا خـودا کـەی دێـت سـۆفی
سـەراپا غـەرقی دەریـایی پەشـێوین

خەیاڵـی پاسـی ئەنفاسـت محاڵـە
بـە ئـەحوالی بەتاڵـۆ و پـای چێـوین

بـە تـەقوا مامـە حـاجی! نـەک بـە مێـزەر
لـە حـەیوانات ئـەبێ ئێمـە جـوێ ویـن

بـە گشـت ئـەعزا خـەریکی شوغڵـی دنیـا
وەلـێ بـۆ دیـن موویـێ نـابزێوین

بـە غـەیری کـردە، نیمانـە رەفێقـێ
لە وەختێکـا کـە بـۆ مەحشـەر بـەڕێ ویـن

مەکـەن بـۆ ماڵـی دنیـا کلکـە سـووتێ
هەتاکـەی مەسـخەرەی ئێـرە و ئـەوێ ویـن

ئەگـەر هـەر مێزەرێکـی زەردە حـەجمان
موکەللـەف بـۆ بـە خـەرجی زێـڕ و زێـوین

کـەتانێ زەردی قیمـەت، سـێ پـەنابات
لـە سـەر ئاڵـێنە گـەر حـاجی بـە نێـوین

مەڵـێ خـەرفاوە «زاری» شـێتە دێـژم
لـە سـەر ئـاوین ئـەمما وشـک لێـوین

## ٣٨

سـەدەف بـەو دورە وەختـێ بـەهرەوەر بـوو
سەدەف ساحیب، موسەممەم بۆسـەفەر بـوو

ئەجـەل گـرتی یەخـەی عـومری لـە رێـدا
دوچـاری مـەرگی پـڕ ئـێش و خەتـەر بـوو

گوڵـی بـاغی سـەفا بـێ باخـەوان مـا
گڕی حەسرەت لە بـەڕڕ و بـەحر بـەر بـوو

زەوی مـات و هـەوا پـڕ ئـاه و ناڵـە
فەلەک شێت و مەلیک دڵ پـڕ شـەرەر بـوو

کـە ئامینـە ژنـەوتی ئـەم قەزییـە
لە فرمێسک، یەخـەی غـەرقی گوهـەر بـوو

ئەگـەرچی کـەیلی حەسـرەت بـوو دەروونی
بـە شـوکرانە زوبـانی پـڕ شـەکەر بـوو

وتی یـــارەببی تـــۆ خـــۆت ئاگـــەداری
کە نـووری هـەر دوو چـاوم بـێ پـدەر بـوو
لـــە خـــاکی غوربـــەتا شـــاراوە وەک گـــەنج
لە عیففـەت ئـەو لیباسـم وا لـە بـەر بـوو
حەســـاری بـــەرزی ئومێـــدم لـــە ناکـــاو
بـــە لافـــاوی فـــەنا زێروزەبـــەر بـــوو
حەوالـــەی حیفـــزی تۆیـــە یـــا ئیلاهـــی
دوری ئەســـباب، ئیجـــادی بەشـــەر بـــوو
زەمانـــێ ئـــەم «نـــەبی» بـــوو هـــەر کـــە ئـــادەم
لە بوونی خۆی و نەسڵـی بـێ خەبـەر بـوو
پـــەنا بـــەو شـــایە بگـــرە «زاری» هـــەر کـــە
لـــە ئێعجـــازی یـــەکێ شـــەققی قەمـــەر بـــوو

## ٣٩

بەراتێکـــــە خـــــودا، رۆژی بەراتـــــە
نمێ لـەو ئـاوی سـەر چەشمـەی حەیاتـە
چ ســـەرچاوەی حـــەیات ئـــەو زاتـــە پاکـــە
کـــە درگـــاوانی ئـــەنباری عەتاتـــە
لـــە گوڵـــزاری وجـــوودا هەڵـــبژێریاو
خۆلاســـە و بەرگوزیـــدەی کائیناتـــە
دەلیلـــی رێ نـــەزانانی پەرێشـــان
جڵەوکێشـــی خـــەلایق بـــۆ نەجاتـــە
(رســـول اللەیـــە بـــۆ ســـەر ماســـوی اللـــە)
خـــەتیبی خۆرنشـــین و خۆرهەڵاتـــە
وەرە ئەی دڵ سەرت دانێ لـە سـەر خـاک
دەری ئـــەم ئەحمـــەدە شـــیرین ســـیفاتە
بـــە دوو دەســـتی رجـــا داوێـــنی بگـــرە
بڵـــێ عالـــەم بـــە ئومێـــدی رجاتـــە
ئەگـــەر «زاری» غوڵامـــێ بـــێ وەفایـــە
ئـــەتۆ دوو کـــەون مـــەرهوونی وەفاتـــە

## ٤٠

برێژە رەحمەت خودا پڕ هـەرچی دەشـت و دەرە
سەر ئەو رەسووڵەی کە قازی رۆژەکەی مەحشەرە
ئەم جەژنە جەژنی لـەدایک بـوونی پێغەمبـەرە
جەژنی زهـووری جەماڵـی سـاحیبی کەوسـەرە
ئەی ئارەزوومەندەکانی بیسـتنی وەسـفی ئـەو
گوێ بگرن و دڵ بدەن بە مـەدحی ئـەو سـەروەرە
نووری خودا بوو کە هـات و عالـەمی گرتەبـەر
شوعاعی رۆژی ئـەوە هـەرچی کـە شـوعلەوەرە
وەختـێ کـە ڕۆژی وجـوودی هاتـەدنیا، درا
بە بەحر و بەڕ موژدە، لەو سوڵتانە موعتەبـەرە
کاهینـەکانی عـەرەب وتیـان لـە دایـک بـووە
ئەمشەو رەسووڵێ ئـەکا بتخانـە بـە مەسـخەرە
سوڵتانی مێعراجە ساحیب تاجە هـات و ئـەچێ
بو عەرشی ئـەعلا دێنـێ لـەوێ ئـەوی خەبـەرە
تاهایـە، یاسـینە، نـوورە، رەحمەتـە، سـەفوەتە
مەحموودە، موختارە، موستەفایە نەسـرەت دەرە

سوڵتانی«اسرا»یە شایە، حامیدە، ئەحمەدە
ئەسحاب وئەتباعی پاک وچاکی ئەویەک بەیەک
داوێنی پاکی ئەو و ئەسحابی هەرکەس کە گرت
رۆژی موورادە تلووعی داوە«زاری» وەرە

شەفێعی رۆژی جەزایە تاهیرە ئەتهەرە
لە خۆفی رۆژی جەزا بێ ترس و دەردی سەرە
بێ شک نەجاتی ئەبێ لە زەحمەت و خەتەرە
داوێنی لە دەس مەدە بە ڕەحمە، غەم لابەرە

## ٤١

مەبە مەغروور بەم موددەی ژیانە
لە بەینی بەردە ئاشی ژێر و ژوورا
لە خول دایە پەیاپەی خەڵک ئەهارێ
ئەبێ ئینسانی زیرەک بۆ فەرامۆش
قەساب ئامادە بۆ کوشتار و پەروار
بە سەرمانا دەمادەم مەرگ ئەبارێ
سەرم سووڕ ماوە تێناگەم لە مردن
کە بەم جۆرە سەراپا غەرقی دنیان
تەماشا! هەر هەنگاوێ هەڵئەهێنن
لە کوێدا خەوتوون باپیرەکانت
لە تۆی خاکا بە رووتی راکشاون
دوو سێ رۆژێکی تر«خواهی نەخواهی»
ڕەفیقی لازمە ئەم چۆڵگایە
لە خەوگاهێکی ئاوادا بە تەنها
بە غەیری پەیڕەوی قانوونی ئیسلام

میسالی ئارد ئەتهاڕێ زەمانە
بەنی ئادەم وەکوو گەندوم وەهانە
بە پیریدا دیارە نۆرەمانە
بکا ئەم ئاشە سەرگەرمی گەڕانە
سەری تا شانی غەرقی کاو و دانە
وەلێ ئەم بارشە قەترەی نیهانە
ئەمانیان کەی وە دەس هێنا ئەمانە
ئەوی خۆفی قیامەت بێ نیانە
بەرەو مردن ئەڕۆن ئەم زیندووانە
لە خەوگایان بڕوانە و بزانە
زەوی هەم فەڕش و هەم پاڵشتیانە
لە وێدا تۆش ئەنووی بێ گومانە
شەمی پێویستە، ئەم تاریکسانە
کە جێگەی پرسیار و ئیمتیحانە
لەوێدا «زاریا» چی پشتیوانە؟

## ٤٢

مایەی حەیاتی ئادەمی هەر چاکە کردنە
بە کاری چاک بەشەر چاترە لە وەحشییات
ژیانی خۆش ئەزانی چیە ئەی خاوەنی ژیان
سەرکەوت لە کارا و گەیشتن بە ئارەزوو
راستی بە کاردێت ، درۆ رووڕەشی ئەدا
نەجات کاکە بە زۆر و بەزەڕ نییە فەقەت
ئەم لاریانە لە تۆدا هەیە ئەی «زاری» عیللەتی

مردن بە کاری چاک براکەم نەمردنە
بێ چاکە زیندەگی بە هەدەر سەرف کردنە
لە کاری چاک سستی و پشت هەڵنەکردنە
وابەستەی داوا لە خوداوەند کردنە
خواری، بەری ئەمری غەڵەتی نەفس بردنە
لەداوی مەکری دێو خۆ بە حەق سپاردنە
دووری لە فیکر و پەی بە حەقیقەت نەبردنە

## ٤٣

جـــەژنی مــــەولوودی پێغەمبەرمانــــە
جـــەژنی مـــەولوودی تـــاجی ســـەرمانە

جـــەژنی مــــەولوودی خۆشەویســـێکە
بـــۆ چوونــە بەهەشــت ئــەو رەهبەرمانــە

جـــەژنی زهـــووری زاتێکــــی وایـــە
پـــەناو پشـــتیوان بـــۆ مەحشـــەرمانە

جـــەژنی لـــەدایک بـــوونی کەســـێکە
لـــە حـــەوزی کەوســـەر ئـــاو پێدەرمانــە

باعیســـی ئیجـــاد تـــەواوی خەلقـــە
قـــووەی بینـــایی بـــۆ بەســـەرمانە

رەحمـــەتی دنیـــا و قیامـــەت ئـــەوە
وەســـیلەی نـــەجات لـــە ســـەقەرمانە

هـــەر ئـــەو بـــەکار دێ داوێـــنی بگـــرین
بـــۆ هـــەر موشکولـــێ کـــە لـــە بەرمانــە

شـــوکور، ئۆمـــەت و مـــوحیبی ئـــەوین
شـــــەریعەتی ئـــــەو رێگوزەرمانــــە

بـا بیکـەین بـە ویـرد ئـەم شـێعرە «زاری»
بـــۆ دەردی ســـەختی دەروون، دەرمانـــە

ئـــەو تکاکـــارە ئـــەو ســـەروەرمانە
پێغەمبەرمانـــــە و تـــــاجی ســــەرمانە

## ٤٤

لە شادی بێ بەشم، بێ یار، خاتر پـڕ لـە زووخـاوە
مەگەر بۆحەسرەت و غوسسە و خەفـەت هاتوومـە دنیـاوە؟

خودا رەحمێ نەکانەمکا بـە خـاتر شـاهی لـەولاکی
دڵـی بـێ چـارە ئـەم دەفعـە نـەجاتی قەتعـە لـەم داوە

خودایا جوودی تۆیە رەهبەری دڵ بۆ تەمـەننا لێـت
پـەنای بـۆ زاتی تـۆ هێنـاوە ئـەم دەردەی لـە سـەر لاوە

پەناگرتوو بەزاتی پاکی تۆ مەعلوومـە، مـەحفووزە
لە هـەرچی باعیسـی ئـێش و پەشـێوی قـەلبی شـەمزاوە

خودا بۆخاتر ئیسـم و سـفات و زاتی بـێ هـەمتات
کـە زانـاتر، لـە ئیـدراکی ئـەوا سەرسـامە دامـاوە

خودا بیکە بەخاتری حەزرەتی مەحموودیموختـارت
لـە بـەر جلـوەی جەماڵـی ئـەو کـە ئـەم دنیاتـە دانـاوە

به خاتر خۆشەویسان و هــەموو پاکــان و چاکانــت
ئـــەوی مەردانـــە واریـــد بوونـــە ئاســـانەت ئـــەوی مـــاوە
مورادی خاترم حاسـڵ کـە، ئـاواتم بـە جـێ بێنـە
نەسـیمی لوتفەکـەت، بجوێنـە ببـڕە هەڵـقەی ئـەم داوە
زەلیلم، بێ کەسم، بێ دەستەڵاتم نیمە غـەیری تـۆ
پـەناهێ کۆمـەکێ بـۆ چوونـە دەر لـەم گێـژی گێـژاوە
وەکوو یۆنس کە«زاری»غەرقی بەحری بێمورادی بوو
دەری بێنـــە بـــەڕەحمی خـــۆت، هـــەرتاکوو نـــەخنکاوە

## ٤٥

عـــاجزمئـــەیدڵ بـــە دەس ئـــەفکاری غەفلـــەت زاتـــەوە
بـۆ لــە عالــەم بــێ خەبــەر مــاوی و خــەو ئەتباتــەوە؟
بــێ بــەرەو پــیری بــڕۆ ژیرانــە بــۆ دەرکــی «فیــوض»
«شــیخ الاســلام»ی ســەقز ئێــژن لــە حــەج وا هاتــەوە
بەڵـکوو لــەو رەحمــەی بــە ســەریانا ڕژا رۆژی تــەواف
پڕشـــنگێکت لـــێ کـــەوێ ناپـــاکی، پاکـــت کاتـــەوە
خاکی بـەرپای ئـەو موبـارەک تینەتـەم وەخـتی تـەواف
لــــەم بــــرا دامــــاوە جــــێ ماوانەیــــە لا کاتــــەوە
خۆزگە بەو شەخسە موەففـەق بـوو بـە وێسـانی ئـەوێ
چـون بـە ئـاوی تەوبـە ژەنگـی مەعسـیەت ئەشـواتەوە
سـینە پـڕ ئـاە و جگـەر پـڕ سـۆز و خـاتر پـڕ ئومێـد
تــا بــە چــاوی مەرحەمــەت حــەق ئــاوڕی لــێ داتــەوە
گەهــ تەوافی بـەیت، گاهـێ هـاتوچـۆی مـەروە و سـەفا
گــەهـــ لــە زەمــزەم خــۆ بشــۆرێ، گــاە لی بخواتــەوە
گەهـــ لــە روکــنی ئەســوەدا گاهــێ مــەقام و مولتــەزەم
بـــۆ حسووڵـــی ئـــارەزوو دەســـت بـــەرزۆ کاتـــەوە

گەهێ لەسەرخاکی حەرەم دانێ تەوێڵ و چاوەڕێ
ڕێژەوی لوتفێ لە لایەن «قاضی الحاجاتەوە»

گەهێ لە میـنـادا بپـاڕێتۆ بە زیللەت تا خودا
دەفعەیێ تر فرسەتی ئەم زیارەتەی پێ باتەوە

گـاه «لبیک طواف الرکن» و گاهێ رەجمی دێو
گەهێ رەوییەی بابی گەورەی خۆی ئەحیا کاتەوە

بازگەشتت خێر و ئەعمالیحەج و عەمرەت قبووڵ
حەق وەسیلەی چوونەوەت دووبارە بۆ رێخاتەوە

ماڵ کەی مەقسوودە خاوەن ماڵە ئەی «زاری» مزوور
ئاه دووری، هەق بە رەحمی خۆ نزیکت کاتەوە

## ٤٦

قەساوەت بۆ شەقاوەت رەهنومایە
سەداقەت بۆ سەعادەت کشتگایە

حەسادەت حاسڵی هەر ئێشە و ئازار
عەداوەت باری هەر دەرد و بەڵایە

نەسیبی بووبەکر بوو «سوف یرضی»
بەشی «عبدالعزی» «تبت یدایە»

خەڵاتی عوممەرە «لوکان بعدی»
بەراتی بووجەهل «العن و لضحایه»

مەنێ کۆڵت ئەوی حەممالە ئەینا
کە هاتوو نات خنکانت جەزایە

نەسەب نابێتە مایەی پێشکەوتت
لە کاری چاک ئەگەر نەتبێت مایە

لەتەقوا تۆشەیێ هەڵبگرە «زاری»
کە ماڵ و کەسب پاماڵی فەنایە

## ٤٧

قوتبی زەمانە دەروێش! ئاگایە، ئاشنایە
چ ئاشنا کە مەنزوور جەنابی موستەفایە

تەردید لابە، شک بەس! بەهانە مەگرە، بگرە
دامانی، با لەدەس دەرنەچێ چرایە، شایە

شۆڵەی «ضیاء» لەمەوبەر بە رەحمەتی ئیلاهی
کەوتبوە سەر وەتەنمان ئەم شۆڵە و (ضیایه)

پێویستە بۆ هەموو کەس لە ئەهلی دین ئەمڕۆ
کەسبی موراد لەم کا، ئوستادە، شارەزایە

وەلی هەزار حەسرەت ئەمجەمعی خەلق و غەوغا
کەمتر بۆ دینە، زیاتر بۆ نەفس و بۆ هەوایە

سەدها نەخۆش رۆحی زەخماری ماری هەوا
«زاری» یەکێ مداوای نەکرد بەم دەوایە

## ٤٨

هــەوری رەحمــەت لەســەر هــەموو جێیــە
«ارحـــم الـــراحمین» ئەگـــەر تـــۆ نیـــت
عالـــەمت خســـته شـــۆنی «ادعـــونی»
چـــاوەڕێ بۆزهـــووری لـــوتفی تـــۆم
ئاورێکـــــت لەســـــینە بـــــەرداوم
لـــەم شـــەرارەی ســمـــوومی هیجرانـــە
بۆتکـــا بۆحســـوولی مەقســـوودم
ســـاخودا بەوحەبیبـــە نـــازارەت
ئـــارەزووی «زاری» لەگـــەل جێمـــاو

داگـــری ئـــەهلی شـــار و لادێیـــە
«و هـــو ارحـــم »لـــە یووســـفا کێیـــە
«اســـتجب یـــا الهـــی» لـــە کوێیـــە
مـــن کـــە گێـــژاوی میحنـــەتم جێیـــە
دوودی ئـــەو شـــەوقی قـــەیس و لەیلێیـــە
دڵ وەکـــوو «مـــاوزڕ»لـــە ســـەرپێیە
رۆحـــی پـــاکی محەممـــەدم پێیـــە
ســوێن ئـــەدەم خـــۆت ئـەزانی ئـەو کێیـە
بێنـــەجێ عەبـــدی حەڵـــقە لـــە گوێیـــە

## ٤٩

ئـــەم دەف وتـــەپڵ و دمـــەک لێدانـــە
تیـــغ لـــە خـــۆدان و بـــەرد هەڵلووشـــین
وا ئـــەزانم ئەمانـــە تـــۆ ئەیکـــەی
خـــواردنی ماڵـــی لـــەروو دامـــاوان
هـــەدەرە و بـــێ ســـەمەر ئـــەوی کـــارێ
بـــاغی تەقوائـــەزانی بۆوشـــکە؟
وادیـــــارە ئـــــەتۆش وەک «زاری»

ئـــەی خەڵـــیفە پەســـەندی شـــەرع نییـــە
هـــیچ دەخڵـــی بـــە ئەســـڵ وفـــەرع نییـــە
غـــەیری ئـــادابی ئـــەهلی ســـەرع نییـــە
شـــێوەی ئـــەهلی زوهـــد و وەرع نییـــە
کـــە بـــە میـــزانی راســـی شـــەرع نییـــە
خـــاکی دڵ موســـتەعیدی زەرع نییـــە
خەبـــەرێکت لـــەبابی وەرع نییـــە

## ٥٠

تێبگـــە هۆشـــت ئەگـــەر قاســـر نییـــە
بـــۆ لـــە نێوچـــوونی رەوییـــەی قـــادری
ئـــەم هـــەموو هـــاوارە ئەیبیســـی، بـــەری

فـــەرقی دێوانـــە لەگـــەڵ قـــاتر نییـــە
هـــیچ ئـــازارێ وەهـــا قـــادر نییـــە
غـــەیری ژەنـــگ وقســـوەتی خـــاتر نییـــە

کەیئەمە زیکرە؟ بە قانوونی «تەریق» — دڵ لەگەڵ دەمدا دەمێ حازر نییە
قاڵبی نارێک، خشتی بۆ بەننا — لایەقی دیواری خۆڕاگر نییە
ئەم وەزیفە کاری سوڵتانی دڵە — کاری زەرگ وخەنجەر و ئاگر نییە
نادرێکی پێ دەوێ ئەم مەعرەکە — خۆ هەموو هەوشاریێ نادر نییە
لادە لەو لالێژە بێرۆ سەر شەقام — وا مەزانە رێ لەوە چاتر نییە
بێخی دەروێشی کە تەقوایە برا — هیچ تەقوایێ لەوا زاهیر نییە
بۆ سەماعی (یا عبادی فاتقون) — «زاری»ا ئەمڕۆکە گوێ ڕاگر نییە

## ٥١

دەروێش بێ دواوە لەگەڵ جێ ماو و لە دوای
ئەو رێگە چەوتە چۆڵە، ئەگەر بە بیر و بڕوای
بێ ڕیزی هۆشیاران بزانە بۆ چ کاریێ
درووس کراوی، تا کەی خەریکی کاری بێجای
دێوانە وا مەزانە ئەم کارە پرچە یا ڕیش
هەتا وەها بی هاوتای گوێدرێژ یا گای
بەهای و هووی‌و هەی هەی، بەم رەقس و هەڵپەڕینە
عالەم هەموو ئەزانن مەیموون و ورچی سارای
ئەدەب، برای دینی ئەساسە بۆ تەریقەت
مادام بێئەدەب بی لە رێگەی لای و گومڕای
نووری ئەدەب لەدڵتا شۆڵەی نەماوە بۆیە
بە قوولە وا ئەزانی میسالی غەوسی بەغدای
سەدها نوێژی فەرزت چواند و نەتگەڕانۆ
لە گەڵ هەزار غەفڵەت خەریکی زیکری ئەسمای
ئەی وشک مەغزی داوێن بە ئاوی ئارەزوو تەڕ
مەزانە وای لە بەڕدا بەوانە غەرقی دەریای
بە تەپڵ و دەف، دڕاوی ئەم دینە پینە ناوێ
بێ دادگای ئیسلام بزانە چەندە رسوای
گوێ بگرە تۆ لە «زاری» ئەبێ هەتا وەها بی
بە ئارەزووی دێوی لەعین، دوور لە خوای

## ۵۲

ئەی ئامینە موژدە بێ تۆ دایکی پێغەمبەری — چاوەی ئاوی حەیاتی کانی دوڕ و گەوهەری

ژنانی دنیا هەموو خۆزگە بە تۆ ئەخوازن — چونکە ئەتۆ حامیلە بە سەیدی بەشەری

یاڕەب موبارەک‌بێ لێت بەشێ کە خوا داویە پێت — موژدە بە تەشریفی دێت سەروی باغی دلبەری

ها وەختە بێتە دنیا «محمد المصطفی» — دنیا رۆشن کاتەوە بە روخساری ئەنوەری

نوری چاوی ئادەمە، رەحمەتی دوو عالەمە — بۆ ئەنبیا خاتەمە وجوودی بێ سێبەری

تەواوی پێغەمبەران لە ژێر بەیداخی ئەوان — موحتاجی لوتفی ئەون مەلەک، ئینسان‌و پەری

لە عالەمی ئەرواحا مەقاماتی چون تەی بوو — با بێتە دنیا بیدا فەرمانی ئەسکەندەری

«زاری» دڵ لە گەڵ گیانی ئەکا بە گوێزەبانی — سەر و ماڵم بە قوربان خاک و خاشاکی دەری

## ۵۳

لە داوی غەفڵەتا بۆ وا ئەسیری — تلووعی دا ئەسێرەی سوبحی پیری

خەیاڵی خاوە لەم داوە رەهایی — نەکا گەر لوتفی باری دەستگیری

لە حاڵی خۆ کە بڕوانی ئەزانی — میسالی تاڵی موو تێکەڵ هەویری

بە دووی حیرس و هەوادا غار تا کەی؟ — ئەگەر قاروونی، بێ تاعەت فەقیری

ئەگەر مەردی خودایی و بۆ خودایی — شەهی، گەرچی گەدا و بێ حەسیری

بە جاە و ماڵ و دارایی مەنازە — بە دوویانۆیە لافاوی زەویری

بکە بڕوا پاماڵی زەواڵی — ئەگەر دەروێش یا خاوەن سەریری

شکا سەد قەسر وەک ئەیوانی کیسرا — دوایی دێت شاهی و وەزیری

لە هەشتا تێپەڕیوە عومر و هێشتا — بە کردە شیر خۆری و سەغیری

بە سەر یەکدا رزا تەن چی خەریکی — دروونی بەرگی فاسۆن و حەریری

شڕە و شاتاڵەکانی کووچەمانە — کڵاو و کۆت و دامانی ئەمیری

لە دنیاداریا، هۆشیار و زیرەک — لە دنیا بۆچی وا بێهۆش و بیری

خەجاڵەت نابی ئەی شابازی پڕ زۆر — لە داوی کاکڵەمێشانا ئەسیری

قسەی سەدها حەکیمت خستە بەر پێ — نەفس کێشاتی تا کەوتیتە گیری

هەزاران زیندوو ئەکوژێ لەحزەیێ مەرگ — عەجایب هیچ ناترسی لە تیری

کەوا بێ لازمە عالەم بزانێ
لە بابی ئەحمەقیدا بێ نەزیری

غەمی دینت نییە بێتو بفەوتێ
قڕانێکت، هەتا ساڵێ ئەگیری

لە دەرسی وەعزی حەق ناس، بێزار
غولامی کەشک و پەروار و پەنیری

وەرە خەوگای ئاخر بگرە بەرچاو
ئەگەر پارێزگاری و بەسیری

نە ئەم بەرد و قوڕە ئەینیتە سەر یەک
لە غەمیا غەرقی یەک دەریای قیری

مەکە تا ماوی با سەختی نەبینی
لە دنیادا لە گەڵ کەس سەختگیری

بە بێ تاعەت گڵی بۆگەندی «زاری»
ئەگەر موشکی خوتەن یا خۆعەبیری

## ٥٤

خەو بەسە هەستە نەک سەرت دانی
جێ نەمێنی خەریکی جێ مانی

کاروان باری کرد زوو کە ئەگەر
تالبی سوحبەتی ڕەفیقانی

ڕۆژ لای‌دا لە خەتی ئیستیوا
تۆ لە جێدا لە پرخە لێدانی

چەرمی روخساری چرچ و قامەتی کۆم
گوێ کەڕ و دیدە کوێر و تەن فانی

بینشی دیدەگانی بینا لێڵ
بوو وەکوو سەیل هەر لە توغیانی

سەروی قەد وشک و بێ گەڵا، کرمۆڵ
لار و خوارە خەریکی رووخانی

جەسەدی مەحکەمی وەکوو پۆڵات
بەفری هاوینە، روو لە نوقسانی

نەوبەهارێکی زەرد و بێ ڕەونەق
پایماڵی هوجوومی زستانی

ساڵی تۆ کەوتە ژوور پەنجاوە
هێشتا هەر سەفیهـ و نادانی

ئەی بە سووڕەت بەشەر بە سیرەت دێو!
بەس نییە کار و باری شەیتانی؟

بە عومر هەمدەمی کوهەنساڵان
بە عەمەل هەمسەری منالانی

قوڕ بەسەر، نەقدی عومر دوایی هات
دەرنەهاتی لە پێسی حەیوانی

بە نەفەس ماوە وەختی کۆچاندن
بە هەوەس شاهی نەوجەوانانی

بە سەر و کەللە رۆستەمی دەستان
بە قەد و شێوە خانی خانانی

بە زەکاوەت نەزیری ئیفلاتوون
بە تەبابەت ڕەفیقی لوقمانی

چی لە دەرسی خودا شناسیدا
«احمق الحمقا»ی دەورانی

بە خودات ژێر خاکە مەنزڵگات
گەر سکەندەر ئەگەر سولەیمانی

هەمدەمێکت نییە بە غەیری عەمەل    چاکە کە چاکە! تا کوو ئەتوانی

پادشاکانی عادڵ و زاڵم    پێشدادی کیان و ساسانی

شەڕکەرانی دلێر و خاوەن گورز    شاسوارانی عەهدی ئەشکانی

ئەو وەزیرانە وا بە نووری هۆش    دەفعی سەد دەرد ئەکەن بە ئاسانی

ئەو بزانانە وا بە یاری فکر    ئەم هەموو ئیختراعەیان توانی

چاکەکانی خودای «عز و جل»    ئەنبیاکان و ئەولیاکانی

هاتن و یەک بە یەک هەموو مردن    تۆ بە ئومێدی تا ئەبەد مانی؟

بێخەبەر لەم عەجیبە تێفکرە    حەمەلەی عەرش حەیی سوبحانی

چار شەخسن وەلێ بە تەنها تۆ    هەڵگری عەرشی رەببی رەحمانی

یەک بە چارن برا لە گەڵ موڵکا    ئەهلی ئیمان! گەر ئەهلی ئیمانی

ئەم هەموو ئیحتڕام و ئیکرامە    حەق بە ئینسانی کردووە ئەرزانی

حەیفە بەم جۆرە وێڵ و غافڵ بوون    لە ئیتاعەت بە ئەمر و فەرمانی

زەرەرە، حەسرەتە لەرێ لادان    ئابڕوو چوونە، چوونە عسیانی

پێچەوانە مەڕۆ بە رێگادا    روو لە قەهری و پشت لە ریزوانی

واجبت تەرکی واجبە و سوننەت    بۆ ئەدەب وا ئەبێ موسڵمانی؟

ئەی دەخیلت ئەبم هەتا ماوە    فرسەتی تۆبە و پەشیمانی

بێرەوە سەر شەقامی حەقناسی    بەر لەوە مەرگ بێ بە میوانی

بۆ تەڕەححوم بە حاڵی خۆ ناکەی    بە تەمای خێری قەوم و خوێشانی

هەر قەدر چاکەیێ کە تۆ کردت    لە بەری قەومەکانی قەبرانی

هەر ئەوەندەش بە دووی تۆدا دێ    سەدەقە و نوێژ و خەتم و قوربانی

کاری خۆت خۆت بیکە گەر مەردی    خۆت غەمی خۆت بخۆ گەر ئینسانی

دەفعی یەک زەڕڕە گوناهی تۆ واریس    ناکەن ئەو دەم خەریکی گیان دانی

جێ ئەمێنێ ئەوی هەتە ئیللا    کفن و یەک دوو تاری رێسمانی

دێن لەگەڵتا هەتاکوو سەر قەبران    ئەتخەنە ژێر خاکی زوڵمانی

دێن و یەک دوو رۆژ بێ دەنگ و مات    دادەنیشن بە فاتیحا خوانی

پاش ئەوە بەش ئەکەن و ئەڕفێنن    موڵک و ماڵت هەموو بە تالانی

هەمسەرت هەمسەرینی ئەغیارە    مەنزڵت روو ئەکاتە وێرانی

رۆڵــــەکانت زەلیـــل و گـــەردن کـــەچ
بـــێ مخـــارج دوچـــاری عوریـــانی
پارووێکــت لـــە رەنجـــی خـــۆ نـــەخوارد
نۆکـــەری بـــێ بـــەراتی خزمـــانی
غـــەیری تاعـــەت هـــەموو ئومووراتـــت
ئەســـەفە و حەســـرەتە و پەشـــیمانی
بـــێ عەمـــەل، بـــێ ئیتاعـــە، بـــێ تـــەقوا
غـــوولی پـــەتیارەی بیابـــانی
لـــە عیبـــادات و وەفـــا و راســـی
عـــاجز و ناڕەحـــەت و هەراســـانی
بـــۆ درۆ و دووزبـــانی و بوهتـــان
چوســت و چـالاک وەک مـەردی مەیـدانی
کاکـە وا بـووی بـە شـاهی بـەحر و بـەڕ
خـــاوەنی خاتـــەمی ســـولەیمانی
عاقیبـــەت مردنـــــە دوایـــی دێ
مەنســـەبی ئاســـەفی و هامـــانی
تـــا غـــەمی نـــان و بـــەرگ و ئـــاوت بـــێ
عەبـــدی نـــانی نـــە عەبـــدی مـــەننانی
گـــەر بنیشـــێ لـــە مێـــزەرت گـــەردێ
یـــا لـــە کـــۆت و کـــەوا و ســـۆرانی
تـــا بـــە سـابوون و ئـاوی گـەرم ئەیشـۆی
ئەبیـــە جێگـــای ســـەد پەرێشـــانی
لـــەحزەیێ گـــەر بکـــەی هـــەزار خـــەتا
خەتـــەرێکت نیـــە لـــە پایـــانی
کـــە بـــە دوو کـــێچ و مـــێش و مێشـــوولە
زینـــــدەگانی ئەبێتـــــە زینـــــدانی
گوزەرانـــت چـــۆن ئـــەبێ وەختـــێ
توعمـــەی کـــرم و مـــاری قـــەبرانی
شـــەربەتت کـــیم و زووخ و خوێنـــاوە
دۆشـــەک ئـــاور، لیبـــاس قـــەترانی
بەســـیە «زاری» قســـە، عەمـــەل بێنـــە
کـــەی بـــە گوفتـــە؟ بـــە کـــردە ئینســـانی

## ٥٥

لـــە زەخمـــی مـــاری نـــەفس و ئـــارەزوو نـــابینم ئـــازادێ
نییە فەردێ نەکا لەم زەخمـە بێدەرمانـە فـەریادێ
هـــەوا چـــاو و دڵـــی ئینســـانی وا پۆشـــیوە تێفکـــرە
لە سەدها یەک نەفەر ناکا لە رۆژی ئـاخرەت یـادێ
وەها مەستی شەرابی شەوقی ئەم دنیایە ئـەهلی عەسـر
نیانـە خۆشەویسـتر لـەو بـرا و بـاب و ئـەولادێ
لەوەزعی خۆهەموو ناڕازی و تـووڕە و بەشـی پـێ کـەم
هەوەس ئەمرۆ جڵەو کێشە چ بـۆ شـاری چ بـۆ لادێ

مەکە نەقدی حەیاتت سەرفی ئاوا بوونی ئەم چۆڵە
بە چاوی خۆت ئەبینی هەرکە باقی بێت بونیادێ

موتالا کە بە دیدەی فیکر ئەی دیدە نەما باقی
نە بەهرامێ نە دارایێ نە نەمروودێ نە شەددادێ

نییە شیرینێ زەهری پێ نەدا، ئەم چەرخە چەپگەردە
نەبوو و نابێت بێ زەخمی کولنگی دەهر فەرهادێ

گرانە بارم و بێزارە ئەم خاکە لە کردارم
بە مەنزڵ چۆن ئەگەم نیمە لە تەقوا زەڕڕەیێ زادێ

فڕیوە تەیری دڵ، شوێنی گومە مەڵبەندی نازانم
خودایا داوی سەییادێکی گەردن خەی نە شەییادێ

سەرم وا لێ شێواوە رێگە بۆ مەقسوود، خۆ نابەم
خودا بۆ خاتری ئایەی «کلام اللە» ئیرشادێ

چ سەختە تەجزیە و تەحلیلی ئەم دەرسە مەگەر شاگرد
بەدەستی گیان و دڵ بگرێ یەخەو داوێنی ئوستادێ

دەمێکە لەم قوڕاوەیدا چەقیوم رەحمەتێ یارەب
دەرم بێرانە غەیری رەحمەتت کوا جێگە فەریادێ

«تحدث»بوونە کەم بەم نیعمەتە نەمدی بە عومری خۆم
تەنی بێئێش و رەنجی رۆزگار و خاتری شادێ

فەلەک بۆ بەردە بارانم ئەکا بەم جۆرە خۆ نەمکرد
وەکوو سەربازەکانی ئەبرەهەی بێشەرم ئیلحادێ

بە ئومێدی نەجاتت «زاریا» لەم گێژە بیبێژە
خودا بۆ خاتری رۆحی «رسول اللە» ئیمدادێ

## ٥٦

چ نەقسێکی هەیە بۆ پادشاهێ
کە دەربێنێ گرفتاریێ لە چاهێ

نییە بێ هۆش لە عالەمدا، لە رەحمی
مەگەر وەک من جەسووریێ رووسیاهێ

برۆ ئەی بادی سبحەینێ وەکوو مەرد
بڵێ عەرزی دەکردی پڕ گوناهێ

بە خاکی پاکی ئاسانت کە نیمە
بە غەیری خاکی ئاسانت پەناهێ

ئەتۆ بیت و خودا و هیممەتی خۆت
من و روو زەردی و دەردێک و ئاهێ

ئەوا خۆم خستە قاپی غیرەتی تۆ
ئەمن زەڕڕە ئەتۆ خورشید جاهێ

دەسم بگرە و دەرم لەم داوە بێنە
دەخیلم بمخە سەر راهێ، چ راهێ؟

شەقامی ئەو بە شۆنا هاتوانت
بەرم نەگری نەوەک کێوێ کە کاهێ

مەخۆ غەم «زاری» کەی ئەو رۆژە پاکە
لە شۆڵەی لوتفی بێبەش ما گیاهێ؟

## ٥٧

بێخەبەرتاکەیوەکووەحشیلەدوویخورد و خەوی
هەرچی کردت یا ئەکەی مەعلوومە مەرهوونی ئەوی

ئارەزووی تۆبەی سبەینێتە، هەموو رۆژێ وەلێ
ئەمبەنای ئەمرۆسبەی زوو تێکئەدانەفسی غەوی

بۆ لە کاری چاکەدا رۆژێ پەلامارێکت نەدا
لەم هەموو فسق و فجووره بۆ ئەبێ مانوو نەوی

مەرگ وەک شمشیری بێ کێلانی بوڕڕایە وەرە
سەربڕە بەم تیغە نەفسی فێڵەبازی وەک رەوی

سەرفی عومریخۆ هەتاکەی بۆ زەخیرەومولکومالْ
غەرقی ئەندووهی خۆراکی رۆژ و ئەسپابی شەوی

هەر خیلافێکت کە دی بۆ کردنی کەوتینە باز
کەی ئەبێ لەم هەموو چاکانە کە چاکێ بژنەوی

پیربوویونەقدیعومرت چوو بە تالان ئەی ئەسەف
حاسڵێکت خۆ نەبوو خەیلێ خەلاف و کەج رەوی

بۆ خەریک ئارایش و تەرتیبی ماڵی بێ بەقای
هەرکەلێتمەعلوومەمیهمانی دووسێرۆژوشەوی

قاسیدت وا هاتە سەر بۆ کۆچ خۆ ئامادەکە
موهلەتت نادەن سبەی، ئەمڕۆ، ئەبێ ئامادەوی

ئابڕووی ریشی سپی بردن بە ئەتواری قەبیح
عەیبە، ئاگا بە دوچاری خەجڵەتی سۆزی نەوی

وا لە روخسارا تلووعیدا «ثریا»ی مووی سەر
دانە دانە وەک ئەستێرە هاتەدەر بەرز و نەوی

وەک بە چاوی خۆت ئەبینی هەر زەمانێ بێ گومان
دەستەیێ سەرخاکە جێگەی، دەستەیێ ژێری زەوی

بێتەفاوەتگیانی ئێمەش وەک ئەسێرەی ئاسمان
هەر کە پەیدا بوو غورووبێکی هەیە غافڵ نەوی

تا قیامەت دێ ئەبێ بەم جۆرە هەر بێن و بڕۆن
دەستە دەستە پۆلی مەخلووقات ئەم پاشی ئەوی

جالەوێدا بۆ بەشەر مەعلوم ئەوێ نەفع و زەرەر
جا لەوێ دیاری ئەدا پاداش و ئەجری پەیڕەوی

بێبەش ومەحرووم ئەو دەستە کە باوەڕیـان بـە بـوون
واقیعـــەی ڕۆژی قیامـــەت بـــێ لـــە دڵدا (منطــوی)

نائومێـد ئـەو دەسـتە وا بـۆ خـۆ بتێکـی بـەرد و دار
دائــەنێن و ســەر لــە بــەردەمیا ئەنێنــە ســەر زەوی

رووڕەشئەودەستەبە دەوری گوێلکـا ڕەقـس و سـەماو
هـــایوهـــوو هاتوچۆیانـــە وەکـــوو ورچ و ڕەوی

قوڕبەســەر ئەودەســتە بێشــەرمە مەســیح و دایکــی
وەک کوڕ و هەمسەر ئـەزانن بـۆ خوداوەنـدی قـەوی

چاوی سەر وەختیێکـەخێڵبێ، یـەکبەدووتەشـخێسئـەدا
چاوی خێلی دڵ دەچێتە سەر دووسەد شت پەڕتـەوی

پاکەزاتی حەق لەهەرچی موشـریک و مولحیـد ئەڵـێن
ئــەو لــە عالــەم بێنیــاز و خــەلق موحتــاجن بــەوی

نــاگری گـوێ بـۆ قسـەی پـوچی نەسـاری و یـەهوود
گــەر بــە گــوێی دڵ «قـل هـواللە احـد» تـۆ بژنـەوی

دافیعـــی ژەنگـــی نیـــاز و عـــەجزە «اللە الصـــمد»
گــەر ببــێ چــاوێکی حــەق بـین و دڵـێکی مەعنـەوی

«لم یلــد» ئــاور دەخاتــە گیــان و ماڵــی ســائیبین
وەک «و لم یولد» دەڵێ بـێ ئەووەڵـە حاڵـی ئـەوی؟

«لم یکــن لــهُ کفــوا» تێغێکــە عــەجایب ریشــەبڕ
بــۆ بــڕینی بیخــی بوهتــانی گــورووهی عیســەوی

دیـنی ئیسـلامی نـەبێ بـاقی پڕوپووچـە و عەبـەس
لار و وێــر و بــێ ئەساســە و باتڵــە و بێجــا، ڕەوی

ڕەســتگاری وا لـــە دینێکـــا کـــە ئـــاوی دەســـنوێژ
سووڕەتی ئینسان ئەکاتـە سـووڕەتی مانگـە شـەوی

مەنبــەعی ئــەم دینــە قورئانێکــە «زاری» بــێ بــە دڵ
بــۆ هــەموو ئــەحکام، دنیــا و قیامــەت محتــەوی

**پێنج خشتەکی ئایینی**

## ٥٨

ئەسڵــی تــۆ ئــەو جەوهــەرە وا بــەر لــە ئــادەم ناســرا
ناوت ئەو ناوە لــە عــەرش و لــەوح و کورســی نووســرا
زاتـــت ئـــەو زاتـــە کـــەوا تـــەیی مـــەکانی بـــۆ کـــرا
قامەتت ئەو سەروە سایەی سەرفەلەک یـەک یـەک خـرا
ڕوومەتت ئەو شەمعە بۆ جەمعی دوو عالەم هەڵـکرا

ئەی لــە نــووری تــۆ لــە ئادەمـدا مەلایـەک سـوجدەبەر
ئەی بــە وەخــتی هاتنــت هــەرچی ڕەسووڵــە مـوژدەدەر
ئــەی پــەنا بــۆ خــاس و عــام بــۆ گــەدا و موعتەبــەر
ئــەی چــرا بــۆ دڵ دەوا بــۆ دەردم ئــەی نــوری بەســەر
مەرحەمەت کە با نەبم بێ بەش لە شۆڵەی ئەو چـرا

ئــەی نــەجاتی نـوّح و ئیــبراهیم و «ذوالنّــون»و «زەبــیح»
ئەی ئەنیســی یۆسـفی ســەددیق ئــەی مــوژدەی مەســیح
ئەی لــە نێــو دەســتی موبارەکتــا بــە قــەولێکی ســەریح
کــردی بــەردی وردی ڕەق تەســبیح و تــەهلیلی فەســیح

من  کە ئینسانم ئەبێ چۆنت نەکــەم مــەدح و ســەنا

ئــــەی تلــووعی ئافتـــابی تەلعـــەتت نـــووری نـــەجات
ئەی شفا بـۆ ئـێش و ژانی سـینە و سـەر، خــاکی پـات
ئەی لە شیرینی قسـەت شـەرمەندە سـەد ئـاوی حـەیات
ڕۆژی روخسارت لە سەر هەر ئەرز و هــەر خاکــێ هــەڵات

بوو بە کانی گەوهەر و ئەڵماس و یــاقووت و تــەڵا

ئــەی تفــت تریــاک بــۆ ژار و دەوا بــۆ ئێشــی چــاو
ماڵشـــی دەســـتی شـــەریفت مەرهـــەمی قـــاچی شــکاو
ئەی لــە ســایەی هیممــەتی تــۆوە ڕەهــا ئــاهوو لــە داو
جیـــنن و ئینســـان و مەلایـــەک ئۆمـــەتی تۆیـــە تـــەواو

تۆ ڕەئووفی و شــەفیعی و حــەبیب و موســتەفا

ئــــەی لــــە مەیــدانی شـــەفاعەتدا یەگانـــە شەهســـەوار
ئـــەی پـــەنا بـــۆ ڕۆژی ترســـی عاســـیانی شەرمەســـار
ئـــەی شەفابەخشـــی نەخۆشـــانی زەلیـــل و شـــێت و هـــار
ئـــەی شەهەنشـــاهی مەدینـــە ڕەحمـــەتی پـــەروەردگار

مەرهەمی لوتفی ئەتۆیــە بــۆ بــرینی مــن دەوا

ئــەی شــەقامی شــەرعی تــۆ عــەینی «صــراط المســتقیم»
بــۆ نــەچوونی دۆزەخ و بــۆ چــوونی «جنــات النعــیم»
وا ســـەفی ئەخلاقـــەکانی تۆیـــە قورئـــانی عـــەزیم
چــی بڵــێم ئیــدی ئــەمن قــەت لایقــی ئــەم وەسـفە نــیم

هەرچی بێژم ئیقتیباسێکە لە فەرموودەی خــودا

تــو بــه شمشــیری «فَأَنــذِرْ» جــەرگی کوففــارت بــڕی
هەڵــقەیی زنجــیری شــرک و چــەرمی زوننــارت چــڕی
هەرگـــەدەی بەدخاهـــە نێـــزەی دۆســـەکانی تــۆ دڕی
چــەن دڵــی ئەعــدا لــە خــۆفی تیغــی پــەیکارت فــڕی
لەشکرت فەوجی مەلایەک کۆمەکت نەسری خودا

ئــەی ئومێــدی عاســیانی دڵ پەشــێو و پــڕ لــە غــەم
ڕۆشنی چــاوی عــەرەب ئــەی گــەورە بــۆ ڕۆم و عەجــەم
ئــەی تکاکــاری گونــەهکاران، ئــەی ســاحیب کــەرەم
دەس لە دامــانی کــەوات ئــەو ڕۆژە قــەت مــن بەرئــەدەم
غەیری ئەو، «زاری» کە نیمە من لە دوو دنیا پــەنا

## ٥٩

ئەمشـــەو چ شـــەوێکە کـــە شـــەوی قـــەدرە غـــولامی
بـــالای بـــەرات و شـــەوی قوربانـــە مـــەقامی
خورشــید وەرئــەگرێت دوو ســەد شــوعلە لــە شــامی
ئـــەنواری ســـەعادەت دەدرەوشـــێ لـــە «ظلامـــی»
ڕۆژانی موبــارەک هــەموو هاتوونــە ســەلامی

ئەمشـــەو چ شـــەوێکە کـــە هـــەوا غالیەســـایە
شــادی بــە خەبــەر، غوســســە و میحنــەت لــە خەوایــە
ئــەم چەرخــە بــە ئەســتێرەوە ســەرگەرمی ســەمایە
دێ دەنــگ لــە هــەموو لاوە شــەوی هــاتنی شــایە
ئەو ئەحمەدە پاکە کە هــەموو وەحیــە کــەلامی

ئەمشــەو چییــە ڕووناکــە دووســەد مەشــعەلی ئیمــان
ئاســاری ســەعادەت لــە هــەموو لاوە درەخشــان
ئــەم خەیوەتــە شــینە چییــە بــۆ بــوو بــە چراخــان؟
مەعلوومــە کــە ئــەنواری شــەهی یەســریبە تابــان
ئەرواحە موشەڕڕەف بــە تــەحییات و ســەلامی

ئـــەخبار لـــە غـــەیبۆ دەدرێ وەخـــتی زوهـــووری
پێغەمبـــەری مـــەوعوودە کـــە ئاوایـــە بـــە نـــووری
روخســـاری ئـــەو ئـــەم عالەمـــە بـــەڕِی و بحـــووری
ســـێبەرگری هـــەورە وەلـــێ تـــۆ هـــیچ بـــە دووری

نابێـــت بـــزانی پـــەری جبریلـــە غـــەمامی

ئـــەم رۆژە لـــە شـــەودا کـــە دەبـــێ نـــووری نمایـــان
ئـــەی شـــەو وەرە ســـەد رۆژی درەخشـــانت بـــە قوربـــان
هـــەر ئـــەو شـــەوە رووخـــا و شـــکا پایـــەیی ئـــەیوان
هـــەر ئـــەو شـــەوە کوژیـــاوە گـــڕی ئـــاوری ســـۆزان

دامـــردووە یـــەک دەفعـــە بڵێســـەی بـــە دەوامـــی

هـــەر ئـــەو شـــەوە مـــاڵاتی قـــوڕەیش هاتنـــە گوفتـــار
وتیـــان بـــە ســـەراحەت لـــە هـــەموو لاوە بـــە یـــەک بـــار
تەشـــریفی لـــە دایـــک بـــووە پێغەمبـــەری موختـــار
دنیـــا بـــە وجـــوودی چەمەنـــە جەننەتـــە گوڵـــزار

ئـــەخلاقی پەســـەندیدەیە قورئانـــە پـــەیامی

هـــەر ئـــەو شـــەوە دەریاچـــەیی ســـاوە جگـــەری ســـووت
ئـــاوی چـــووە بـــن خـــاک و لـــە ئـــاو و لـــە گیـــا رووت
ئـــەو ئـــاورە بـــوو وەک نەهـــەنگ ئـــەم ئاویـــە دا قـــووت
بـــەم ئـــاوە کـــوژاوە گـــڕی ســـەد ساڵـــە کـــە ئـــەبزووت

وا مرد، لـــە دەس چـــوو «ابـــد الـــدهر» مـــەقامی

هـــەر ئـــەو شـــەوە دنیـــا بـــوو منـــەووەر بـــە جەماڵـــی
بتخانـــە وەک ئاتەشـــکەدە ئـــاور چـــووە ماڵـــی
بـــۆ چـــوونی فەلـــەک جـــن نـــەما قـــووەتی باڵـــی
کیســـرا لـــە خـــەوا خوێندیـــەوە ئـــێعلانی زەواڵـــی

نەجاشی سەری ناوەتە سەر خـــاکی شـــەقامی

بـــت کـــەوت بـــە روودا و شـــکا قیمـــەت و قـــەدری
بتخانـــە لـــە رووخانـــە نـــەما رەونـــەقی وەقـــری
کاهین لـە «سَجع» بـێ بـەش و بـێ بـەهرە لـە «نثـری»
خـۆی دێـژێ بـە خـۆی ئـاخری ئەییامتـە، ئـەمری
حـەق هـاتووە بـاتڵ لـە فەنادایـە مـەقامی

ئـــەخلاقی پەســـەندیدەیە لـــەوا کۆیـــە کـــە مـــاهی
«خاصـــە»ی ئـــەوە پێغەمبـــەری و مەســـنەدی شـــاهی
جببـــــەی بـــــەری «مـــــدثره» «لـــــولاک» کـــــەلامی
هـــەرچی کـــە بڵـــێم بـــێ شـــکە بـــالاترە جـــاهی
«زاری» بەسە ئەم بەحسە کە بێ فیکرو نـەفامی

## ٦٠

ئەی لە سەر تـەختی نـەبووەت تـا ئەبـەد تـۆ پادشـای
وەی لـــە بـــەحری ئافەرینشـــدا دوڕێکـــی موســـتەفای
رەحمـەتی دوو عالـەمی بـۆ ئـەهلی دوو عالـەم پـەنای
بـۆ تـەریقی راسـی حەقناسـی یەگانـە رەهنومـای
خاتەمییەت خەلعەتی تۆیە کـە خـتم الانبیـای

ئەی بە خلقـەت پـێش زاتـت هـیچ مـەوجوودێ نەکـەوت
بۆ مەقامی قابی قەوسەین ئـەو دەمـەی مـوژدەت ژنـەوت
وا بە تیژی مەرکـەبت لـەم نـۆ سـەمایە سـەر ئەکـەوت
بـەو هـەموو شاباڵـەوە جبریـل عـاجز مـا لـە رەوت
ئەو غوڵامی پیادە بوو، تۆ شاسواری ئـەنبیای

ئافتـــابی زاتـــت ئـــەو وەختـــە تلـــووعی پـــێ درا
بـەحری سـاوە ئـاوی رۆچـوو ئـاوری تـێ بـەردرا
ناری چـەن سـەد ساڵـە دامـرد ئـاوی قـەهری تـێ کـرا
قەسـری کیسـرا درزی بـرد و بوومەلـەرزەی تێخـرا
دەردی رووخاوی یەخەی واگرت قەتنابێ دەوای

كــێ لـــە بـــاغی «قــم فانــذر»دا وەكـــوو تـــۆ موســـتەقيم
ما، هــەتا ئــاخر هەناســە بــێ هــەراس و خــۆف و بــيم
رەهبـــــەرێكی ميهرەبـــــانی رەهنومـــــايێكی رەحـــــيم
بگــرە دەســـتم بێنـــەوام ئـــەی ســـاحيبی لـــوتفی عـــەميم
من گونەهبار و خەجڵ، تۆشافعیرۆژی جـەزای

حوســنی ئــادابی ئـــەتۆ تـــەعريفی بـــۆ كـــەس نـــاكرێ
تـــا قيامـــەت شـــەرحی كـــەمتر عادەتێكـــت نـــادرێ
عيـــزی روزئـــەفزوونی زاتـــت زينـــدووە و قـــەت نـــامرێ
بـــەر لـــە تـــۆ رۆژی قيامـــەت حـــەق تكـــای كـــەس نـــاگرێ
ئەو مەقامە حەق بە تۆی داوە، ئەتۆ ئەهلی تكـای

پەيڕەوی كــردن لــە غــەيری دينــی تــۆ كــوفرە و شــەقا
غـــەيری دينـــی تـــۆ ئـــەوی دينـــە بەتاڵـــە و بـــێ بـــەقا
خەستە بۆ چی خــۆ ئەكــەن عالــەم لــە رێگــەی ناحــەقا
سەوز نابــێ گــوڵ لــە خــاكی شــۆری بــێ مايــەی رەقــا
بێنە ئەم باغە و بكەن سەيری گوڵاڵـەی دڵگوشـای

رۆژی رەستاخيز بــۆ عەرســەی قــەزا ئۆممــەت كــە دێــن
چاو لە سەر تەوقی سەر و عــاجز لــە تــەنگی رێ و جــێن
غەرقیئـاوی خەجڵـەتو وێسـاوی سەرئەنگوسـتی پـێن
بـــۆ خەلاســـی لـــەو مەقامـــە چـــارە نامێنـــێ ئەڵـــێن
مەرحەمەت كە يا رسووڵ الله تكایێ تۆ پـەنای

بێ وەسيلەی تاعەت ئەی سـاحيب وەسـيلە مـن لـە ڕووم
چۆن هەڵێ سەر هەڵبڕم، قــەت تـابيعی ئـەمرت نـەبووم
نامە پـڕ مەعسـيەت و خاڵـی لـە تاعـەت،چارە شـووم
نەفســی ئــەممارە و هــەوا دوو دوژمــنن كەوتوونــە دووم
غەيری تۆ دامانی كێ بگرم ئەتۆ جێگەی رجـای

غـــەرقی گێــژاوی گونــاهم هــەر لــە پێمــۆ تــا بــە ســەر
نیمــە دەســت ئــاوێز غــەیری لــوتفی تــۆ پــی بێمــە دەر
مەنزڵــی مــەحموود بــۆ تۆیــە بــە ئایــەی موعتەبــەر
بــۆ نــەجاتم خواهیشــێ ئــەی حــەزرەتی «خــیر البشــر»
هەر تەمەننایێ بکەی لەو جێگەدا حاجــەت رەوای
گەر لــە ئادابــت بــە دیققــەت تــێ بفکــرن ئیــنس و جــن
دەســـتە دەســـتە پێکــەوە دوو دوو یەکایــەک پیــاو و ژن
بیدەنـــە بـــەر رۆشـــنایی عـــەقڵ تـــا مـــانوو ئـــەبن
لێــک بــەو شــەرتە لــە جــادەی ئادەمییــەت دەرنــەچن
بێ گومان ئیقرار ئەکەن ئایینەیێکی حــەق نومــای
رۆژگـــارم ســـەرفی دنیـــا کـــرد بـــێ خزمـــەت بـــە دیـــن
روو بە حەق نەمنا هەنگاوێ قــەت وەکــوو ئــەهلی یــەقین
خایــەن و بــێ عیففــەت، بــێ تاعــەت و تــەقوا، نــەبین
چـــــاوەڕێی ئــــەلتافی تــــۆم ئــــەی «رحمـــةً للعـــالمین»
بۆ نەخۆشی سەخت و بێ دەرمانی «زاری» تۆ شــفای

## ٦١

زاری مەکـــە بـــەیانی بڕوانـــە گـــەر ئینســـانی
وەک هەنگ پوورەیان داوە گــەرمێنی و کوێســانی
عێراقـــــــی و تورکمـــــــــانی
ئەم حەشرە ئەم غەوغایە کە لــەم تەکیەیــە دایــە
لـــە تاقــەتی کــێ دایــە بــدا ســەر و ســامانی
ئـــــیللا پــــــیری رەببـــــانی
کــەمێ ســەبر و مــودارا ئەگــەر ببــێ لــە کــارا
بە ئاوات ئەگەین هــەموو بــە تــەوفیقی ســوبحانی
بــــــە تەئییــــــدی یــــــەزدانی

حەيرانە عەقڵی بەشەر لەمە ئەگەر يەک نەفەر
ئەم ئەمرە هەڵسوڕێنێ بێ عيجز و ناتەوانی
بە سەهل و بە ئاسانی

ئەی مەلجەئی هەژاران حەکيمی دەردەداران
بۆ «تحدث» بە نيعمەت وتوومە با بزانی
لازمە بدەم ئێعلانی

هەوری فەيزی بەراتی کانی فەوز و نەجاتی
چەشمەی ئاوی حەياتی، حەياتی کوردستانی
گوڵاڵەی هەورامانی

«زاری» وا لە درگاتا، سەری وا لە بەر پاتا
سەری دەگاتە فەلەک، پا لە سەر سەری دانی
بە خاکی پای بزانی

## ٦٢

### تەرجيعی سەڵەوات لە سەر فەخری کائينات(ﷺ) کە مايەی گەيشتنە بە ئاوات

ئەی رەسوڵی کەريمی گەورە سيفات    نوختەيی خەتی لەوحی مەوجوودات
ئەقڵ دەرکی کەماڵی تۆ ناکات    هەر زەمان هەر دەقيقە هەر ساعات
بە ژمارەی تەواوی مەخلووقات
بە سەراپای وجوودت سەڵەوات

ئەی «مُدَّثِر» نەدای سوبحانيت «قم فَأَنذِر» عەسای سوڵتانيت
ئەی «فَكَبِّر» عەتای رەحمانيت وەی «فَطَهِّر» عەبای ئينسانيت
بە ژمارەی تەواوی مەخلووقات
بە سەراپای وجوودت سەڵەوات

ئەی حەبيبی خودای قديم الذات    مصدری فضل و مظهری بەرەکات
فيکر هەرچەن تەيی رێگە ئەکات    پەی بە بەرزی مەقامی تۆ نابات
بە ژمارەی تەواوی مەخلووقات
بە سەراپای وجوودت سەڵەوات

ئەی دڵئارا نەمامی باغی وجوود ئەی وجوودت ئەساسی هەر مەوجوود
تۆی کە غەوواسی بەحریعیلم و شهوود ئەحمەدی و محەممەد و مەحموود
به ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
به سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئەی لە ئیبلاغی ئەمردا بێباک سەنەدت عەرش و ئەفسەرت لەولاک
بەر لە تۆ کێ درووس کرا ئەی پاک؟ تۆ نەبی بووی، ئادەم ئاب و خاک
به ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
به سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئەی لە شاری جوانیا مومتاز خەڵق و خوڵقی تۆ هەر دوو جێگەی ناز
لە شەڕا بۆ تۆ ئەی مەلیک سەرباز دەستیاری خودایە تیرئەنداز
به ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
به سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئەی ئەمینی مەکین مەککە وەتەن ئەی مەدینە مەقام و هەم مەدفەن
ئەی شەهریاری میسر و شام و خوتەن ئەی فیدای تۆ رۆح و ماڵ و تەن
به ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
به سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئەی بوڕاقت میسالی دوڵدوڵ رام ئەی موبارەک هومای سەدرە خەرام
شەوی مێعراج ئەنبیا بە تەمام بوونە مەئموومی تۆ و تۆ ئیمام
به ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
به سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئەی شەهی دین و شافیعی مەحشەر خەلقی تۆیە سوڕەتی کەوسەر
نوێژ بۆ خوای خۆ بکە «وانحر» «انّ شانئک هو الابتر»
به ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
به سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئەی جەماڵت چرای ئەهلی دڵ باغی عومری عەزیزە بێحاسڵ
یانی بێشەوقی شەمعیرووت ئەی گوڵ کاری دڵ بێهەوایی تۆ ماتڵ
به ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
به سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

ئەی بەری دەعوەتی خەلیلی خودا  بە وجوودت مەسیح موژدەی دا
ئەو دەمە هەر کە هاتیە دنیا  هەق پەرەستی ژیاوە، بوت شکیا
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

تاجداری مەقامی مەحموودی  شافیعی بەزمی یەومی مەوعوودی
کانی ئەنعام و مەعدەنی جوودی  ساحیبی خاسی حەوزی مەوروودی
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

دۆستانی ئەتۆ ئەبەد سەربەرز  قەلبی ئەعدات پڕ لە خۆف و لەرز
فەخر ئەکا خۆ زەوی بە تۆ سەد تەرز  ئیحتڕامت لە سەر خەلایق فەڕز
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

«صفدر»ی بەدر سەییدی کەونەین  ئەو دەمە پەردە لاچێت لە بەین
هەڵئەسێ بۆ شفاعەتی «ثقلین»  هۆشی ئێمەت بێت گیر نەکەین
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

سەروەری ئەنبیا و فەخری بەشەر  هەڵبژێریا و مونتەخەب لە «مضر»
بۆ سەماوات، ئەرز و بەحر و بەڕ  زاتی پاکی ئەتۆیە زیب و فەڕ
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

شەهسەواری «حونەین» و «حودەیبییە»  ساحیبی خولق و خووی مەرزییە
حوسنی ئادابی تۆ وەهبییە  «محض»ی فەزلی خودایە نە کەسبییە
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

هەرچی بۆ ئەنبیای پێشوو هات     لە خەواریق لە موعجیزە و ئایات
بەر لەوە نەفسی تۆ کە داوا کات     پێی عەتا کردووی خودا بە خەڵات
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئۆممەتی تۆن ئەنبیا سەرجەم     ئۆممەتت چەتری تەواوی ئومەم
نەسەبت چاک و پاک و ئەهلی کەرەم     خواردی حەق بە ڕەسوولیت قەسەم
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
شەرحی سەدری ئەتۆ «الم نشرح»     خۆش زبانی و «ئەعلەم و ئەفسەح»
ڕەهنومایێکی سابیر و «انصح»     موژدەی پەیڕەوانت «قدافلح»
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
لە حەرەمدا شەوێ کە خەوت و نەخەوت     لە سەماوات تێپەڕی سەرکەوت
سێبەرت گەرچی سەرزەمین نەکەوت     خۆ لە سێبەرت دایە هەر دوو حەوت
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
لە فیراقی جەنابت ئەی موختار     داری وشک هاتە ناڵە و هاوار
چۆن بڵێم ئادەمیم منی بێعار     دوورم و ناگریم جار و بار
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات
ئەی تکاکاری ڕۆژی تەنگانە     دین زەعیفە، کزە، لە رووخانە
مەرحمەت کە بە لوتف بڕوانە     لازمە هیممەتێکی مەردانە
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

شەمعی دینی موبین بێ نوورە حەق بە ناحەق جەماڵی مەستوورە
بەم نەخۆشە عەلاج مەنزوورە كۆمەكێ گەر نەكەی دەوا دوورە
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

بەدری ئیسلام كەوتە نوقسانی روو بەغوربەت ئەڕوا موسڵمانی
چی بڵێم من كە خۆت ئەیزانی دەی تكایێك بۆ ئەبەد مانی
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

لار و بێئیتتیفاق و نابارین خایەن و بێوەفا و غەددارین
گیری چەنگاڵی دێوی خوێنخوارین یاریێ، یاریێ، گرفتارین
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

دەستی ئیسلام وا لە یەک بەربوو بوونە ئاردی رژاوی ناو دڕوو
ئێسە ئاغان عیسەوی و جوو كۆمەكێ گەر نەكەی لەدەس دەرچوو
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

تەمەع و كیبر و بوخل سەخت عیلاج راست بێ موشتەری و درۆ رەواج
سەبر و تاقەت زەعیف و خەستە مەزاج بە دەوای ئیلتیفاتی تۆ موحتاج
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

عاجزین و زەلیل و داماوین كەشتی شكیاو و غەرقی گێژاوین
بێكەس و دەستگیر و شێواوین بێ نیگاهێكی ئێوە چا ناوین
بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

وەرع و تەقوا بە جارێ باری کرد پەردە لاچوو حەیا فەراری کرد
زوهد وا تەرکی دێ و شاری کرد غەیری تۆ کێ بە مانە یاری کرد

بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

من کە ئەهلی خەتام و نامە سیاە گیری داوی هەوا و غەرقی گوناە
غەیری تۆ نیمە ئەی رەئووف پەناە بێ بە فریام یا رسول‌الله

بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

گەر موجەسسەم ببێ خەتام هەموو پڕ ئەبن ئاسمان و ئەرز هەر دوو
دەستگیریم ئەگەر نەکەی وا زوو نیمە رێگەی نەجات یەک سەرەموو

بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

لەجەفای رۆژگاری بەد حەرەکات ئەی پەنای عام هاتووینە پەنات
بە ئومێدی ئەوە ئەگەر بەتکات خوا لە تەنگی نەجاتمان بدات

بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

کۆمەک و پشتیوانی «زاری» بە گیرە، داماوە، زارە، یاری بە
بە کەرەم کارسازی کاری بە رۆشنایی دڵی هەژاری بە

بە ژمارەی تــەواوی مــەخلووقات
بە سەراپای وجــوودت سەڵــەوات

## ٦٣

راسـه مـن تەقسـیری زۆرم کـردووە  بـه عقووبـەت سـزاوارم
یـا«رسـول اللـه» پـەنام هـاوردووە  بـه تکـات ئومێـدەوارم

دەس لە دامان و یەخـەت چۆن بەرئـەدەم  هـەتا رۆح لـه بـەدەنما مابـێ
کێ لە خوانی رەحمـەتت بـێبـەش بـووە  لەوانـه ئیمانیـان بـه تـۆ هێنابـێ

عـەرزی«زاری» ئەونەیـه ئـەی موسـتەفا  لـه تـەواوی کائینـات
لـەم بەڵایـه بـەی نـەجاتی تـازووە  تا بـه هیممـەتی تـۆ بـه ئـارەزوو بگـات

## ٦٤

### چوارینەی ئایینی

به سەیری باغ فریبم مـەدە لـە سـەیری خـۆت
بڕوانە کە هەر لەحزە دووسەد دێ یەک ئەڕۆت
عیبرەتگەهە ئەم مەنزەرە ئەی «زاری» بۆ کەسێ
بە ئاوی سافی هـۆش دەموچـاوی دڵ بشـۆت

عـومر رۆیشـت و بـه تـەدبیری حـەکیم
عـەودی ئیمکـانی نییـه نایێتـەوە
بـەفری پـیری هاتـه سـەر کێـوی وجـوود
تـاکوو هـاوینی ئەجـەل ناچێتـەوە

بە ئاوی سەلسەبیل و کەوسەر و تەسنیم قەت نابـێ
سپی، بەختێ قەزا رەنگی رەش و تاریکی لێدابـێ
بە بۆمبی هیدرۆژن کەی ئەڕووخێ ئەو بـەنا «زاری»
کە ئوستادی ئەزەل ئەسبابی ئیستیحکامی پێدابێ

❀❀

لــە بــەحری بەخششــت وەک خــۆت ئــەزانی
بــە زوهــر و عەســر و ئێــوارە و بــەیانی
ئیلاهــی رەحمــەتت واریــد کــە ســەر رۆح
«رســـول اللـــە» و ئـــال و پەیـــڕەوانی

جــەواهێر زۆرە، زەرفی مــن شــەق و شــڕ
چلــۆنی پینەکــەم تــا گــوم نــەویٚ دوڕ
خـــودا بـــیٚ پشـــتیوانی رەحمـــەتی تــۆ
شرۆڵــی وا، لــە گەوهــەر چــۆن ئــەبیٚ پــڕ

دڵـــێکم پـــیٚبـــە یـــاڕەب تـــۆبناســـیٚ
زبانـــیٚ پـــی بـــەجـــیٚ بێـــنم سپاســـیٚ
وەهـــا مەســـتی جەماڵـــت کـــە خەیاڵـــم
نـــەکا غـــەیری سوپاســـت هـــیچ باســـیٚ

ئـــەمن عەبـــدیٚ نـــەفام و بـــیٚشـــعوورم
لــە پەنجــەی پێمــەوە تــا ســەر، قســوورم
بــە لــوتفی خــۆت ئەگــەر نەمخەیتــە سەرڕیٚ
لەرێگــەی راســی حــەق ناســان بــە دوورم

خـــودا شـــەوقی جەماڵـــت رێبـــەرم کـــەی
لیباســـی عـــەفو و غوفرانـــت بـــەرم کـــەی
کـــە غـــەیری رەحمـــەتت نیمـــە پـــەناهیٚ
پـــەنا بـــۆ کـــیٚ ببـــەم گـــەر تـــۆ دەرم کـــەی

لـــە مڵـــکت زەڕەیـــیٚ نابێتـــەوە کـــەم
ببەخشـــی گـــەر گونـــاهی خەڵـــق ســـەرجەم
ئـــەتۆ تـــەووابی و غـــەففار و وەهھـــاب
منـــیش زوڕییـــەتی حـــەووا و ئـــادەم

خودایا من کە ئەولادی ئەوانم
محەللی سەهو و نسیان و نەزانم
بەشی وانت لە بەحری مەغفەرەت دا
منیش بۆ ئەو بەشە چاوەڕوانم

بەهارە، گوڵستانە، دەشتە، کۆهسار
تەماشاگایە، بۆ بێهۆش و هۆشیار
جەماڵی تۆ تەماشاگایە بۆمن
کە تۆ رووم تێبکەی چیمە لە گوڵزار

لە تاڵی زیندەگانی بۆ بناڵم
ئەزانم کەس بەزەی نایە بە حاڵم
خودا! فەریادڕەس هەر تۆی وهەر تۆ
بە لوتفی خۆ مەگەر دەس بەیتە باڵم

وەرە ئەی دیدە با پێکۆ بەڕێ بین
لە کووچەی یاردا زوو جێ بە جێبین
لە هەر جێگا کە تۆزێ دڵ رەحەت بێ
وەکوو مەردانی زانا با لەوێ بین

بەرەو ماڵی بەقا هەرگا سەفەر کەین
لە ئاسایش ئەبێ سەرفی نەزەر کەین
دڵا تێکۆشە مەردانە لە گەڵما
هەتا ئەم بارە لەم زۆنگاوە دەرکەین

بە چاوی مەیل مەڕوانە لە دنیا
کە هەر لاکێکی سەد سەگ وا لە بنیا
لە دنیا خۆشەویسانم نەدی کەس

که ئاخر تەپڵی بەدناوی نەژەنیا

دەخیلم فڕ نەدەی ئەم کۆڵە ئەی دڵ
هەڵیبگرە و بڕۆ تا ئەچیە مەنزڵ
ئەگەر لەم خاک و خۆڵ و چۆڵە دەرچووی
ئەوی داوا ئەکەی مەوجوودە حاسڵ

بەسەرهاتێ بە سەر من هات تا حاڵ
بەسەرهاتی وەها نەیدیوە کەس تاڵ
بەهارم پایزەو هاوین زستان
دەروون پڕ ئاهی سەرد و سینە یەخچاڵ

لە بەر بوو بێبەری باغی ژیانم
نەزانی بوو ئەوەی کردم ئەزانم
ئەمە کافی نییە بۆ لێنەزانی
لە دنیادا رەفێقی وەحشیانم

گەرەکتە دامەنت نەگرێ قولاوێ
مەڕەنجێنە ئەوەی گیانی تیاوێ
بە حاڵی دڵ شکاوانا بەزەت بێ
دەرێنە پای داماوێ لە داوێ

چیە چارە لە گەڵ ئەم رۆزگارە
کە هەر لایێ ئەچی دووپشکە، مارە
رەفیقێکم نەبوو نەمداتە بەر بەرد
نییە دڵخۆشیێ بێ سەد پەژارە

لە حەفتا تێپەڕیوە ساڵی عومرم
بەهارم چوو زستانم هات ئەمرم
بە دووی نەفس و هەوادا غار تا کەی؟

ئـەبێ بـۆ دەس بـە حەڵـقەی تۆبـە نـەگرم

بەسـە مەسـتی هـەتا کـەی بـێ شـعووری؟
لـــە ئـــادابی خوداناســـان دووری
محاڵـــە بـــێ عەمـــەل بـــڕژێ بـــە ســـەرتا
نمـی رەحمـەت لـە سـەرچاوەی غـەفووری

لـــە تاعـــەت بـــێبـــەری و رووســـیاهم
ســـەراپا غـــەرقی دەریـــایی گونـــاهم
ببـــووره لـــێم یـــاڕەبی بـــە رەحمـــەت
کـــە هـــەر رەحمـــی خوداییتـــە پـــەناهم

لـــە بـــوونی خۆمـــدا پـــەروەردگارم
ئەمـــە مەعلوومـــە نـــەبووە ئیختیـــارم
بـە فەزڵـی خـۆت ئـەم بوونـەت کـە پێـدام
مـــەدە دەس نەفســـی ناکـــەس کاروبـــارم

چییـــە هیـــوات بـــەم مـــوددەی ژیانـــە
کـە هـەر ئێشـە، غەمـە، ئـازارە، ژانـە
بـــە چـــاوی هـــۆش بـــڕوانی ئـــەزانی
بەشـــەر بەنـــدی و دنیـــا بەندیخانـــە

بەشـــەر گـــەرچی بـــژی ملیۆنـــەها ســـاڵ
بخـوا، بخواتـــەوە، کــۆ کاتـــەوە مـــاڵ
لـــەئاخردا یەخـــەی ئـــەگرێت مـــردن
بـــە ناکـــامی ئـــەبێ بخرێتـــە ناوچـــاڵ

شـــەمێ پەیـــدا کـــە ئـــەی دڵ شۆڵـــەدەر بـــێ
کـــە ڕێگـــەی لار و تاریکـــت لـــە بـــەربێ
ئەگـــەر گـــەنجت ئـــەوێ رەنجـــێ بکێشـــە

لە بێکاری نەبوو کەس بەهرەوەر بێ

هەتا گیری غەمی ماڵ و مناڵی
پەرێشان فکر و نائاسوودە حاڵی
غەمی دنیا زیانە نەقسە بۆ مەرد
غەمی دینت کە بوو ئەهلی کەماڵی

ئەمن ناڵێم تۆ دانیشە بێکار
کە سفرەت بۆ ئەنێرن شام و ناهار
بجووڵە و هەرچی ڕۆزیدەر کە پێدای
وەری بگرە مەکە فریاد و هاوار

دڵت تا غەرقی فکری گا و کەر بێ
هەتا دنیات مەحبووبی نەزەر بێ
لەگەڵ گا و کەرایە حەشرو نەشرت
ئەبێ خەوگات زیندانی سەقەر بێ

بە گەنج و ماڵ گەرچی ببیە قارووون
نییە ڕێگەت لە داوی مەرگ دەرچوون
لە ئاخردا ئەبێ دنیات یەکسەر
بە جێبێڵی لەگەڵ سەد ئابڕوو چوون

بژی وا، ڕەحمەتێکت بۆبنێرن
دوای مەرگت ئەوانەئەهلی خێرن
لەمولەو گاز مەگرە وەک سەگی هار
لە هەر لا دەرکەوی خۆت لێوەشێرن

مەبە بێکار تا هێزت تیایە
ئەوی بێکارە مەغبووزی خودایە
کەسێ دارایە بتوانێ بکا کار

ئـــەوی بێکـــارە بـــا شـــا بـــێ گەدایـــە

مەبزونێـــــــەزبانت بـــــــۆ زیانـــــــت
بـــــەڕەڵا بـــــێ ئەســـــووتێنێ گیانـــــت
لــــەغاوی کـــە نـــەکا بتـــدا بـــە ئـــەرزا
بـــڕووخێنێ بـــە ســـەر یەکـــدا ژیانـــت

ئـــەوی بـــۆ خـــۆت پێـــت خۆشـــە ئـــەبێ بـــۆ
هەموو ئینسانێ پێت خـۆش بـێ وەکـوو تـۆ
کـــە ســـاغ و شـــاد و دارا و لـــە وەی دوور
ئـــــەمین و کامکـــــار و ئاشـــــتی جـــــۆ

وتـــەی شـــیرازییە، ئـــەو بـــەحری عیرفـــان
بـــەنی ئـــادەم وەکـــوو ئەنـــدامی یـــەک وان
کـــە هـــــەر ئەنـــدامێ ئـــازاری بگاتـــێ
هـــــەموو ئەندامـــــەکانی دێنـــــە ئامـــــان

ئـــەتۆ ئـــەی جەوهـــەری خـــاکی، لـــە خـــاکی
لـــــە ئـــاور نیـــت، بـــۆچی ســـۆزناکی؟
لـــــە تـــاریکی هـــەوا و جـــەهل بـــێ دەر
تەماشـــــا کـــــە چ رۆژێ تابنـــــاکی

بـــــرا بڕوانـــــە بـــــێ میهـــــری زەمانـــــە
چ بەدعەهـــــد و وەفـــــا و بـــــێ ئەمانـــــە
لـــــە گوڵـــــزارێکدا نەمبیســـــت و نەمـــــدی
گوڵـــــێ بـــــڕوێت و نەیکاتـــــە نیشـــــانە

کوڵـــــۆییێکم شـــــکان و هاتـــــە ناڵـــــە
وتی ئـــــەی وای لـــــەم دنیـــــا بەتاڵـــــە
ئـــەمن شـــا بـــووم، بـــووم ئـــا بـــەم کوڵـــۆیە

فەلـــەک بـــەم زەربەشـــی کـــردم حەواڵـــە

گەرەکتـــە رەخـــت لـــەم گێـــژاوە دەرکـــەی
مـــەدە ئـــازاری زیـــڕووحێ هـــەتا هـــەی
یەخـــــەت ئـــــەگرێت مـــــەئمووری مکافـــات
لـــە رێگـــەی راس ئەگـــەر یـــەک زەڕڕە لادەی

لە حاڵی ئەهلی ئـەم عەسـرەت خەبـەر هـەس
زیـــاتر تـــوورە و بـــێ تاقـــەت و پـــەس
چـــــرووک و نائـــــەمین و دوون هیمـــــەت
بـــەخیل و ســـووک و نائینســـان و ناکـــەس

لـــــە راســـــی دوور و ناپـــــاک و درۆزن
بـــە وەعـــدە پیـــاو، ئـــەمما بـــۆ وەفـــا ژن
ریاپیشـــــە، چـــــلوچۆکـــــەر تـــــەماعی
لـــە ســـەر نانـــێ، لـــە یـــەکتر ئەبنـــە دوژمـــن

قەناعـــەت وا لـــە خـــەودا، حـــیرس بێـــدار
هـــــەوا فەرمانـــــڕەوا و عـــــەقڵ بێکـــــار
فجـــــوور و جـــــەور بـــــازاڕی رەواجـــــە
حـــــەیا و وەرع و تـــــەقوا بـــێخەریـــدار

گـــەدا تـــەبع و گـــەدا هیممـــەت گـــەداخوو
گـــەدا رەفتـــار و بـــەرچاو تـــەنگ و دوو ڕوو
نـــــەبین و نەشـــــنەوا و حـــــەق نەناســـــن
هەموو دڵ پـــڕ لـــە بـــوغز و کینـــە وەک جـــوو

دوایـــــی هـــــات فەسڵـــــی نەوبـــــەهارم
وەری بـــــەرگی گوڵاڵـــــەی لالـــــەزارم

شـــکانی بـــەفری پـــیری شـــاخ وباڵـــم
تماشـــا ، بـــێ بـــەرو بـــێ بەرگـــە دارم

ئـــیرادەی حـــەتمی تۆیـــە ئـــەی ئیلاهـــی
ســـــپیدی دێ ئەشـــــارێتۆ ســـــیاهی
ئـــەماناتێ کـــە پێـــت داویـــن یـــەک یـــەک
ئـــەبێ بیدەینـــەوە «خـــواهی نـــەخواهی»

ئـــەوی رەگ وا لـــە جەســـتەمدا وەکـــوو تـــار
ئـــەکا هـــەر یـــەک بـــە ئاوازێـــک هـــاوار
کـــە ئـــەم بینـــا ئـــەبێ وا زوو بـــڕووخێ
لـــە بنچینـــەی نـــەمێنێ هـــیچ ئاســـار

بـــە هیـــوای چیـــت بـــەم مـــوددەی ژیانـــە
بەشـــەر رێبـــوارە دنیـــا قاوەخانـــە
پشـــوویەکی کـــە دا بـــڕوا ئـــەبێ زوو
ئەساســـی مـــانی ئـــەم دنیـــا ، نەمانـــە

کـــە وایـــە بـــا خـــەریکی تۆشـــەیێ بـــین
بـــە گومنـــاوی مـــوقیمی گۆشـــەیێ بـــین
لەگـــەڵ هاوکارەکـــانی وەحـــدەت ئـــایین
وەکـــوو عەقـــدی ســـورەییا خووشـــەیێ بـــین

دڵا بـــێ دەر لـــە ســـینەی پـــڕ لـــە ئـــاهم
نـــەکا بتخاتـــە چـــا تاڵـــەی ســـیاهم
ســـەلاح هـــەر وایـــە لـــەم زۆنگـــاوە دەرچـــین
لـــە جێگایـــێ کـــە دایـــە تـــەختگاهم

هـــــەتا پابەنـــــدی ماڵـــــی وا قـــــوڕینی
یـــەقین بـــێ هێـــز بـــۆ بـــاڵا فـــڕینی

لــە گــەڵ خۆشــبەختیا کــەی ئەبیــە هــاودەم
کـــە تـــۆ مەشغوولـــی بەدبـــەختی کــرٍینی

وەرە ئـــەی نـــەفس ئەگـــەر هۆشـــیار و ژیـــری
بکـــــە ئـــــەم پێـــــنج رۆژە گۆشـــــەگیری
لەگـــەل دووری کـــە تـــەنیا بـــە و ســـلامەت
رفاقـــەت پـــرٍ شـــەرٍ و شـــۆرە و زویـــری

بـــە هیممـــەت رۆژ بـــە ئـــەی یـــاری هۆشـــیار
مەکە بێ بـەش لـە نـوورت غونچـە و خـار
مەکـــــە پـــــەنهان هـــــەر پیشـــــە ئـــــەزانی
بەشـــەر ئـــەمرێ وەلـــێ بـــێ مەرگـــە ئاسـار

بـــە تاقـــەت بـــە لەگـــەڵ چـــاک و خـــراوا
بـــە بـــێ ســـەبری مـــەدە پللـــەت بـــە ئـــاوا
ئـــەوی بـــێ ســـەبرە برٍوانـــە کـــە رۆحـــی
هەمیشـــــە وا لـــــە گێـــــژاوی عـــــەزاوا

شـــــەفا و دەرد یـــــارٍەب خـــــەلقی تۆیـــــە
لـــە غـــەیری تـــۆ بەشـــەر بـــۆ چارەجۆیـــە؟
شـــەفای ئـــەم زامـــە ناســـۆرەم نـــەدەیتێ
هـــەتا رۆژی قیامـــەت هـــەر بـــە ســـۆیە

لـــــە دنیایـــــەکی پـــــرٍ دەرد و بـــــەلادا
فـــرٍێت داوم مـــــەدە رەنجـــــم بـــــە بـــادا
ئەگـــەر رێگـــەم نەدەیتـــە ســـێبەری خـــۆت
کەســـێ تـــر یـــا ئیلاهـــی رێم نـــادا

ئـــــەوی داری ئەرٍووشـــــێنێت ئـــــازام
ئـــەوی خـــاری ئەگـــەر ئەشـــکێتە ژێـــر پـــام

مکافـــــاتی گونـــــاهی خۆمـــــە بـــــۆچی
بڵـــێم ئـــەو دار و خـــارە ئەزیـــەتی دام

ئـــــەوی تـــــۆوێ بچێنێـــــت ئینســـــان
لـــەوە مەعلوومـــە هەڵـــئەگرێت خـــەرمان
مەڵـــێ پـــەیکوڵ ئـــەچێنم لالـــە ئـــەدرووم
بـــــەری خورمـــــات ناداتـــــێ مـــــوغیلان

دڵـــم عـــاجز لـــە شـــێوەی لاری خۆمـــە
لـــە نەفســـی شـــووم و ناهـــەمواری خۆمـــە
ئـــەبێ بـــۆچی لـــەم و لـــەو دەردە دڵ کـــەم
بەهەشـــتم، دۆزەخـــم هـــەر کـــاری خۆمـــە

خـــــودا بـــــۆ رێـــــی تـــــاریکم چرایـــــێ
چرایـــــێ پـــــی ببیـــــنم جێگـــــە پایـــــێ
ئـــــەپاڕێمۆ لـــــە ئاســـــانەی کـــــەرم تـــــا
بگـــــا دەســـــتم بـــــە دایـــــەن ئاشـــــنایێ

عـــومر ئەبڕێتـــەوە خـــوا خـــۆش یـــا تـــاڵ
دوایـــی دێـــت مانـــگ و هەفتـــە و ســـاڵ
عەمەلمانـــــــــە رەفێقـــــــــی دایمیمـــــــــان
بـــە مـــردن جـــێ ئـــەمێنێ دەوڵـــەت و مـــاڵ

گەرەکتـــە گـــەر جـــوانی هەمـــدەمت بـــێ
هەمیشـــە هەڵـــگری بـــاری غـــەمت بـــێ
لـــە کـــاری چـــاک کۆتـــاهی مەکـــە قـــەت
خـــراوە تـــاکوو ئـــەتوانی کـــەمت بـــێ

وەرە لـــەم خاکـــە بـــا هـــەر دوو بـــە جـــارێ
لـــــە رووداوێ کـــــە دیویـــــە پرســـــیارێ

بکـــەین و لـــەو بەســـەرهاتەی کـــە بێـــژی
وەکـــوو ئینســـان بگـــرین ئێعتبـــارێ

کولـــۆیێ کەوتـــە بـــەر پـــام و شـــکانم
وتی هـــــاوار ئێشـــــت پێگـــــەیانم
منـــیش لاشـــەی مرۆڤـــێ بـــووم وەکـــوو تـــۆ
زەمانـــــە بـــــەم مقامـــــەی وا گـــــەیانم

وتم وا زاهـــیرە ئـــەی خشـــتی پـــڕ فـــام
لـــە بـــیرت دێ گـــەلێ رووداوی ئـــەییام
لە «شیث» و «نووح» و «ئیـبراهیم» و «ئـادەم»
لـە ئایینـەی سـکەندەر، هـەم جـەم و جـام

ئـــەوی دیوتـــە و لـــە خاترتایـــە بێـــژە
لـــە هـــەوری فکـــر مـــرواری بـــڕێژە
بـــە تـــەقریرێکی شـــیرین و دڵ ئـــاوێز
رەســـا و رێـــک و کۆتـــا، بـــێ درێـــژە

وتی ئـــەی کـــاکی جووتیـــاری جـــەفاکێش
لـــە شـادی بـەش بـڕاو و سـینە پـڕ ئـێش
بەســـــەرهاتی زەمانـــــەم زۆر دیـــــوە
حیکایـــاتی عـــەجیبی شـــاه و دەروێـــش

بـــە کـــورتی وا ئـــەدەم شـــەرح و بـــەیانی
گـــوێم لـــێ بگـــرە تـــا باشـــی بـــزانی
نموونـــەی ســـەد هـــەمارە لالـــەوێچێ
ئەگـــەر دارای ئیـــدراکی جـــوانی

ئـــەمن سەرلەشـکری «کـاووس کـەی» بـووم
یەگانـــە شەهســـەواری دەشـــتی رەی بـــووم

ئـــەمن بـــووم پاڵـــەوانی عەســـری كـــاوە
وەزیـــری خوســـرەوانی نیـــک پـــەی بـــووم

خەبـــەردارم لـــە ســـەلم و ئـــیرەج و تـــوور
لـــە زوحـــاک و فەرەیـــدوون و لـــە شـــاپوور
لە كەیخوسرەو لـــە گوشتاســـپ، لـــە بەهمـــەن
لە تووس و زاڵ و رۆستەم ســـامی مەشـــهوور

لـــە شیث و نـــووح و ئیـــبراهیم و ئیـــدریس
لـــە داوود و ســـو لەیمان و لـــە بـــەلقیس
لـــە مووســـا و لـــە هـــاروون و زەكـــەریا
لـــە یـــەحیا و لـــە ئـــەییوب و لـــە جـــرجیس

هـــەتا تـــۆفیقی بـــاری یاریـــان بـــوو
لەشـــی ســـاغ و دڵـــی هۆشـــیاریان بـــوو
هـــەموو فەرمانـــڕەوا و خـــاوەن ئیقبـــاڵ
زەمانـــــە رام و خدمـــــەتكاریان بـــــوو

لـــە ئـــاخردا كـــە نەگبـــەت هـــات بۆیـــان
دڕانی و چـــــڕانی تـــــان و پۆیـــــان
وەهـــا ئیقباڵـــی چەرخانـــدن زەمانـــە
نـــەیانتوانی دەوامـــێ بـــەن بـــە خۆیـــان

بزانـــە گیـــانی مـــن ئـــەم خاكـــە ماتـــە
بـــە بـــێدەنگـــی كـــە فەرشـــی ژێـــر پاتـــە
ئەڵـــــێ زەڕڕات لاشـــــەی پێشـــــوانم
ئەمـــە بـــێ شـــک ســـەرئەنجامی حەیاتـــە

ئـــەتۆش ئـــەلئان وا بزانـــە كـــە مـــردووی

لـــه دنیـــا بـــۆ قیامـــەت کـــۆچ کـــردووی
ســـوئالت لـــێ ئـــەکرێ جـــوابی ئـــەدەیتۆ
لە بەهرەی کـردەوەی خـۆ بـەهرە بـردووی

دەخیلـــــت بم بـــــرا تـــــۆوێ نـــــەچێنی
لـــــه مەحشـــــەردا بـــــه لایـــــۆ دابمـــــێنی
بـــه پوولـــی قەڵـــبەوە گـــەر بیتـــه بـــازاڕ
ئەترســـم هـــیچ ئەســـپاوێ نەســـێنی

شـــەریکی دوژمنـــه ئـــەم نەفســـه پیســـه
دەخیلـــت بم قســـەی قەتعـــەن مەبیســـه
درۆی گـــەردن شـــکێنی بـــا بوێســـێ
ئەوەیشـی راسـه، هـەر مـەکرە و دەسیسـه

مـــەدە خـــاتر بـــه دنیـــا بـــێ وەفایـــه
سەراســـەر غـــەدرە، ئـــازارە، جەفایـــه
ئـــەوی خێزانـــێ تـــۆ غـــەمخواریانی
هـــەموو دوژمـــن هـــەموو دەرد و بەڵایـــه

بـــه تـــەنیایی وەکـــوو عیســـا بـــه، ئینســـان
کـــه تـــەنیایی ئەمانـــه و راحـــەتی گیـــان
عەلاقـــەت تـــاکوو زیـــاتر بێـــت زیـــاتر
بـــه ســـەر دڵـــتا ئـــەدا لافـــاوی ئـــەحزان

ژن ومنـــداڵ ئەگـــەر کـــۆ بوونـــەوە لێـــت
ئـــەوی ژەهـــرێ کـــه تاڵـــه ئـــەیچێژن پێـــت
نـــه شـــەو ئاســـوودەگی بـــۆ خـــەوتنت هـــەس
نه بێ غـەم، خواردنـت بـۆ قـووت ئـەدرێت

یـــەکێ هـــاوار ئـــەکا بـــەرگم، یـــەکێ نـــان

يـــەكێ ئێـــژێ نەخۆشـــم ، بـــاوە ئامـــان
بـــدە و بێـــرا وەهـــا ئينســـان ئـــەكا شـــێت
حەواســـی پـــەرت ئـــەبێت بێهـــۆش و حـــەيران

خواناســـــی بـــــە دڵ مايـــــەی خەلاســـــە
دڵـــی بـــێ مەعريفـــەت و ەك كـــوێر واســـە
كـــــە بـــــێ چـــــاوێ ببێتـــــە چاوســـــاغت
ملـــت ئەشـــكێ ئەگـــەرچی رێگـــە راســـە

جوانـــــان مەســـــتی بـــــادەی بـــــێ شـــــعووری
لـــــە بێعـــــاری نيانـــــە هـــــيچ دووری
فجـــــوور و فيســـــق بـــــازاڕی رەواجـــــە
لە حەد دەرچـوو خـودا ، تاكـەی سـەبووری

نـــە شمشـــيرێ ســـەری ناپـــاك لـــەت كـــا
نـــە مـــەئمووریّ دزی بـــێباك پـــەت كـــا
خـــودا كـــەی دێ ئـــەو مـــەئموورە تـــا خـــەلق
لـــە مەيـــدانی موجازاتـــا بـــە خـــەت كـــا

ئەســـــەف بـــــۆ جوانـــــەكانی ئـــــەم زەمانـــــە
ئـــەوی شـــێوەی ديانـــەت بـــێ نيانـــە
لـــــە فـــــەرز و ســـــوننەتی ئيســـــلام بێـــــزار
هوتێـــــــل و ســـــــينەما مزگەوتيانـــــــە

بەرەڵـــــلا گـــــەردن و ســـــينە وســـــەر و روو
هونـــەر بـــێ شـــەرمييە و ئارايشـــی مـــوو
كـــوڕ و كـــچ پێكـــەوە بـــێ خـــۆف و ئەنـــدێش
خـــەريكی كـــەين و بـــەينی خـــۆن دوو دوو

بـــــرا بڕوانـــــە بـــــۆ دارا و دەروێـــــش

هەوا فەرمان فەرمایە و جڵەوکێش
خیلافی نەفس کەسیان ناتوانن
لە کارێکا بنێن پایێ بەرەو پێش

چیە ئەم مەستییە ئەی دڵ کە ئاگات
نییە ئەم مانگ و ساڵە چۆن ئەڕوات
دەلیلێکت بە دەستۆیە کە سۆزی
قەتارت بێ سوئال و جواب بڕوات؟

کە وایە، بێرەوە سەرخۆ بزانە
ئەڕۆ بۆ کام شار ئەم کاروانە
مەدە دەس قاتری سەرکێش هەوسار
لە رێ لادات و بڕوا پێچەوانە

هەمانە ئێمە دەستووری چ دەستوور؟
لە تاریکی بەری، نووری عەلا نوور
وەرە لەو نووورە وەربگرە شوعاعێ
لەگەڵ پاکانەدا بفڕە بەرەو ژوور

دیارە گیری ئەفسوون و فریوی
لە قوڕدا تا گەریبانت چەقیوی
لە رێگا ناس بۆ ناکەی سوئالێ
کە تۆ ناشارەزا و رێنەدیوی

هەتا کەی بەندەیی نەفس و هەوا بین
ئەسیری داوی تەزویر و ریا بین
لەمەولا چاک هەر وایە موئەددەب
بە ئادابی جەنابی «مصطفی» بین

بە غەفڵەت وا بڕاوە رۆزگارت

بـــەرەو مـــردن بەڕێیـــە کـــۆچ و بـــارت
هــــەتا مــــاوی بـــدە حـــەولی وەســـیلەی
نـــــەجاتی نەفســــی دامــــاوی هــــەژارت

لیباســـی پــاکی ئیســتیغفار لــە بــەر کــەین
لـــە خـــاتر فیکـــری چـــەوت و لار دەرکـــەین
بــە ســابوونی نەدامــەت گــەردی عیســیان
لە سەفحەی لەوحی دڵدا بیَ ئەســەر کــەین

لــە رەحمــەت ئــەی بینــایی بەخشــی چــاوم
بەشـــم گـــەر ئەونــە بـــەی وا پێــت داوم
چ لازم لێـــــرەدا مـــــن هـــــیچ بێـــــژم
کـــە خـــۆت ئاگـــاهی چەنـــدە ناتـــەواوم

ئـــــەمن موحتــــاجم و تـــــۆ بـــیَ نیـــازی
ئـــــەمن دامـــــاوم و تـــــۆ کارســــــازی
زبـــانم لاڵـــە بـــۆ تـــەقریری مەقســـوود
وتـــن بـــۆچی؟ کـــە تـــۆ دانــا بـــە رازی

لـــــە تــــۆ داوا ئەکــــــەم پــــەروەردگارم
بکــەی رەحمـــیَ بـــە ئەحواڵـــی هـــەژارم
بـــە فـــەزلت گـــەر نـــەنێری کۆمـــەکیَ بـــۆم
بــــەجیَ مــــاوم زەلـــــیلم، لارە بـــــارم

چ غەدداریکـــە ئـــەم دنیـــا کـــە تـــا حـــاڵ
لـــە عـــومری رۆییـــوە ملیۆنـــەها ســاڵ
نـــەبوو دۆســـێکی نەیـــڕێژێت خـــوێنی
نـــەبوو یـــارێکی نەیهاوێتـــە ســـەد چـــاڵ

تەماشــا کــە بــە چــاوی هــۆش ئــەی یــار

کــە مــردن وەک قەســاوە و ئێمــە پــەروار
لــە بــەر چاومــان هــەزار ئــەکوژێت و نــاوین
لـــە ئـــەتوارێ هەمانـــە دەســـت بـــەردار

چ ســــەختە ئـــەم دڵـــە ئێمـــە هەمانـــــە
نـــــەرم نـــــاوێ بـــــە رووداوی زەمانـــــە
نـــــە ئایـــــاتی «کـــــلام اللـــــه» ئەبیســـــێ
نــە گــوێگر بــۆ رەسوولــی ئیــنس و جانــە

بـــەچی یـــاڕەببی ئـــەم بـــەردە نـــەرم بـــێ؟
بــە کــامین ئــاور ئــەم ســەردە گــەرم بــێ؟
لـــــە ســـــەختی وا محاڵـــــە ئیســـــتیفادە
مەگــەر ئوســتادی رەحمــەت رێبــەرم بــێ

چیــە فــەرقی «بەشــەر، بــێدڵ» لــە گــەڵ گــا
کــە هــەر بخواتــەوە، بنوێــت و بخــوا
گـــەلێ گـــا چـــاترە بـــۆ ئیســـتیفادە
لــە ئینســانێ کــە بــێ دڵ زینــدەگی کــا

گەرەکتـــە فێـــری پیشـــەی کیمیـــا بی
لـــە ئـــەهلی دڵ دەمـــێ نابـــێ جیـــا بی
رەفێقـــی بێـــدڵان بی، بـــێ مـــورادی
لەگـــەڵ ئەهڵـــی دڵا بی، کامیـــابی

بــە رەحمــەت گــەر نــەکا باریــت یاریــت
نـــەکا ئامـــادە دڵ بـــۆ مۆژگاریـــت
حـــەیاتت مەزرەعـــەی دەرد و بەڵایـــە
لــە ســەرفە بــێبــەش و ئــەهلی خەســاریت

گوڵـــێکم دی لـــە باغـــا ســـیس و ژاکـــاو

وتم ئـەی عـەتر بـەخش و رۆشـنی چـاو
چیـه بێـژه وەسـیلەی بـێدەماغیـت
خـراوی خاکـه ئایـا ، یـا کـەمی ئـاو

وتی ئـەی کـاکی جووتیـاری بـەڕێزم
ئـەزانی بـۆ نـەماوه ڕەنـگ و هێـزم
لـه خـاک و ئـاو قـەت نیمـه سـکاڵا
وەلـێ پاماڵـی کـاڕوش و هـەرێزم

وەره «زاری» بـژاری بـاغی دڵ کـەین
گژوگیـا ریشـەبڕ ، خدمـەت بـه گـوڵ کـەین
بڕازێنینـەوه گوڵـزاری خـاتر
تـەواوی گوڵـبونی غـەرقی خشـڵ کـەین

درۆ و کینـه ، عـەداوەت ، بـەدگومانی
خەیانـەت ، نائـەمینی ، دووزبـانی
حەسـوودی ، کیـبر و غەیبـەت ، رووشـکێنی
دزی ، بوهتـان ، لەناحـەق پشـتیوانی

پـەلاماری ئـەم و ئـەو دان وەک مـار
بـه ماڵـی خەڵـک خـۆکردن بـه پـەروار
تەمـەع ، بـەرتیل ، بـەدوێژی ، بـەخیلی
بـه «خلـق اللـه» گەیانـدن ئـێش و ئـازار

به حەق بێ یا به ناحـەق قـەت مـەخۆ سـوێن
به بێ عیللەت بـەموبـەو قـەت مـەده جـوێن
ئـەوی پێـت خۆشـه نـەیبیسـیت مەیڵـێ
گوڵ و پـەیکوڵ لـه تـۆوی خۆیـان ئـەڕوێن

بکـه دووری لـه عـەیبی خۆنومـایی

لــــه نـــەنگ و فیتنـــەجۆیی و بـــێوەفـــایی
مەڕووخێنــــــه بـــــرا، قەســـــری مـــــرووەت
بــــــه پـــــاچی خوازەڵـــــۆکی و گــــــەدایی

مەکـــه هەوســـــار بـــۆ نـــەفس و هـــەوا شـــل
لـــــه ڕێگــــەی ڕاس قـــەتعا پـــێ مەکـــه کـــل
خــــــەتا بــــــا زەڕڕەیــــــێ بــــێ لی بترســــــه
میســـــــالی زەهــــــری مـــــــاره، ورد یــــــا زل

ئەمانــــــــه و بـــــــاقی ئــــــەخلاقی خــــــراوه
«کـــلام اللــــه» کــــه گشـــــتی شـــــەرح داوه
لـــــه خــــاکی بـــاغ وەختـــێ ڕیشـــەبڕ بــــوون
ئــــــەبینی هــــــەر گوڵــــێ ســــــەد ئافتـــــاوه

هـــــەتا خـــــاوێنتـــــر بــــێ خــــاکی باغـــــت
موعەتتـــــەرتر بـــــه بـــــۆی، خۆشـــــه دەماغـــــت
لەگـــەڵ زانـــــا بــــه ئاگـــا بــــه کــــه نــــەگرێ
نەخۆشـــینی جەهالـــــەت، عەقڵــــی ســــاغت

خودایــــــا کۆمــــــەکێ بــــــۆ ئــــــەم بــــــژاره
بکــــــــه بـــــــــەم «زاری»یــــــــه دڵ پڕپــــــــەژاره
کـــــه بــــێ یاریـــــت پـــــاکۆ بـــــوونی بـــــاغی
محاڵــــه، لـــــەم هـــــەموو خاشـــــاک و خـــــاره

خۆشــــا ئـــــەو ڕۆژه وا لـــــەم داوه بــــــەربین
بــــه یـــــاری یـــــار لــــــەم گێـــــژاوه دەرچـــــین
ســـــەفەرمان وا لــــــــه پـــــێش و دووره مـــــەنزڵ
لـــه تۆشـــەی ڕێگـــه بـــۆچی بـــێخەبـــەر بـــین

هـــــەتا گیــــانم تیایـــــه بــــەر لـــــه مـــــەرگم

لــــە تــــەقوا بــــۆ نەکــــەم ئامــــادە بــــەرگم

گــــەلێ عــــارە لەگــــەڵ ئــــەم عــــومرە «زاری»

بــــە عوریــــانی کــــە لــــەم دنیایــــە دەرچــــم

زبــــان بــــێ فایدەیــــە تاکــــەی بــــدەم خــــول

لــــە هــــیچ و پــــووچ تاکــــەی گــــوێ بکــــەم شــــل

بــــڕاوە عــــومر، ســــاقی تێکــــە جامــــێ

بــــەرەو گوڵــــزار بــــاڵ ئــــەگرێت بولبــــول

ئیلاهــــی غــــەیری رەحمــــت نیمــــە دەســــگیر

لە چاکــەم، نامــە خاڵــی، پــڕ لــە تەقســیر

تکاکــــارم نییــــە بــــۆ رەســــتگاری

مەگــەر موویــێ ســفید و روویــێ وەک قــیر

بــــە کۆڵــــێ خەجڵــــەت و بــــاری خــــەتاوە

بــــە بــــێشــــەرمی و روویــــێ وا ســــیاوە

چلــــۆن پــــا هەڵــــگرم بــــۆ ئــــەو مقامــــە

لەوێــــدا عالــــەمێ ئــــەژنۆ شــــکاوە

لــــە قــــەول و فیعلــــی نــــاجۆر و مونــــاهی

هــــەزار «استــــغفرالله» یــــا ئیلاهــــی

لە تــۆوە لوتــف و فــەزڵ و عــەفو و بەخشــش

لــــە مــــن جــــورم و گونــــاه و عوزرخــــاهی

خەزێنــــەی هــــۆش جــــەردەی جــــەهل بــــردی

خەجاڵــــەت خــــۆم، بــــێ ئــــەمریم کــــردی

دڵــــم هۆشــــی لــــە دەس داوە، مەگــــەر تــــۆ

بــــە لــــوتفی خــــۆ بکــــەی دەرمــــانی دەردی

ئیلاهــــی بمخــــە ســــەر ئــــەو رێگــــە راســــە

بـــڕۆم پێــدا هـــەتا ئـــاخر هەناســـە
بپـــارێزە دڵـــی بـــێ هێـــز و عـــاجز
لــە شــەڕی وەسوەســەی ئــەو ئەلخەناســە

بــە ســەرما نــەفس و شــەیتانم نەکــەی زاڵ
نەچـــەرخێ روو بـــە لاری رەوڕەوەی حـــاڵ
زەمانـــە پـــڕ لـــە ئاشـــووبە و شـــەڕ و شـــۆر
منـــیش بـــێتـــیر و شـــیر و گـــورز و گۆپـــاڵ

شـــــەوێ تاریکـــــە دنیـــــا رۆژەکـــــانی
هــــەموو کاتێـــــک مەرگێکـــــە ژیـــــانی
وەرە گـــوێ بگـــرە غـــەیری ویـــردی دنیـــا
لــــە مزگــــەوتا نییــــە شــــام و بــــەیانی

موسوڵـــــمانیم وەک گوێزێگــــە پووچــــەڵ
بــیروونی ســاغ و نــاوی پــڕ لــە دووکــەڵ
لــــە ئیســــلاما موسوڵــــمانی وەکــــوو مــــن
گـــەلێ پـــایینتـــرە نرخـــی لـــە پشـــکەڵ

زەمانــــە پــــڕ لــــە فیتنــــە و ئــــەهلی غــــەمبار
نیــــە خــــاوەن دڵــــێ بــــێ ئــــێش و ئــــازار
لــــە هەرکــــەس هەرکــــە ئــــەڕوانێ ئــــەبینێ
بەســـــــەدها دەرد دوچـــــــارە و گرفتـــــــار

ئەگـــەر پێـــت خۆشـــە بـــێ قـــەدر و بـــەها بی
لـــــە لادێدا ئـــــەبێ چەنـــــدێ مـــــەلا بی
خەیاڵـــی شوغڵـــی وا هـــەرگیز نەکـــەی نـــەک
بـــــە ئـــــازاری چرووکـــــی موبتـــــەلا بی

یــــەکێ ئێــــژێ مــــەلا نــــوێژی درێــــژە

یــــەکێ ئێــــژێ حەریســــە حــــەق نــــەوێژە
یــــەکێ ئێــــژی مــــن ئەیناســــم بــــە پوولــــێ
هــــەتا ئێــــوارێ شــــیاکەی پــــێ بــــڕێژە

یــــەکێ ئێــــژێ خــــەریکی خواردنــــە و خــــەو
پــــڕە کیســــەی لــــە بــــەرتیلی ئــــەم و ئــــەو
عــــەجایب زرنگــــە بــــۆ مــــەردوم فــــریبی
شــــەقامی راســــی لاتاریکــــە وەک شــــەو

لــــە نــــاو ئــــەهلی وەهــــادا زینــــدەگی تــــاڵ
چلــــۆن نابــــێ مــــەلای بــــێحــــاڵ و بــــێمــــاڵ
میســــالی زەهــــری مــــارە ئــــەو ژیانــــە
لەگەڵــــیا بــــێ خوتــــە و بۆڵــــە و قســــەی تــــاڵ

تەماشــــا کــــە ئەگــــەر هۆشــــت لــــە لایــــە
کــــە میللــــەت چەنــــد بــــە دنیــــا ئاشــــنایە
لــــە مەزهــــەب ئەونــــە بێــــزارن لــــە لایــــان
ئــــەوەی بــــێ قــــەدر و قیمــــەت بــــێ مەلایــــە

ئــــەمن ئــــەو وەختــــە مــــەعلووم بــــوو کولۆڵــــم
ئەگــــەر کەوڵــــی مــــەلایی هاتــــە کۆڵــــم
بــــە هــــۆی شوغڵــــێکی وا بــــێ ئەرزشــــۆیە
لــــە ئــــەنزارا وەکــــوو بــــزنی گەڕۆڵــــم

چــــرام بــــێنەوتــــە، بــــێ ئــــاور تــــەنوورم
لــــە کورســــیی و لــــە گــــەرمی کــــوورە دوورم
لــــە میحــــراوا لــــە ســــەرما هەڵــــئەتووتم
بــــە عــــەینی شــــوانی بــــزنی شــــارەزوورم

بەراتی لادێ زۆرە ئەوەڵی ساڵ
وەلێ پایز کە حاسڵ دێتەوە ماڵ
قەراردادی مەلا وەختێ ئەنێرن
بڕێ بن بێژنگ و خۆڵ و دڕووداڵ

حەیا و ئابڕوو تاکەی بە قڕ دەم
بە وێنەی مار با ئەم کەوڵە فڕ دەم
ئەبێ لەم کارە بۆ کۆتا نەکەم دەس
نەجاتی خۆ لە هەر قوولە و سمڕ دەم

حەیاتێکم کە بوو قەدرم نەزانی
هەتاکوو تێپەڕی وەک خەو جوانی
بە بێهوودە لە دەستم چوو وەکوو مەست
خەزێنەی زێڕ و زێوی زیندەگانی

مەلایی بوو بە ئەسپاوی تڕۆییم
خەریکی شاعیریی و هەرزەگۆییم
ڕەفیقی بێدڵانم کورد و بستێ
بە دووی خاوەن شعوورانا نەڕۆییم

مەچۆ ریزی رزیوی کەچ خەیاڵان
ببیسە موژگاری پڕ کەماڵان
بۆ بارهێنانی بەعزێ بێدڵ و گوێ
مەدە نەقدی حەیاتی خۆ بە تاڵان

هەوا رێگەی بەرەو غەرقاو بردم
پەشیمانم لەوەی تا ئێسە کردم
بە ڕووزەردی خودا هاتوومە درگات
کە نیمە تۆشە غەیری رووی زەردم

نــــە کـــەس دەربەنـــدی ئـــازاری فـــەقیرە
نەکـــەس ئـــەنجامی تـــەکلیفی لـــە بـــیرە
لـــە بـــاتی زیکـــر و نـــوێژ و ویـــرد و تەســـبیح
لـــــە مزگـــەوتا قســـــەی مـــیر و وەزیــــرە

لەگـــەڵ هـــەر کـــەس ئەگـــەر ئـــەگری برایـــی
بـــــە دڵ تێـــــوە ئـــــەچی بـــــۆ ئاشـــــنایی
لـــــە ئـــاخردا لەگـــەڵ ســـەد ئـــاە و نالـــــە
ئـــــەبێ بگرینــــە بـــــەر ڕێگـــــەی جیـــــایی

چیـــە ئـــەی نەفســـی بـــێعـــاری خـــەتاکار
لـــەم ولـــەو گـــاز ئـــەگری هـــەروەکوو مـــار
لـــە خـــاکی تـــۆ ، لـــە ئـــاور نیـــت بـــۆچی
ئەســووتێنیت وشــک و تــەڕ بــە یــەک جــار

وەرە بـــــا پێکـــــەوە بگـــــرین ئـــــەی دڵ
کـــە دەردمـــان بـــێ دەوایـــە چـــارە موشـــکوڵ
نــە غــەمخوارێ، نــە هەمــدەردێ، نــە هەمــدەم
نــە هــەمڕاهــێ نــە ڕێگایـــێ، نـــە مـــەنزڵ

جیهـــــان بووکێکـــــە ڕازاوە لـــــە بـــــەرچاو
وەدووی کـــەوتوون یـــەک دەفعـــە ژن وپیـــاو
بـــەر و بـــەهرەی نـــەبوو، نابێـــت بـــۆ کـــەس
مەگـــەر دەرد و جـــەفا و ئـــاە و زووخـــاو

خودایـــــا غـــــەیری ڕووزەردی، تکاکـــــار
نییـــە بـــۆئـــەمنی بـــێ عـــار و گونـــەهبـــار
هیـــــوایێکم نییـــــە بـــــۆ ڕەســـــتگاری
بـــە غـــەیری عـــەفوی بـــێ پایـــانی غـــەففار

ئەمن نازانم ئەی دڵ تۆ چ کارەی
دووسەد دەردت هەیە و غافڵ لە چارەی
دەوایێ حەول دە بۆ بەرگری ژار
کە تێکەڵ بەم هەموو دووپشک و مارەی

ئەتۆ مردووی ئەی دڵ یا لە خەودای؟
وڕی یا گێژ؟ سەرگەرمی چ سەودای؟
رەفێقانت گەیشتن وا بە ئاوات
ئەتۆ ئەی بێ خەبەر هەروا لە خەودای

دوو سێ رۆژێ کە مێهمانی جیهانی
بە خاوەن ماڵ نابێ خۆ بزانی
پشوویەکت کە دا هەستە بەرەو ماڵ
بڕۆ تا دەچیە موڵکی جاویدانی

حەیاتی رۆح زانستە بزانە
نەزانی مەرگی جاویدانە گیانە
ئەوانە هەرکە زانا بوون زیندوون
شەرافەتیان گوم ناکا زەمانە

لە تاریکی نەزانینا ئەبێ بۆ
وەکوو دێو دابنیشی؟ دێو نی تۆ
کە ئینسانی لە گەڵ ئینسان دا بە
بە ئینسانی سەرف کە، زیندەگی خۆ

ئەمانە هەر کە عەللامەی زەمانن
وە مامۆستای زانستگەی جیهانن
هەموو شاگردی زانایەکی پێشوون
هەموو میهمانی سەر سفرەی ئەوانن

ئـــەوی رەسمـــێ ئەوانـــە دانـــەری بـــوون
ئەمێنێ و ماوە، مـەحفووزە لـە گـوم بـوون
کـــە ئاســـاری ئـــەوانت وا لـــە بـــەرچاو
بــە مردوویــان مەزانــە بەڵــکوو زینــدوون

هەراســـانم لـــە بـــێشـــەرمیت ئـــەی دڵ
بـــە کـــاری هـــیچ ســـەرگەرمیت ئـــەی دڵ
نـــە بـــۆ دیـــن و نـــە بـــۆ دنیـــا نـــەجووڵای
بڵـــێ پـــێم تـــۆ، خـــەریکی چیـــت ئـــەی دڵ

هــــەوا و فیــــز و خۆبینیــــت لا بــــە
بـــە عـــەیبی خـــۆت تـــۆزێ ئاشـــنا بـــە
کـــە تـــۆ غـــەرقی قـــوڕاوی هـــەرزەکاریت
بـــەم و بـــەو چـــۆن ئـــەبێ بێژیـــت چـــا بـــە

مــەچۆ شــەڕگای دوژمــن یــا ئەگــەر چــووی
وەکـــوو مـــەردان راوەســـتە بـــەرەو رووی
مەڵـــێ مـــن بـــێچـــەکم ئـــەو زۆردارە
بــە هێــزی دەســتی حــەق بشــکێنە بــازووی

لــە پێشــا خــۆت پــاکۆ کــە لــە هــەر ژەنــگ
کە بـۆ ئینســان نەقســە و پەســتیە و نــەنگ
ئـــەتۆ گێلاســـی بـــادەت وا لـــە ســـەر لێـــو
لـــە گـــەڵ مەســـتاندا نابـــێ بکـــەی دەنـــگ

خـــودا چـــاوێ کـــە خـــۆمی پـــێ ببیـــنم
لـــەچی بـــووم و بـــزانم چۆنـــە ژیـــنم
بـــە بـــێ هێـــزی و بـــێقـــەدری و خـــواریم
وەکـــوو هـــەم هەڵـــبڕە دیـــدەی یـــەقینم

ئــەتۆ ئــەو قــەترە قیــز لــێهەڵشــەواوەی
لـــەوێچی خۆڵـــی ئـــەو گۆشـــتە رزاوەی
زەریـــف بڕوانـــە چـــی بوویـــت و ئـــاخر
کــە خــاوەن ئــەم ســەر و ســیما تــەواوەی

بــە موڵــک و مــاڵ و دەوڵــەت بــۆ ئــەنازی؟
فریـــب خـــواردووی نەفســـی فێڵـــەبازی؟
دەمــی بــۆ داچەقانــدووی ئــەژدەهای مــەرگ
قــەپت پیــا کــات و وردت کــا بــە گــازی

«حەمەشــا» هــەر کــە دنیــای گرتــە بــەرچاو
تەماشــا کــە چلۆنیــان خســتە بــەرقاو
کونـــێ دەس ناکـــەوێ خـــۆی تـــێخزێنـــێ
هــێلانی لــێرووخــاوە و هێلکــە شــکیاو

نــەبوو دنیــا کەســێ دانــێ لــە ســەر تــەخت
دوو سێ رۆژێـک و پشـتی تـێنـەکا سـەخت
بـــە ســـێحری ســـاحیری وا غـــەڕڕە نابـــێ
مەگــەر ئینســانی نائینســان و بەدبــەخت

بـــە دەردی مـــەرگ بـــێ ئـــەو نیعمەتانـــە
بـــە دوویـــا ناکـــەوێ ئـــەم نەگبەتانـــە
مەڵـــێ خۆشـــی ژیانـــە و راحـــەتی تـــەن
کـــە زەهـــری قاتڵـــن ئـــەو لەززەتانـــە

وتوویانـــــــە ئەوانـــــــە وا بەهۆشـــــــن
بـــــە بـــــیر و گۆشـــــەگیر و کۆنەپۆشـــــن
قەناعـــەت عیززەتـــە نـــەک دەوڵـــەمەندی
ئـــــەوی دارایـــــە دایم دڵ پەرۆشـــــن

سـەگێكم دی برينـدار و كـز و لات
لـه خوێنـا هەڵكشـابوو عـاجز و مـات
وتم بـۆ وای، وتی چـووم بـۆ كـەلاكێ
پـەلامارێكم بـردێ وامـه لـێ هـات

مەگـەر نەتبيسـتووه قـاڕوون چ كـەس بـوو
گـەدايێ رووت و قـووت و تـەنگ دەس بـوو
فـەقيری عـار بـوو پـی، كەوتـه شـۆن مـاڵ
هەم ئەو لاش و هەم ئەم لاشی لـه دەس چـوو

بـه ئاسـانی خـودا لـەم بەنديخانـه
دەرێنـه ئـەم زەعيفـه ناتەوانـه
بەسـه لـەم حەسـرەت ئـاوادا ژيـانم
بـەرەو ماڵـی بـەقا بمكـه رەوانـه

كـه مـن «لاتقنطـوا» هێـزی دڵـم بـێ
لـه ترسـا بـۆ ئـەبێ شـين و كوڵـم بـێ؟
كـه «ان اللـه يغفـر» وا لـه گەڵـما
ئـەبێ فيردەوسـی ئـەعلا مەنزڵـم بـێ

جەماڵـت شۆڵـەيێكه دێتـه بـيرم
لـه موڵـكی كامكاريـدا ئـەميرم
بـەخاتردا كـه دێ يـادی جەماڵـت
لـه گێـژی بـەحری دێهشـەتدا ئەسـيرم

ئومێـدت بێـت و بشترسـه هـەموو ئـان
له حيلـه و مـەكر و فێڵـی نـەفس و شـەيتان
لـه گـەڵ خـۆف و رجايـەكی وەهـادا
بـڕۆ تـا دەچيـه ريـزی ئـەهلی ئيمـان

هەتاکوو دەرئەچی لەم بەحرە قووڵە
لە بەینی خۆف و ئومێدا بجووڵە
بزانە تاوەکوو ئاخر هەناسە
بەشەر نازانێ رەددە یا قەبووڵە

بەنی ئادەم گوزەرگەی دوو شەقامە
کە هەر یەک لە دووە بۆ یەک مقامە
یەکێ جەننەت، ئەوی دی بۆ جەهەننەم
ئەتۆش سەرپشکی هەرکامەت مەرامە؟

لە ژەنگی کوفر تا پاکۆ نەکەی خۆت
سەفای رۆح و دڵ، پەیدا نەوێ بۆت
ئەبێ بڕوات وا بێ هەردوو دەستی
سیابەختی لە ملتایە وەکوو کۆت

چیە داوێنی هیممەت کەی بەلادا
دەرێنی داوی بێکاری لە پادا
بڕۆی وەک رێڕەوانی پێشکەوتوو
بە رێگەی شێرمەردانی خودادا

لە سەر دڵ لابە ئەم گەرد و غوبارە
کە مایەی نەگبەت و رەنج و خەسارە
سەراسەر دەردە، سەرگەرمی بە دنیا
سەعادەت، تاعەتی پەروەردگارە

وەرن ئەی جوانەکانی بیر رۆشن
لە دۆزینۆی رێگەی حەق بکۆشن
نەزانی وەک کراژی مار، فڕێ دەن
جلوبەرگێ لە زانایی بپۆشن

بزانن ئەم زەمین و ئاسمانە
کە راگیراوە بەم نەزمە جوانە
خودایێکی هەیە زانا و بینا
بە ئەحوالاتی زەڕڕاتی جیهانە

وەرن با ئێمە ئەو زاتە بناسین
بە ناسینی لە گومڕاهی خەلاسین
بە بێناسینی ئەو نابینە ئینسان
ئەگەر چی ئادەمی بین، «الخناسین»

گوێ بۆ حەق ئەبێ بۆچی نەکەن شل
بە زنجیری نەفامی بۆ ئەدەن مل؟
جیایی و تەفرەقە و دووری لە ئایین
وەسیلەی نەگبەتە و بەدبەختییێ زل

هەمیشە گوێ قولاخن گشت بۆ شەڕ
وەلێ بۆ بیستنی حەق غافڵ و کەڕ
وەکوو قالۆنچە کۆ ئەبنۆ لە دەوری
لە هەر جێگا ببینن شیاکەیێ تەڕ

مەکەن دووری لەفەرمانی خودایی
لە ئاداب و رەوییەی موستەفایی
کە لادەن خۆ ئەهاوێنە عەزاوێ
گەلێ سەخت و گران و بێدوایی

جوانی گەرچی فەسڵێکی عەزیزە
دەمی عەیش و ژیانێکی لەزیزە
وەلێکن سەد ئەسەف کۆتایە عومری
دوو سێ رۆژێکە وەک عومری گەزیزە

ئەگەر خۆت خۆش ئەوێ و دارای هۆشی
ئەبێ بۆ ئەو ژیانە تێبکۆشی
کە هەر باقی ئەبێت و نابڕێتۆ
هەتا بڕوا زیادە شەوق و جۆشی

لە تۆ بینایی، ئەی بینا بە ئەحواڵ
ئەخوازم پی ببینم بەرزی و چاڵ
بینااییم گەر نەدەیتێ ئەی بینااییم
خەیاڵم باڵ بەسراوە و زبان لاڵ

بەراتت بێ ژمارە و رەحمەتت عام
بکە رەحمێ بە داماوانی ناکام
ببارێنە بە سەر موحتاجەکانا
لە هەوری رەحمەتت هەر سوبح و هەر شام

لە دنیا تێبفکری رەهڕەوێکە
ئیقامەتگاهی چەن رۆژ و شەوێکە
ئەوی رۆیی، ئەوی ماوە، ئەوی دێ
لە نووری سونعی باری پەرتەوێکە

لە دانی بەرگری ئەڵبەت محاڵە
تەقالا بۆ ئەوەی نەیدا بەتاڵە
بجووڵە و چاوەڕوانی بەهرەیێ بە
کەم و زۆری بە تەقدیرە حەواڵە

یەکێ جووڵەی کەمە بەشدار و بێغەم
یەکێتر زۆر ئەجووڵێت و بەشی کەم
نە ئەو توانیویە زیاتر کا بەشی خۆی
نە ئەمیان ئەم بەشەی خۆی کردووە کەم

برایانی جوان عومری تەمەن کەم
بەری داری دڵی پیرانی پڕ غەم
لە قانوونی دیانەت پێ مەکەن کل
لەگەڵ دنیا هەمووتان، شان سەرجەم

چ کارێکت بە مەیگێڕە و بە بادە
لە تەشبیبە و کینایە و رەمز لادە
نەپۆشیدە قسەی بێ پەردە خۆشە
بە مەستت تێئەگەن لادەی لە جادە

جیایی ئاورێکە ریشە بڕژێن
لە جەرگم بۆی ئەتکێ دەم بە دەم خوێن
وەرن یەک بین هەر «یەک» باقیە و حەق
دوویی، دەردی گرانە و بێخ رووخێن

جیا مەبنۆ لە حەق هەمڕاهی حەق بن
لە ئایین پەروەریدا حەیفە لەق بن
لەگەڵ یەکدا بژین پێکۆ بە نەرمی
لەگەڵ جیاوازەکانا بەردی رەق بن

نیشانێ پاک و پیسی پێ بناسی
لە بەرچاوە کە بڕوانی بەڕاسی
ئەوی پاکە بە قەول و فێعل و ئەخلاق
دیارە وەک ئەسێرەی سوبح راسی

ئەوەی ناپاک بێ کار و وتاری
درێژەی بێ رەوییەی چەوت و لاری
دەلیلی بەد سروشتی ئەو وجوودەن
کە ئەم سێ خەسڵەتەی تێدایە جاری

ئـــەوی چاکـــە بـــەرەو چاکـــە هـــەنگاوی
هەڵـــگرێ وا بـــە دەس عەقڵـــی لـــەغاوی
ئەگـــەر پـــای هەڵـــکەوێ زوو دێتـــەوە هـــۆش
ئـــــەدا پینـــــە لـــــە سیپاڵـــــی دڕاوی

وەلـــێکن بەدسروشـــتانی لـــە حـــەق دوور
لە نووری مەعریفەت مەحـــڕووم و مـــەهجوور
هـــەتا زیـــاتر لـــە ناحەقـــدا بگـــەوزێن
زیـــاتر شـــادن و خۆشـــحاڵ و مەســـروور

ئەوانـــــە وا گەرەکیانـــــە بـــــە چـــاکی
بـــڕۆن و بچنـــــەوە خـــــەوگای خـــاکی
ئـــەبێ کـــار و وتـــار و خـــووی خۆیـــان
هـــەتا زینـــدوون رابگـــرن بـــە پـــاکی

ئەگـــــەر خۆشـــیت ئـــــەوێت و کامگـــاری
ئەوێســـتا حـــەول دە بـــۆ رەســـتگاری
ئەوەنـــدە هـــەر کـــە ئـــەتوانی مـــەچۆ دەر
لـــە خـــەتتی موســـتەقیمی ئـــەمری بـــاری

بزانـــە غـــەیری ئـــەو دەســـتووره جوانـــە
کـــە خاســـەی خاتـــەمی پێغەمبەرانـــە
ئـــــەوی رێگایـــــە تاریکـــــە و بەتاڵـــــە
دەخـــیلم نەخڵـــەتی بـــەم رێبەرانـــە

وتـــار و کـــار و ئادابـــت هـــەموو جـــۆر
ئـــەوی ئەیکـــەی، ئـــەوی ئێـــژی کـــەم و زۆر
بەرابـــەر بگـــرە بـــەو قانوونـــە روونـــە
کـــە رووناکـــە هەمیشـــە هـــەر وەکـــوو خـــۆر

وەکوو بینینی چاو موحتاجی نوورە
وەکوو گیان بۆ بەدەن ئەمرێ زەروورە
بەشەر بەو جۆرە موحتاجە بە رەهبەر
بە بێ رەهبەر کەمالاتی قوسوورە

خوسووس ئەو رەهبەرە دڵسۆزمانە
ئەمین و راس و خێر ئامۆزمانە
ئەبێ یادی لە دڵدا بێت، یادی
شفا بۆخاتری ئاڵۆزمانە

دڵی حەقناس، بێ یادی جەماڵی
وەکوو ماسی لە وشکیدایە حاڵی
دڵی ئەم عەسرە ئەغڵەبیان مردوون
کە عاجز نین بە دەرچوونی خەیاڵی

دڵا گەر زیندووی، دارای هۆشی
ئەبێ بۆدەفعی دەردت تێبکۆشی
بە دامانی حەکیمێ دەست بگرە
کە بتوانێ بکا دەفعی نەخۆشی

لە ئێش و ژانی دەست و پا مەترسە
لە زەخمی هیچ ئەندامێ مەپرسە
ئەمانە لاشە ئەمرێنن شتێ نین
لە ئازارێ کە رۆح ئەکوژێ بترسە

ئەگەر پێت خۆشە تۆزێ خۆ بناسی
لەگەڵ دەستەی چەپی یا دەستە راسی
بە میزانی شەریعەت خۆ بکێشە
ئەزانی پەڕنیانی یا پلاسی

بـــه پێســـی شـــێر ئەگـــەر داوای شـــێری
بکـــەی، بـــێ حورمـــەتی بـــۆخـــۆت تێـــری
کـــه نـــــەعرەت داوه ئەتناســـن، ئـــەزانن
ئەگـــەر ئـــەو گوێـــدرێژەی دوێ و پێـــری

وەهـــا چاکـــه کـــه بـــەم وێنـــه نـــەنازین
لـــه خـــۆ بـــۆ چـــی بـــه بـــێکـــردار رازیـــن
چلـــۆن رێمـــان ئـــەدەن بـــۆ ریـــزی پاکـــان
بـــه ســـوورەت ئـــادەمی، ســـیرەت بـــەرازین

خـــــــودا ناشـــــــارەزا و ڕێنـــــــەزانم
ئەگـــــەر رەحمـــــت نەبێتـــــه پشـــــتیوانم
ئـــەبێ بـــۆ کـــوێ بچـــم یـــا روو لـــه کـــوێ کـــەم
لـــه کـــوێ پەیـــدا بکـــەم جێگـــەی ئـــەمانم؟

خـــودا گـــەر شیشـــەی عەهـــدم شـــکاوه
دڵـــم دەســـتی لـــه رەحمـــت بەرنـــەداوه
بـــــه بـــــازوویی تـــــەوانایی خوداییـــــت
دەرم بێنـــــه وەکـــــوو خســـــتمته چـــــاوه

لـــه وشـــکیدا لـــه هـــەر هـــەرد و هـــەوارێ
گژوگیـــا، هـــەرچی بـــوو ســـووتا بـــه جـــارێ
ئـــــەبێ بـــۆچی نەگاتـــه بارەگـــای حـــەق
نزوولـــەی وەحـــش یـــا ناڵـــەی هـــەژارێ

کـــــه تـــــێفکـــرین ئاڵـــۆزی زەمانـــــه
نەتیجـــــەی کـــــردەوەی تاریکمانـــــــه
کـــــه عادەتمانـــــه دەس بـــــەرداری نـــــاوین
قـــــوڕاو و دار و بـــــــەردی رێگەمانـــــــه

نە هەورە ئەم سەماپۆشە بە جاری
بوخاری جەورە، مەرگی لێ ئەباری
مەساف ئارایە شەیتانی عەداوەت
مەلەک لەم فیتنەیە خۆ دانەشاری

بەری ئەخلاقی خۆمانە ئەباری
بە سەرمانا وەکوو ئاور بەجاری
هەتا شێوەی خراوی خۆ نەگۆڕین
ئەبێ بۆ خۆشی، نەتبێ ئینتزاری

بە پامانا بچێ ڕۆژێ دووسەد خار
بە سەرمانا بڕووخێ دار و دیوار
جەزای ئەتواری ناهەموارمانە
بە زوڵمی تێمەگە ئەی یاری هۆشیار

بەهاری خوێنباری کوردستانە
سەقز خوێناوییە وەک شاری بانە
لە سەردەشت و مەریوان و سنەی دا
زوهووری فاجیعەی ئاخر زەمانە

بەسە ئەم کوشت و کوشتارە ئەبێ بۆ
بڕووخێنین بناغەی یەکیەتی خۆ
بە جۆگەی سوڵحدا ئاوی برایی
هەتا نەڕوات ئاور ناکوژێتۆ

بەنی ئادەم لە بەڕن یا لە بەحرن
بکەن بڕوا، ئەبەد نامێنن ئەمرن
جیهانێکی هەراو و پان تێدا
برایانە بژین و پیلە مەگرن

ئەمـــــە مەعلوومـــــە لای ئـــــەهلی ســــەلیقە
وەســــــیلەی بــــــەرزی و نزمــــــی رەفیقـــــە
رەفیقـــــــی پاک، پاکــــــت بـــــار دێنـــــــێ
رەفیقـــــــی پـــــیس ئەتخاتـــــە مەزیقـــــە

لــــــە داوێـــــن ئاشـــــنایێ دەســـــتی کۆتـــــام
خودایـــا گـــیر کـــەی تـــا ئـــەهلی دونیـــام
رەفیقـــی چـــاک تەئســـیری لـــە ســـەگ کـــرد
لەگـــەڵ چاکـــا لـــە چاکـــانی ســـەرئەنجام

هـــــەتاکوو کـــــەی شـــــوانی گـــــا و کـــــەر بم؟
لـــــە ئینســـــانی هەتاکـــــەی بـــــێخەبـــــەر بم؟
لـــــە ملمـــــا بـــــێ ئەگـــــەر ئـــــەم کۆتـــــە هـــــەروا
ئـــــەبێ بـــــێبـــــەش لـــــە ئـــــەخلاقی بەشـــــەر بم

بـــــەنی ئـــــادەم زیـــــاتر حـــــەقنەناســـــن
حەســـــوود و شـــــەڕفرۆش و ناسپاســـــن
ئەڵـــێن راســـین گشـــتمان هـــەروەکوو تـــیر
لـــــە لاریـــــدا ئـــــەبینی میســـــلی داســـــن

ئەگـــــەر عـــــومرم ئـــــەدەیتێ بـــــێبەهانـــــە
بـــــۆ تـــــیری دەرد بـــــۆ ببمـــــە نیشـــــانە؟
دەوا و دەرد هـــــــی تۆیـــــــە ئـــــــەبێ بـــــــۆ
حەواڵـــــەم کـــــەیت بـــــەم بـــــێتەجرەبانـــــە

دەمـــــێ مـــــەئموور گیـــــانم لـــــێ ئەســـــێنێ
زبـــــانم لـــــەنگ و چـــــاو مۆلـــــەق ئـــــەمێنێ
بـــــە غـــــەیری رەحمـــــی بـــــێحـــــەددی ئیلاهـــــی
کەســـــێتـــــر کـــــوا لـــــە گێـــــژاوم دەرێنـــــێ؟

خودا بەو رەحمەتە بێئینتیهاتە
دڵی تەنگم بە ئومێدی نەجاتە
ئەگەر نووری جەماڵت دابپۆشێ
نە من، عالەم گرفتاری نەهاتە

کەریمی و رەحیمی و خەتاپۆش
بە بۆی «لاتقنطوا» زیندووم و دڵخۆش
ئومێدی رەحمەتی تۆ قەتع ناکا
مەگەر ئینسانی بێویجدان و بێهۆش

خودایا من دڵێ داوا ئەکەم لێت
هەمیشە شوغڵی زیکر و فکری تۆ بێت
بە فەزڵت ئیتمینانێ وایە پێ بە
بە هیچ لافاو و رووداوێ نەڕووخێت

ئیلاهی بمخە ناو ئەو رەهرەوانە
کە «لاخوف علیهم» بۆئەوانە
لە قووەی لایەزالی، بۆسوپاست
تەوانایی بدە بەم ناتەوانە

بە مڵک و ماڵ دیم نابێ نەجاتم
بە دەروێشی ئەوا درگات هاتم
لە بەحری جوودت ئەی جەوادی وەهھاب
بەشم تا زیاد بەی، زیاتر گەداتم

دیاریت کردووە دوو رێگە بۆمان
لە هەردوو رێگە سەرپشکین خۆمان
یەکێ بۆباغ و بۆ گوڵزار ئەڕوا
یەکێ بۆ خار و مار و نار و زیندان

بەشـــەر هـــەر کامیـــانی کەوتـــە بـــەر دڵ
ئـــەڕۆ پێـــدا هـــەتا ئەیباتـــە مـــەنزڵ
لـــەوێدا بـــێگومـــان مـــەعلووم ئـــەبێ لی
بـــەرەو خـــارە شـــەقامی یـــا بـــەرەو گـــوڵ

دڵـــێ خاڵـــی لـــە یـــادت بـــێ، زوخاڵـــە
زبانـــێ بـــێ سوپاســـت بێـــت، لاڵـــە
کـــەڕە ئـــەو گـــوێ کـــە ئایاتـــت نەبیســـێ
جەماڵـــت گـــەر نـــەبینێ چـــاو، چاڵـــە

دڵـــم بـــا ماڵـــی تەمجیـــدی ئـــەتۆ بـــێ
زبـــان مەشغووڵـــی تەحمیـــدی ئـــەتۆبێ
کـــەلامت بـــا لـــە گوێمـــا بێـــت دایم
هەمیشـــە چـــاوی تەئییـــدی لـــە تـــۆ بـــێ

لـــە بـــەحری رەحمـــەتت یـــا حـــەییی مـــەننان
هـــەموو کـــات و دەقیقـــە و لـــەحزە و ئـــان
بـــڕێژە ســـەر وجـــوود و رۆحـــی پـــاکی
«رســـول اللـــه» و «آل بیـــت» و یـــاران

ئومێـــدم وایـــە ئـــەو دەریـــا بجۆشـــێ
تـــەواوی پەیـــڕەوانی ئـــەو بپۆشـــێ
کەســـێ بەشـــدارە لـــەو دەریایـــە «زاری»
کـــە ئەمـــڕۆ بـــۆ نـــەجاتی تـــێبکۆشـــێ

# ٦٥

## چوار هۆنراوەی زاری بۆ کوردەواری

به ناوی خودا

پێغەمبەری ئیسلام ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە ئێوە کارێکی نارەوای دی ئەبێ بەرگری بکا، ئەگەر بە زۆر نەیتوانی بە زبان، ئەگەر بە زبان بۆی نەکرا، بە دڵ، وە ئەم ئاخرەیان بێهێزترین بڕوایه.

لەم عەسرە حازرەدا کاری نارەوا کە بووە بە لافاو و زیادەڕەوی لەوانا لە ئەندازە دەرچووە و بووە بە جوزئی مەزهەب بۆقیسمەتێ لە ئەهلی رۆژگار کە بە زۆر ناتوانین بەرگری بکەین پێویستە بۆ ئەدای وەزیفە بە زبان برایانی ئایینی ئاگادار کەین کۆتایی بەن بە چەن کارێ کە زیادەڕەوی لەوانا بووە بە هۆی ناشیرینی ئادابی ئیسلام.

١. بێئیحتڕامی لەگەڵ مزگەوتەکان
٢. بێئینسافی ژن بە شوودان
٣. رەشبەڵەکی پڕ لە رسوایی و نێر و مێ تێکڕژان
٤. تاڵان کردنی مردوو لێمردوو بە ناوی سەرخۆشی لە خزم و خێشان.

ئەم خزمەتگوزارەی خۆتان بۆ ئەم چوار مەتڵەبە چوار هەڵبەستی هۆنیوەتەوە ناوی ناوە «چوار هۆنراوەی زاری بۆ ئامۆژگاری کوردەواری» وا پێشکەشتان ئەکات، گوێی لێ بگرن.

### هەوەڵ: بێئیحتڕامی لەگەڵ مزگەوتەکان

شەوێ تەنها بووم، مات و دڵشکاو — کردەی خۆمانم هاوردە بەرچاو
بە میزانی شەرع گرتم بەرانبەر — سووکتر لە هەوام هاتە بەر نەزەر
زیاتر کردەمان چوون بە هەوایە — نە بە وەرگرتن لە مامۆستایە
بەتاڵە و تێکەڵ خڵتەی نەزانی — لە حەق خاڵییە، پڕ لە شەیتانی
لە ئینسانیەت تەواو چووینە دەر — بە شعوور دێوین، بە سوورەت بەشەر
لە ریزی ئەهلی هۆشا نەماوین — لەم مامەڵەدا زۆر خەڵەتاوین
ریا و فێڵ و فەن ناو ئەنین ئیخلاس — تا مەشهوور ببین بە پیاوێکی خاس
ئەوی کارمانە پێچەوانەیە — راسمان گوریسی ناو هەوانەیە
کوردین، لادێیی، بێچارە و نەزان — بێ خەبەر لە وەزع مردن و ژیان
بە سەد نەخۆشی دینی دوچارین — عیبادەت ناقیس، عەقیدە لارین
هەنگاوێ نانین بەرەو رزگاری — کەوتووینەتە شۆن کاری بێعاری

دین لە مەرگایە غەمی بۆ ناخۆین     بە سەر بۆ ناو کار ناڕەوا ئەڕۆین
بە تیری گوناه دڵ لە سەد لاوە     زەخمارە بەرێ ناکەینە لاوە
وەلێکن ئەگەر سەرمان بێتە ئێش     ڕێگەی بێهداری، گورج ئەگرینە پێش
بۆدەوا و دەرزی دەفعی سەر ئێشە     لە گەڵ دوکتۆرا ئەکەین وەکێشە
وەلێ بۆ نەجات ئەبەد لە خەتەر     باوەڕمان کەمە بە خوا و پێغەمبەر
حەدیس نابیسین، ئایەت ناژنەوین     نازانم مردووین، یا غەرقی خەوین
برا من کوردم، لادێ نشینم     وەختێ کە وەزعی لادێ ئەوینم
دنیام لە بەرچاو وەها ئەوێ تەنگ     ویجدان نایەڵێ دانیشم بێدەنگ
ریشەی برایی تەکان ئەدا پێم     ببیسن یا نە، مەجبوورم ئەڵێم
لادێ نشینان، براکانی کورد     لە بەیاناتم تێبفکرن ورد
بە چاوی بینای هۆش لی بڕوانن     ژێرەو ژووری کەن هەتا ئەتوانن
ئەگەر سەحیحە وا لی‌بگرن گوێ     عەمەلی پێ بکەن، مەیخەنە بەرپێ
ئەگەر غەڵەتە وەری مەگرن لێم     لە جێی ئافەرین جوێن بدەن پێم
شکاتم زۆرە لە ئەتوارتان     لە بەد ئەخلاقی و شێوەی لارتان
ئێوە تێفکرن، هیچ خەبەرتان هەس     کە موسوڵمانی بووە بە هەوەس
دنیا پەرەستی لە حەد دەرچووە     داوێنی ئایین لە دەس بەر بووە
درۆ و دەسبڕی و ناڕاسی باوە     حەڵاڵ و حەرام هەر ناویان ماوە
ئێژن بەهەر جۆر نەفعێ دەس کەوێ     بینێرە باخەڵ پێت حەرام نەوێ
ئەدەب لە لادێ سەری پێچاوە     ئێسە بێ‌شەرمی ئەدەبی ناوە
هەرکەس درۆزن، لار و دەسبڕ وێ     بێ‌حەیا و فەساد، تووڕە و دەم شڕ وێ
دووڕوو، دووزبان، ئەهلی کینە وێ     بۆبەنای فیتنە و شەڕ بنچینە وێ
ئەوە ماقووڵە و باڵانشینە     جێگەی باوەڕە و راسە و ئەمینە
ئەوە سەد فێڵی وا لە ژێر سەردا     لە سەر کورسیە، وا لە دەفتەردا
ئەمما ئەوانە پارێزگارن     ئەمین و بە دین جێی ئیعتبارن
بێ‌قەدر و بەها، بێ‌خەریدارن     تەڵان و لە تۆی خاکا پێوارن
ئەمانە تۆخوا با دەرچێ لە بەین     بێن با تەماشای شێوەی خۆمان کەین
ئەونە نەفام و ئەبلە و مەغروورین     تا چاو بڕ ئەکا لە ئایین دوورین

وا تەکمان داوە بە لای دنیاوە
ڕەسمی ئایینمان لە بیر نەماوە

لە نەزانیا دڵمان وا غەرقە
مزگەوت و بازاڕ لامان بێفەرقە

مزگەوتەکانمان لە تاعەت خاڵی
هەموومان سەرگەرم شێوەی مناڵی

تەکیەکان خاڵی لە ریازەتکێش
لە جەزبەی سۆفی و لە یاهووی دەروێش

بێفەرش و بەرماڵ پڕ لە خاکوخۆڵ
بە عادەت ئاوا، لە عیبادەت چۆڵ

هاتوچۆی مزگەوت بۆ ڕەزای باری
لە لادێکانا نەما ئاساری

ڕۆیین ئەو دەستە زەحمەتکێشانە
ئیسە سالکیان کاڵەمێشانە

هیچ فەرقی نییە لەم زەمانەدا
خانەقا لە گەڵ قاوەخانەدا

مزگەوتەکانمان کاروانسەرایە
جێگەی مامەڵە و قوولە و هەرایە

لەباتی وێردی سوبح و ئێوارە
باسی کەر و گا و پەز و پەروارە

یا باسی کەوە یا کەروێشکە ڕاو
یا چەشتەی ڕێوی، تەڵە و دانە و داو

بە شەودا جێگەی گۆڕەوی بازی
حیکایەتخوانی و مەسخەرەسازی

زەمانێ مەیدان گەمەی مناڵە
دەمێ وەرزشگا بۆ کوڕ و کاڵە

لەباتی سەدای خەتم و تەهلیلە
هووشەی سیغار و فیشەی سەبیلە

ئەونە ڕەواجە بازاڕی درۆ
گوێگر لە مزگەوت جێگەی نابێتۆ

ئەگەر فەقیرێ بێژێ وا ناوێ
تۆ خوا براکان بێدەنگ ون تاوێ

ئەیدەنە بەر شاخ بەر تانە و تەشەر
ئەڵێن بێدەنگ وە، هەستە بڕۆ دەر

مەعلوومی نەزەر ئەهلی شعوورە
کە قیبلەی مزگەوت بووە بە کوورە

میسالی کەعبە لە هەر چوار لاوە
خواهە بە دانیشتن یا خۆ بە پاوە

دەوری لێئەدەن، گشت ڕووی تێئەکەن
غەریب و نەناس کەمتر جێئەکەن

وەختی دانیشتن ڕووبەڕووی کوورە
ئەوێ وە چەقە، وە حەچە و لوورە

ئەیکەن وەهەرا وە شەڕە دەنووک
هەموو دوازدە عیلم، گەورە تا بچووک

بێخەبەر لە وەزعماڵی خۆیانن
خەبەری تەواو دنیا ئەزانن

خەجاڵەت نابن لە درۆی بێجا
ڕووبەڕووی یەکتر هەڵدێنن سەدا

بەم شێوە لارە ناتەواوەیان
کەف ئەکەوێتە لالەغاوەیان

کەس حاڵی‌ناوێ لەقسەی هیچ کەس
گوێگر هەر کوورەی بێچارەیە و بەس

کە بە یەکدەفعە دێنە سەر باسێ
سەگ خاوەنی خۆی ئەسڵەن ناناسێ

نە ناوی دینە، نە باسی ئیمان     نە یادی تاعەت، نە باسی ئیحسان

نە لە واجبات حەرفێ ئەپرسین     نەلە مکافات حەتتا ئەترسین

نە لە ئیتاعەی حەق ئەبەین ناوێ     نە دائەنیشین بێ هەرا تاوێ

فەسڵی زمستان کە بێکاریە     فرسەتی ئەدای فەرزی باریە

لە بەر کرێوە و زمهەریر نەوێ     ئەحەدێ ڕێگەی مزگەوت ناکەوێ

یا لە سەربانان یا لە بن دیوار     گشت دائەنیشن بەتاڵ و بێکار

ئەغڵەب مزگەوتان لاشیپان رووخاو     بێچرا و بەرماڵ، پەنچەرە شکاو

تەپوتۆزاوی لە خاک و خۆڵ پڕ     جاڵجاڵووکاوی، دار و دیوار شڕ

مێحراو بێئیمام، بانگ وێژ نادیار     جەماعەت بێشۆن، جومعە بێئاسار

بۆ ئەدای ئەمری دین بێخەریدار     ئەوان بە دەستە لە تاعەت بێزار

دڵی ئەهلی عەسر، وەها رەش بووە     زۆریان لە بیستن حەق بێبەش بووە

ئەوەندە بێزار لە زیکر و دۆعان     پشت لە مزگەوت و ڕوو لە سینەمان

باسێ لە مزگەوت نییە لە کاردا     بەرەو سینەما گشت وان لە غاردا

سینەما ئاوا، بازاڕی بەفەڕ     بۆدەستەی نەفام هەرزە و ئەهلی شەڕ

بلیت ئەسێنن بە دیدە و بە گیان     بۆ گوێ ڕاگرتن لە درۆ و بوهتان

وەختی تەماشای پەردە، پیاو و ژن     ئەچنە باوەش یەک، سواری یەک ئەبن

دەستەی جەوانان نێر و مێ یەکسەر     هەموو موشتەری کاری شەرم ئاوەر

ئاشنا لە گشت کووچە و کۆڵانن     وەلێکن ڕێگەی مزگەوت نازانن

تاریکی هەوا پۆشی ڕۆژی دڵ     بێشەرمی رەواج، دیانەت باتڵ

براکان مزگەوت جێگەی نوێژە     کێ وتی مەخسووس پڕوپووچ وێژە

یا بە فتوای کێ ئێوە ڕێی مناڵ     ئەدەن بۆ مزگەوت سەرفەڕش و بەرماڵ

لیباس ناخاوێن، قەبیح و چڵمن     پیس و قوڕاوی، چەپەڵ و چڵکن

بۆ ئەبێ ئەوەی قڕە و هەرا وێ     لە لادێکانا لە مزگەوتا وێ

مەگەر ڕێگەتان نەکەوتۆتە شار     نەچوونەتە ناو مزگەوت جاروبار؟

هەتا بزانن چۆنە ئیحتیرام     عیبادەتخانە لە لای ئەهلی فام

یا وا ئەزانن خوای لادێ و شار     دوانن. هاوار، لە دەستان هاوار

مزگەوتی لادێش عیبادەتگایە     سوجدەگای مەردان حەق ئاشنایە

بینای بۆ تاعەت، بۆ کاری چاکە — نە بۆ گاڵتە و گەپ، کاری ناپاکە
قابیل ئیحتیرام، مەحەل بۆ ئەدەب — دین پەروەرانی عیبادەت تەڵەب
بۆ بوو بە جێگەی گاڵتە و بێعاری — عیبادەت لەوا نەما ئاساری
نازانن خودا چاوی وا لێتان — وا بێ ئەدەبی عار نیە پێتان
فاییدەی چیە پڕوپووچ وێژی — قەزای فەرز کە، گەر ئەهلی نوێژی
دەم بۆ توڕڕەهات بۆ بەڕەڵڵا وێ — با مەشغووڵ زیکری «سبحان اللە» وێ
لە باتی ناوی ئەم و ئەو بردن — پێتان زەرەرە ئیستیغفار کردن
زبان بۆ خاتر زیکری خودایە — نە بۆ غەیبەت و باسی بێجایە
بە چاکە وێژی بۆ نەیخەینە کار — پێ نەکەین حەمد و شوکری کردگار
بۆچی بەڕەڵڵای وەک گورگی هار کەین — برا و ئاشنای خۆی پێ زەخمار کەین
هاتوچۆی مزگەوت بۆ رەزای خواس — نە بۆ بێعاری و کاری ناڕەواس
ماڵی تاعەتە هۆشتان ببێ، هۆش — مەیکەن وە بازاڕ خەرید و فرۆش
دەنگ بەرزۆ مەکەن لە نوێژ و زیکرا — لە هەرچی ئێژن بچن بە فیکرا
بزانن لە گەڵ کێ لە نوێژدا — ئەوێسن، چۆنن لە وتوویژدا
بانگەواز کردن بۆ شتی گوم بوو — خەرید و فرۆش، هەرا و قاوقوو
نەقڵ و حیکایەت باسی دونیایی — چەنە درێژی، سواڵ و گەدایی
خواردن و خەوتن، بێعوزری سەحیح — لە مزگەوتدا حەرامە و قەبیح
عومری بەنرختان مەدەن بە هەدەر — لە شەقامی راس ئیسلام مەچنە دەر
مەدەنە دەستی هەوا لەغاوتان — هەستن بۆ قەزای نوێژی فەوتاوتان
بە دڵ بە زبان خواتان لە بیر وێ — ئەمەیە ئەدەب، بۆ کەسێ ژیر وێ
بێن با هەمووماں روو بکەینە حەق — نەفس و هەوامان بدەینە بەر شەق
بۆچی سەرتاپا غەرقی دنیا بین — رۆژێ نەفەسێ با بۆ خوا بین
وەختی دێ مزگەوت ئەوی تیا بکرێ — داوای شاهیدی بە حەق لێ بکرێ
وەبێزیاد و کەم هەرچی بزانێ — بەیانی بکا و حاشا نەتوانێ؟
یانی ها هەرچی بکرێ لە مزگەوت — ئەیگرێ درووس وێنەی زەبتی سەوت
ئەوی تیا بکرێ لە کار لە گوفتار — بە بێزیاد و کەم گشت ئەکا ئیزهار
وا چاکە کەمێ روو لە ژێری کەین — لە هەڵەوێژی جڵەوگیری کەین

له ئادابی چاک بێزاری تا کەی؟ — شێوەی هەرزەیی و بێعاری تاکەی؟
جەوانی ڕۆیی پیری ئەوا هات — ئامادەی مەرگە سەراسەر ئازات
تا هەرەسی مەرگ نەیناویتە ژێر — پشت هەڵکە لە شەڕ ، ڕوو بکە لە خێر
تاکەی دەس هەڵگر بەتاڵی ناوین — وا توانەوە وەک وەفری هاوین
ئەبێ بۆ ئەونە هۆشمان نوقسان وێ — مشک و پشکەڵمان لە لا یەکسان وێ
بۆ کەوتینە ناو ئەم درک و داڵە — بە چ هیوایێ چیمان خەیاڵە؟
گوهەرمان بۆچی دا بە بەردی ڕەق — تەلامان بۆچی فڕ دا بە ناحەق؟
بۆچی لامان دا لە شەقامی ڕاس — بووین‌وە سەردەستەی دەستەی الخناس
باوەڕتان ئەگەر نیە بە مەلا — بڕۆن بپرسن هەرکەس لە هەر لا
هەیە فتوایێ جێگەی بڕوا بێ — کە مزگەوتیش وەک کاروانسەرا بێ؟
یا مزگەوت جێگەی گەمەی منال وێ — دووکانی بەزاز، چەرچی و بەقاڵ وێ؟
چوونت بۆ مزگەوت بەم مەنزوورە وێ — پشتت لە قیبلە، ڕووت لە کوورە وێ
ڕۆژی قیامەت بە تەما نەوی — ناو جەماعەتی ڕزگاران کەوی
ئیسلام ناوێکی مابوو لە ناودا — ئەویش یەک دەفعە درا بە ئاودا
بە ڕیا و درۆ و دەسبڕی و لاری — شاراوە، گووم بوو، کەوتە پێواری
گشتمان ئەزانین ساڵێ نە مانگێ — لە ئەغڵەب دێ دا ناوترێ بانگێ
جومعە و جەماعەت، غەریب و بێناو — تەسبێح و تەهلیل کەم دێتە بەرچاو
ئەمە بەس نییە بۆ خراویمان — بۆ دواکەوتوویی و بەجێماویمان
بکەوینە شۆن هەوا و هەوەسمان — لە دامانی دین بەر بدەین دەسمان
ئەبێ بۆ نەکەین ڕەحمێ بە خۆمان — کێ ئەکا تیمار، زامی بەسۆمان
تێکۆشن بۆ کار یەقینتان وا وێ — هیچ کەس بێعەمەل نەجاتی ناوێ
تێکۆشە بۆ کار، نەفست مەبیسە — بێکار کەی ئەجری کردووەتە کیسە
کۆچی ئاخری هاکا هات کاکە — لادە لە خراو ڕوو بکە چاکە
نەکا لە ناکاو مردن بێتە ڕێت — «قابض الارواح» درگا بگرێ پێت
مووددەی ژیانت ئەگەر بڕاوە — بە هیچ تەدبیرێ نایێتە دواوە
نە بۆ هاتنەوەی دنیا ڕێگە هەس — نە بۆ مەعزەرەت خەتا جێگە هەس
«زاری» بێژە ئەم قەومە بێعارە — با دەس هەڵگرن لەم کارە لارە

### دووەم ـ باسی بێئینسافی ژن بە شوودان

داوای هاوکاری با لە زوان کەین     کەمێ خراوی خۆمان بەیان کەین
عەشرەت! وا ئەوێ خواناسیمان     شەیتان ڕەم ئەکا لە ناڕاسیمان
هەتا نەزانی تان و پۆمان وێ     ئەبێ ڕسوایی خاسسەی خۆمان وێ
بێهۆش و نەزان، بێخەبەر لە دین     تووڕە و بێتاقەت عاقیبەت نەبین
ئەونە مەسخەرەی هەوا و هەوەسین     لە هەموو لایێ بێقەدر و پەسین
کەوای عیففەتمان کێشا وە قوڕدا     پارێزگاریمان بە جارێ فڕدا
ڕەفیقی جەفا، لە سەفا دوورین     بە درۆزن و بە دز مەشهوورین
بێجیهەت خوێنی یەکتر ئەمژین     لە سەر شەڕەسەگ یەکتر ئەکوژین
لە هەرا و قڕە مەجلیسمان پڕە     سولح و سەفامان شەڕە و سمڕە
لە ئەخلاقی چاک تەواو بێبەرین     بۆیە پاییتر تیرەی بەشەرین
بۆ ئەوە ئەگەر بینەوە سەر هۆش     شێوەی ئینسانی نەکەین فەرامۆش
بە هەموو قووە بانگ ئەکەم لێتان     گوێ بگرن ئەدەم ئاگەهی پێتان
لەمە زیاتر با نەوین بە پەن     ببیسن قسەم لە هەرجێ کە هەن
براکانی کورد: کەیخودا، ڕەئیس     عەیبێکمان هەیە بێئەندازە پیس
تەواوتان لە من باشتر ئەزانن     وەلێ بێ ئەمری شەیتان ناتوانن
فەرزە کە پێتان بێژم ئاشکرا     هەتا بزانن گشت قەوم و برا
ژن فرۆشتنە بە پارەی بێحەد     بە هەزار هەزار، نە بە پەنجا و سەد
هەتیوێ ئەگەر بێتو ژن بێرێ     کەیخوا بۆماڵ تەرەف بێنرێ
ئەبێ چەند هەزار نەقد بژمێرێ     بیکاتە کیسە و ئەوسا بوێرێ
بێژێ کەیخودا بکەن هاوکاری     ئەمە پووڵ، بڕۆن بۆ خواستگاری
دوای چەن کەشمەکەش هەرا و فێڵ و فەن     بە ناو شیربایی تالانی ئەکەن
هەر بەو مەجلیسە لە ژن هێنانیا     لونگی گەدایی ئەدەن وە شانیا
بۆ شڕە و شاتاڵ شیرینی خواردن     زەخیرە بۆ ماڵ خەزوورە ناردن
ئەبێ کۆتی قەرز بکاتە گەردن     پەنا بۆ بەزاز بۆ بەقاڵ بردن
یەک بە دە، باری قەرزی بێتە سەر     بۆی نەدرێتەوە تا ڕۆژی مەحشەر

ملی، کۆتی قەرز دایبنەوێنێ    خاوەن قەرز عەیشی لێ بشەوێنێ

مەنزڵ بێچرا، سفرە بێپێخۆر    تەنوور بێئاور، گوزەران ناجۆر

بووک بێنەفەقە، زاوا زویر بێ    خێشایەتی وا یاخوا وە قیر وێ

ئەم لە رەنجبەری ئەو لە لاپێژی    نەجاتیان ناوێ لە شیاکە ڕێژی

قەومەکان پێتان باشە کاری وا    ژیانیان وا وێ دوو هەژاری وا؟

تالانی یەکتر، بە ناو شیربایی    مەکەن براکان بەسە رسوایی

هەی داد هەی بێداد لە بەدکاریتان    لەم تالانی سەخت پڕ خەساریتان

بزانێ هەموو شیربایی سێنێ    خێشایەتی وا عەداوەت دێنێ

ژنخواز کە زانی هیچی نەماوە    بێنەقد و بێجنس خانە خراوە

بیر ئەکاتەوە لە کردەی شوومی    لە هەموو لاوە خەفەت هوجوومی

بۆ دێنێ جا چۆن ژن بەخێو ئەکەی    لە کوێ بەرقلیان لە کوێ شێو ئەکەی

چۆن رازی ئەکەی بەقاڵ و بەزاز    لازماتی ماڵ چلۆن ئەکەی ساز

ئەگەر ژەمێ قەن یا چایی نەوێ    بەینی ژن و شوو وەک خوم ئەشەوێ

ئەوێ وە قڕە، وە هاورد و برد:    قوڕمساخ! نەتبوو ئەمتە بۆچی کرد

خانم ئەتۆرێ و ئەڕوا ماڵەوماڵ    ئاغاش لەم لاوە دەسخاڵی و بەتاڵ

نە ماڵی ماوە بەهانەی ببڕێ    نە باڵی ماوە لە دوای بفڕێ

بەم جۆرە وترا شوومی شیربایی    ئەیانخاتە ناو دەریای گەدایی

ئەگەر بەم جۆرە تالان یەک نەکەین    ئەم بەدبەختیە کەمتر دێتە بەین

شیربایی بە قەول کەس ناوێ حەلاڵ    ئەوێ وە ئاگر ئەکەوێتە ماڵ

وایان فەرمووە خاوەن کەمالان    بێتەفاوەتە شیربایی و تالان

بۆ حەلاڵ بوونی مەکەن فێڵ و فەن    لیباسێ تری وەبەردا مەکەن

مەڵێن شیربایی نیە ئەم ماڵە    مارەییەکی شەرعی و حەلاڵە

راسە کە مارەی لە سەر براوە    ماڵی زەعیفەی لە روو داماوە

ئەمما کەس و کار وەهای قووت ئەدەن    زەعیفەی مەزڵووم نائومێد ئەکەن

لێی ئەشارنەوە، ئەینێنە کیسە    خەبەریان نیە کە زوڵمێ پیسە

ماڵی مەزڵوومێ وا بۆچی پاماڵ    ئەکەن بە ناحەق، پێ ئێژن حەلاڵ

بۆچی وا خۆتان بێخەبەر ئەکەن    زەهر هەر زەهرە با پێ بێژن قەن

ئەو مارەییەی بە ناو جیهازی
گشت بۆ خەرج ئەکەن با نەشبێ رازی

بە بەعزێ سابوون گۆرەوی و دۆخین
یەک دوو دەسماڵی زەرد و سوور و شین

فریبی ئەدەن باقی بە حەلاڵ
ئەزانن ئەیکەن وە بنچینەی ماڵ

ئەمانەم دیوە من بە چاوی خۆم
بۆیە بەم جۆرە لە سەری ئەڕۆم

مارەیی میزان شەرع بدەن قەرار
فەرقی دەولەمەن هەس لە گەڵ هەژار

ئەونە بێوەختێ ژن داوای کرد شووی
بە کەماڵی مەیل وە بێگرژی رووی

بێناڕەحەتی و بێدەردی سەری
پێ بدا و زیممەی خۆی بکا بەری

چیە مارەیی بەو میزانە وێ
تا خۆشەویسی سەد چەندانە وێ

ئەگەر لە رێگای شەریعەت لادەین
ژن و شوو شەڕیان ئەکەوێتە بەین

ژن داوای حەقی خۆی بکا لە شوو
کە نەیبێ بیدا لیان ئەبێ بە قوو

ئێژێ بە شووی خۆی ژنی ناماقووڵ:
یەخەت بەرنادەم یا تەلاق یا پووڵ

ژن جۆیای فرسەت حەق خۆی بسێنێ
شوو لە فکرایە ژن بخلەتێنێ

بەم ئەحواڵەوە لە دەشت و لە ماڵ
لەگەڵ یەکترا تووڕە و ترش وتاڵ

مەنزڵ پڕ ئەوێ لە خوتە و بۆڵە
رۆژێ چێشت بێخوێ رۆژێ تر سۆڵە

کەوچک ئەدرێ وە سەر کاسەدا
کەرە، موعەتتەل لە نێو ماسەدا

تەجاوز مەکەن لە تەریقی راس
بێ عەداڵەتی سەمەری ئاواس

لە خوا بترسن مەگرن رێگەی لار
با مارەییتان لێ نەوێ وە مار

بۆچی لە یەکتر ئەنێنۆ تەڵە
بۆ ئینسانانە ناکەن مامەڵە؟

دەسێ یا دوو دەس بسەنرێ لیباس
زۆر موبارەکە قبووڵە رەواس

وەلێ گۆشوارە، ئەشرەفی و لیرە
گەردن بەندی زێڕ، کرمەک، لاگیرە

ژن خواز ئەمانە بۆچی بسێنێ
هەر پێتان خۆشە هیچی نەمێنێ؟

بۆ نابووت ببێ ئەو لێقەوماوە
ئێوە بن و خوا بۆ ئەم ئەسپاوە

جوابم بەنۆ ئەپرسم لێتان
بۆتە پاڵەپێژ عەیب نییە پێتان

ئەم گشت بەهانە و بدە و داوایە
مایەی بەدبەختی بووک و زاوایە

تووی ئەم فەسادە تاکەی ئەچێنن
خەلات بە ژنخواز بۆچی ئەسێنن

دەک خەلاتی وا وە میرات کەوێ
یا خوا موبارەک خەلات پۆش نەوێ

براکان بەزمی خەنە پووڵیتان
دەلیلە لە سەر ناماقووڵیتان

دەعوەتی ژنان بۆ لای بووک ئەکەن
هەر بەو دەعوەتە خۆتان سووک ئەکەن

چون هەر ژن پووڵێ بۆ حیفزی شەڕەف
ئەبێ بخاتە سەر سفرەی تەرەف

ئەمن ئەپرسم لەو خاوەن ماڵە
ئایا ئەو پووڵەی لە لا حەڵاڵە؟

ئەڵبەت مەعلوومە «غصب الحیایە»
وەک پووڵێ بیدەن بە لۆتی وایە

ببن بە لۆتی لە بەر خاتر پووڵ
بە تەمان ناوتان ببرێ بە ماقووڵ؟

خراوتر لەمە دەسەی هەرزەکار
ئەڕژێتە دالان سەربان و حەسار

تاریکایی شەو ئەوێ وە پەردە
بۆیان وا گشتیان ئەون وە جەردە

لە سووچ و پەنا لە بن دیواردا
یا لە پشت درگا لە ڕێگوزاردا

خۆیان مات ئەکەن بێجووڵەونەفەس
تا نەچیرێکیان بکەوێتە دەس

وا لەو بەزمەدا بەدناوی هەزار
تەرکی کەن وەک مەرد با کۆتا بێ عار

شیرینی خواردن رەسمێکە باوە
خاوەن شەریعەت ئیجازەی داوە

دوای نیکاح کردن مەجلیسێ لە پیاو
پڕفام و شعوور زانا و خاوەن ناو

بڕازێتەوە بە شەوق و ئەدەب
پڕ زەوق و سەفا، پڕ شادی و تەرەب

گۆرانی وێژی دەنگخۆشیش ئەشعار
بخوێنێتەوە ئەوێ وە گوڵزار

ئەو بەزمە جوانە بۆ حازرانی
بە ناڵەی دەف و سۆزەی گۆرانی

وەلێ بەو شەرتە دوور لە بیدعەت وێ
نە تێکەڵ بە باس زوڵف و روومەت وێ

ئەمە کە ئەهلی ئاوایی تەواو
ئەبێ تێر بخۆن لە گۆشت و پلاو

شایی لە ژنخواز بکەن وە شیوەن
ئەوەی هەیەتی بیخۆن و بیوەن

کاری وا شێوەی بێکەمالانە
شیرینی خواردن نییە، تالانە

وەرن با بێژین هەموو مەردانە
تف لەم قانوونە ئێمە هەمانە

بەم رەسم و یاسا کە باشە پێمان
هەموو میللەتێ تف ئەکا لێمان

ئێژن بێنە سەیر، کوردی ناماقووڵ
ژن کە ئازادە ئەیفرۆشن بە پووڵ

لە کام عەشرەتا بێئینسافی وا
رەواجی هەیە ئیللا لە کوردا

براکان بە عام بێن بکەن یاری
شیربایی لە ناو لابەن یەکجاری

تانوپۆی هەوا و هەوەس مەتەنن
ریشەی ئەم زوڵمە لە بێخ هەڵکەنن

لە کاری خێرا بڕ و بەهانە
خیلافی قانوون دیانەتمانە

هەر گا دوو نەفەر بە یەک رازی بوون
بیاندەن بە یەک وە بێ چەند و چوون

با کەم کوڕ و کچ بکەن چاوبڕکێ    سەرمان بشکێنن وە بەردە فڕکێ
ڕەزای کچیشتان ئەبێ مەنزوور وێ    با خوێشایەتی لە عەیبە دوور وێ
لەم حەقیقەتە گشت کەس حاڵییە    کاری ناڕەزا بەری تاڵییە
بێڕەزا ئافرەت بۆ ئەدەن وە شوو    خۆ ئەخەنە ناو قڕە و قاو و قوو
لە بیرمە ساڵێ شەخسێ بێڕەزا    لەم چەن ساڵەدا کچی بە شوو دا
نیکاحی کریا و شیرینی خوریا    پێشکەشی ئاغا و شیربایی دریا
سبەینێ ئەگەر ڕاپەڕین لە خەو    وتیان فلانی هەڵگیرا ئەمشەو
بێڕەزای ئافرەت مەکەن کاری وا    با نەکەونە ناو عەیب و عاری وا
بۆ ئەکەونە شۆن نەفس و هەواتان    ئەیکەن وە دەردی گران دەواتان؟
ئێوە گەورەتر لە پێغەمبەر نین    بۆ تێنافکرن مەگەر بەشەر نین؟
بۆ ژن بە شوودان پەیڕەوی لەو کەن    کەم ڕۆژی قانوون دینتان بە شەو کەن
کەسێ لە مەیدان گۆ ئەباتە دەر    کە لە ئەمری ئەو پا نەنێنە دەر
ئەگەر ڕاس ئەکەن ئۆمەتی ئەون    ئەبێ لە کاردا شۆنی ئەو کەون
لامەدەن لە خەت ڕاسی ئەمری ئەو    بۆکاری خیلاف مەبن وە پێشڕەو
بپرسن چلۆن کچی دا بە شوو    لەم ئەمرەدا چۆن مامەڵەی فەرموو
ئێمەش ئەو ڕێگا بگرینە بەرچاو    هەموومان پێدا بڕۆین وێنەی پیاو
گوێ بگرن لە عەرز ئەم گەستەمارە    ئەم خەستەی پەشێو دەروون زەخمارە
بۆ ئەم ڕووداوە ئەسەف ئەنگێزە    بۆ ئەم کارەسات بێڕەحمی خێزە
کوڕێک و کچێ مەیلیان بە یەک بوو    خاوەن کچ حازر بۆ خێشی نەبوو
شەوێ هەردوویان ڕێیان گرتە بەر    کە بێدەردی سەر ببن بە هاوسەر
کەس و کاری کچ زانیان خەبەر    کەوتنە شۆنیان وێنەی بای سەحەر
کوڕ دەرچوو وەلێ کچ کەوتە تەڵە    ئاوایە سەمەر شوومی مامەڵە
ئەو بێچارەیە بە ناحەق تیاچوو    لە خۆشی ژیان دنیا بێبەش بوو
بڕا ژیرەکان باشە کاری وا    زوڵمی ئاشکرا لە هەژاری وا؟
عالەم هەراسە لە دڵبەردی وا    کە سەر بکێشێ بۆ نامەردی وا؟
عەلاوەی ئەمەش هەموو ئەزانن    ئەوانە مانیع کچ بە شوودانن
ئابڕووی خۆیان وا بە باد ئەدەن    بێ ئیجازەیان کچیان شوو ئەکەن

ئەڕۆن وێڵ ئەون لە گەڵ یاریانا      قوڕ ئەدەن وە چاو کەس و کاریانا
کە وایە زووتر بیاندەن بەشوو      بۆ خاتر بەقای عورزە و ئابڕوو
ئەم بەرگیریە پڕیەتی لە عار      دیومانە بە چاو تا ئیسە سەد جار
مەگەر نابیسن، گوێتان خنراوە      ساڵێ هەزار زۆڵ دێتە دونیاوە
ئەوی بێشەرمی و کاری لاریانە      مانێعیان شەریک عەیب و عاریانە
سۆفی! بە درۆ چاو مەقونجێنە      دەروێش! بێ‌حاڵ پرچ هەڵمەسووڕێنە
مام حاجی! تەنها مێزەرێکی زەرد      نەجاتت نادا لە گێژاوی دەرد
بە پشتێنی سەوز سەیید! مەنازە      وە بێ کاری چاک کەس لەو رێبازە
ناپەڕێتەوە ناچێتە ئەو بەر      نەجاتی ناوێ وە بێ دەردی سەر
خەلیفە! ماقووڵ بە مێزەر و ریش      ناوی، تا نەکەی خالیس بۆ خوا ئیش
جەنابی مەلا! ئەتۆیش ئەم عەبا      بێ‌وەرع و تەقوا ئابڕووت ئەبا
ئەم پەشێویە کە وا لە ناودا      گیرین لە بەینی ئاور و ئاودا
دڵمان ناسووتێ بۆ هیچ زەلیلێ      یەکتر ئەکوژین بێ‌هیچ دەلیلێ
لە یەک ئالاوین وەک ژەنگە سوورە      تا خەیاڵ بڕوا، ئاشتی دوورە
رووخاوی دیوار قەڵای وەفاقە      بڵێسەی ئاور کوورەی نیفاقە
زاهیر فریبی با فڕ دەین بە عام      بکەوینە شوێن ئادابی ئیسلام
لیباسی تەقوا بکەینە بەرمان      بۆدەفعی گەرما وسەرمای سەفەرمان
قانوونی دنیا هەر کە قورئانە      بیگرین بە دەستۆ بۆ ئەم زەمانە
پڕ فیتنە و فەساد، پڕ لە بوهتانە      پڕ لە جەردە و دز پڕ لە شەیتانە
بەو دەستووراتە بەڕێدا بڕۆین      فریبی دەلال «الخناس» نەخۆین
هەیە زیاتر لەمە خراوی؟      کەوتووینەتە ناو سەر لێشەواوی
قانوونی دینمان لە دەس بەرداوە      تا تەوقی سەرمان غەرقی قوڕاوە
چون بەدکاریمان بێ نیهایەتە      با دەس هەڵگرم لەم حیکایەتە
بترسین چاکە لە خوای بێ‌باک      نەک وێنەی قارون قووتمان بدا خاک
یا بە سەرمانا بڕێژێ بە تاو      عەزاوێکی وا قڕمان کا تەواو
«زاری» بێژە ئەم قەومە نەبیسە      با دەس هەڵگرن لەم شێوە پیسە

### سێهەم باسی رەشبەڵەکی پڕ لە عاری نێر و مێ تێکڕژان

یەکێ تر ئاسار لە حەق دووریمان — یانی نیشانەی بێشعووریمان
چاو قووچاندنە لە بەعزە کارێ — لە لامان هیچە وەلێ بە جارێ
ریشەی ئابڕوو لە بێخ دەردێنێ — تووی بێحەیایی و فەساد ئەڕوێنێ
رۆژی ئاخرمان کەم لە خەیاڵە — ئەغڵەب حەرامامان لە لا حەڵاڵە
خوسووس رەشبەڵەک لادێ و شارمان — سیل و سەرەتان عەیب و عارمان
ئەگەر رازاوە حەیا بار ئەکا — تەرک دانیشتن لادێ و شار ئەکا
جوان عومرەکان نێر و مێ یەکسەر — لە پەردەی عیففەت تەواو دێنە دەر
ئەکەونە ناو دێ دەسەی رەش و ڕووت — ئەچن ماڵەوماڵ تاقتاق وجووتجووت
کراسێ لەم ماڵ، لەو ماڵ دەسماڵێ — کۆ ئەکەنەوە شەڕەو شاتاڵێ
ئەیکەنە بەریان بۆ خۆنمایی — خۆ ئەکەن وە بووک ئەچن بۆ شایی
بۆ فریب دانی دەستەی کوڕ و کاڵ — ئاڕایش ئەدەن گۆنا و زوڵف و خاڵ
چاکیان تێفکری بێڵێ شیاکاوین — وەلێ بە زاهیر جوان و بەرچاوین
دیوتانە بووکە بارانەی ژنان — وە بێ تەفاوەت ئەمانیش هەروان
بەو ئاڕایشە ئەون وە چاوبەس — تا کەس نەزانێ لەوان جوانتر هەس
ئەدەب و شەرم و حەیا وێڵ ئەکەن — بۆ رەواجی خۆ هەزار فێڵ ئەکەن
جا گوێم لێ بگرە چی ئەکەن لە خۆ — بۆ فریب دانی سەد وەک من و تۆ
ئەبرۆ وسمەسا، پڕ لە سورمە چاو — لارە پێچ ئەکەن کەللەی تاس کڵاو
گێسوو ئاوێزان سەر گۆنای رەنگین — پشتێن شل لە سەر چینی کەمەر چین
مزێرتر بۆ دین لە گورگە بۆ مەڕ — لەرەی لیمۆی کاڵ لە سەر سینی زەڕ
ورشەی پووڵەکە وەک ئەسێرەی شەو — چاوی هۆشیاران پڕ ئەکا لە خەو
ئەو ریزی لەرزانە بەم لاولادا — بە دەوری روا وان لە سەمادا
خرنگەی گۆ و لە سەر سینە و مەم — خەفەت هەڵئەبڕێ بە با ئەدا غەم
عەرەق چون گوڵاو لە روویان ئەڕژێ — لە خاکی مەیدان هەڵپەڕکێ ئەپژێ
ئەنواعی زیوەر ئەدەن لە خۆیان — سەرسامە عالەم لە رەنگ و بۆیان
وەها ئارایش بە ئەندام ئەدەن — سامری لە سێحر خۆ سەرسام ئەکەن
کاتێ بەم شێوە دێنە لەنجە و لار — لە ریشەی لاوان دەردێنن دەمار

دێتە گوێی لاوان کە خرنگەی گوارە بێ زوڕنا و دەهۆڵ ئەکەونە چوارە
بەم غەمزە و ناز وعیشوە و خەرامە بۆ هەرزەکاران ئەبنە دێوجامە
ریزی هەڵپەڕکێ کە ئەڕازێتۆ شێوەی ئینسانی لە بیر ئەچێتۆ
عەمتەر شەرمەسار رەقس و سەمایان شەیاتین خەجڵ کاری بێجایان
هەر کاریێ ئاین پێی ناڕازییە ئەوەیان لە لا سەرئەفرازییە
بە شیرەی زوڕنا دێنە خول وەک ئاش ئەڕژێنن وەسەر چاوشدا شاباش
تازە پێگەیوان سمێڵ قەیتانی دڵ خاڵی لە هۆش پڕ لە شەیتانی
شەرابی هەوا وایان ئەکا مەس هەم دین هەم دنیا بەر ئەدەن لە دەس
گوێ ئەماڵنەوە وێنەی کەر بۆ جۆ هیچ گوێ نادەنە مەکەی ئەمن و تۆ
دەعوەتی یەکتر لەم دێ بۆئەو دێ ئەکەن هەر وەختێ کە زەماوەن بێ
ئێژن بێن بۆسەیر ئەم زەماوەنە خۆتانی تێخەن باغ بێخاوەنە
بێ شەرم و حەیا خۆ مەخەنە ناو هەزار بەدناوی و کاری ناحەساو
بۆ ئاڕایشی بەزمی رەشبەڵەک تێکەڵ یەک ئەبن ئەوێ وە کەڵەک
وەختێ پەنجەیان هەڵپێکا لە یەک دوو شەیتانیان ئەکەوێتە تەک
وەهای فەرمووە شارەزای عیرفان حاجی کاک ئەحمە«علیە الرضوان»
شەیتانێ هەیە بە ناو «سەندەلقۆ» رۆژی رەشبەڵەک ئەکەوێتە خۆ
هەیەتی پەنجەی زۆر و بێ حەساو بە ئەندازەی ئەهل رەشبەڵەک تەواو
هەر یەک، یەک پەنجە ئەخاتە ژێریان ئەوێ وە کۆمەک بۆ مێو و نێریان
کە هیلاک نەون هەڵیخەن بە دڵ دیزەی هەوەسیان تەواو بێتە کوڵ
چرای عەقڵیان نەمێنێ نووری لە بێحەیایی تا نەکەن دووری
خشومش کچگەل چەپی و هەڵخەرۆ پایێ بۆ دوا، ئەو پا بۆ بەرۆ
وەک کەوی مێرۆژ کوڕگەل بێئارام مێشکیان خاڵی لە شعوور و فام
پیران غەرقی سەیر جوانان سەرمەس کەللە پڕهەوا، دەروون پڕ هەوەس
وەکوو دیوتانە ئەکەونە سەما ئەترنجێنە یەک لە پێچ و خەما
ئەم وەسەر ئەوا، ئەو وە سەر ئەما ملی یەکتری ئەوەن وە دەما
چنگە فلیقە و گوشینی پەنجە ئەڵبەت زیاتر رسوایی سەنجە
چۆپی کێش وەختێ خول ئەدا دەسماڵ ئەهلی هەڵپەڕکێ وا ئەکەونە باڵ

ڕەوڕەوەی هەوا وا ئەکەن قەوی
کەمتر پاژنەیان ئەدەن لە زەوی

ئەکەونە سەما لە سەر پەنجەی پا
ناپرسن لە خێش، ناترسن لە شا

بادەی بێشەرمی وایان ئەکا مەس
هیچی نازانێ باس وخواسێ هەس

سۆفی لەم لاوە لە سەر بەرماڵە
سۆفی ژن لەو لا بە دوو دەسماڵە

خەریکی رەقسە شەوقی جۆشاوە
لافاوی هەوا عەقڵی پۆشاوە

لاوەکان کە دێن خۆیان ئەنوێنن
بەم تەرزە فەردە سەدا هەڵدێنن

چۆپی کێش ئارام! گاوانی سەور
بیکوتن لە جێوە با نەشێوێ دەور

خۆ ئەکەن وە بووک بەعزێ پیرێژن
بۆ سەیر تا قەراخ زەماوەن ئەچن

حەواسیان وەها پەرت ئەوێ یەکسەر
نامێنێ لایان لە خۆیان خەبەر

وە بێئیختیار ئەکەونە جووڵە
خۆ ئەخەنە ناو ئەو بەحرە قووڵە

شل شل خۆ ئەخەن بەم دیو بەو دیوا
وان لە ئیختیار هەتیو مەتیوا

تەماشا کەن ئەم شێوە ناپاکە
چیها تووی فەساد سەوز ئەکا، کاکە

بۆ ئەونە بێ گوێن بێ دڵ و چاون
لە رەفتاری وا تەریقۆ ناون؟

ئاخر بەس نییە بۆبێغیرەتی
بۆبێعورزەیی و بێبەسیرەتی

نامووسی خۆتان بدەنە دەس غەیر
پێتان عەیب نەوێوخۆشتان بێنە سەیر

ئایا ڕەوایە ئەی خاوەن ویژدان
بۆ ناو ڕەشبەڵەک ژن ئیجازە دان؟

بڕازێنیتۆ وەک بووک سەرتا پا
بێگانە بە کەیف پی بکا سەما

هەڵیتەکێنێ و خۆی تێهەڵساوێ
پەنجەی بگوشێ تا هێزی تیاوێ

پێتان عار نییە ئەم تێکەڵ بوونە
ئەم بێحەیایی لە حەد دەرچوونە؟

ژنانێ بۆناو ڕەشبەڵەک ئەچن
تێکەڵ پیاوانی نامەحرەم ئەبن

باڵیان لە باڵ یەک ئەئالێ وەک مار
بێبەش لە حەیا لە سەر تا پا عار

لەگەڵ قەحبەدا ئەونەیان ماوە
خۆیان رووتۆ کەن ئیتر تەواوە

هەموو ئەزانن رۆژی ڕەشبەڵەک
زۆر لە ئافرەتان ئەبنە ژێر کەڵەک

خاوەنیان حازر زلزل ئەڕوانێ
ئەو قەباحەتە بە فەخر ئەزانێ

کاری شوومی وا قەبیح و بەدفەڕ
عالەم ئەکێشێ بۆ ناو دەریای شەڕ

براکان ئەگەر خاوەن شعوورن
دارای نامووسن، مەردن ، غەیوورن

هەڵدەن لە دەمەک، زوڕنا بشکێنن ... ریشەی رەشبەڵەک لە بێخ دەربێنن

بۆ خۆشی رۆژێ، ئینسانی کوڵۆڵ ... سەد باری گوناه بۆ ئەنێتە کۆڵ؟

با گۆرانی وێژ نەزمی خۆش بێژێ ... مەرهەمێ وە سەر زۆخدا بڕێژێ

ئێمەش گوێ بگرین بێ‌هەوا و سەدا ... بەو نەزمە خۆشە غەم بدەین وە با

تێکەڵ یەک نەبن ئەگەر ژن وپیاو ... یەقینتان وا بێ پێ نابن بەدناو

ئەم رەشبەڵەکە لە هەر لا کرا ... لی پەیدا بووە سەد قڕە و هەرا

بێزارە ئیسلام لە بیدعەتی وا ... پڕ لە بێ‌شەرمی و کاری ناڕەوا

وەلێ سەد ئەسەف شعوور نەماوە ... حەق شاراوەتۆ هەر ناحەق باوە

بێ ئابڕوویی ئەم رەسمە پیسە ... لە فەرموودەی خوا و رەسووڵ ببیسە

بە کوردی ئەوا کردم بەیانی ... نەڵێن نەمان بیست یا نەمانزانی

کە جلەوگیری بە زبان نەتوانم ... ئەبێ بێ‌جووڵە نەوێ زوانم

ئەی هاوار بۆ دین غەریب کەوتووماین ... بۆئایینی جوان لە دەس دەرچووماین

بەم چاکەوە چۆن روو لە مەحشەر کەین؟ ... داوای شەفاعەت لە پێغەمبەر کەین؟

ئەگەر بەم جۆرە عەبدی هەوا بین ... چلۆن چاوەڕێی عەفوی خودا بین

برا کاری خێر بۆ ئەکەن وە شەڕ ... بۆ دایەن وە ئاو گوناە ئەکەن تەڕ؟

مەگەر لە رۆژی جەزا ناترسن ... لە چاک و خراو حەرفێ ناپرسن

موسڵمان ئەوێ عەبدی خوا وێ ... نە فەرمانبەردار نەفس و هەوا وێ

بۆخۆ بە کاری قەبێح چەپەڵ کەین ... با چاو لە رەفتار دەسەی ئەوەڵ کەین

ئەگەر هەر پێتان خۆشە ئەم رەقسە ... کە بۆ ئادابی ئیسلامی نەقسە

لە شۆن بەهانە و حیلە مەگەڕن ... بە تێکەڵی نە، بە جیا هەڵپەڕن

خانمان لە ماڵ، ئاغایان لە دەر ... هەڵپەڕن، بێ‌کار عەیب و شەرم ئاوەر

با تێکەڵ بە یەک نەبن پیاو و ژن ... دیزەی ئابڕوو نەبێ سەروبن

بۆ چی وا دەستان لەم دینە داشت ... ئاشکرا یەکتر ئەدەنە بەر کوت؟

بۆ لە ناو نابەن شێوەی حەیوانی ... بۆ کەوتوونە شۆن دێوی نەزانی؟

سەلاحی خۆتان لە نەزەر بگرن ... لە هەرچی ئەکەن جوان تێبفکرن

هەر کارێ بەری روو زەردی دێنێ ... ئینسان ئەبێ خۆی تێنەگەیێنێ

گشتمان سەفەرین بۆ مەحشەر ئەچین ... لەگەڵ شەیتانا رووبەڕوو ئەبین

ئێمــه پــی ئێــژین بــۆ لاتــداین لــه رێ / لــه جوابــا ئەڵــێ: درۆزن رووڕەش بــێ
ئــەمن کــەی ئێــومم مــەجبوور بــه لادان / کرد لــه رێگــەی حــەق ئێــوه هــەر خۆتــان
بــه مــەیلی خۆتــان لاتــان دا لــه رێ / گلــەتان ئــەبێ هــەر لــە خۆتــان بــێ
بۆڵــەی بــێ جیهــەت مەکــەن وه ســەرما / لــه خۆتانایــه ئــەم گــەرما و ســەرما
«زاری» بێــژه ئــەو قەومــه بــێفــەڕه / بــا دەس هەڵــگرن لــەم شــێوه شــەڕه

## چواەرم باسی تاڵان کردنی مردوو لێ مردوو بە ناوی سەرەخۆشی لە خزم و خێشان

قانونــێ ترمــان خانــه خــراو کــەر / پێچەوانــەی ئــەمر خــودا و پێغەمبــەر
دوور لــه رەوییــه و ئــادابی ئیســلام / قــەبیح و ناحــەز سەراســەر حــەرام
ریشــه دەرهــاوەر نــەمامی ئــایین / مــەحبووبی بــەرچاو شــەیتانی لــەعین
چیــه چوونــه دەر، لــه راســه شــەقام / بــێگــرێ و قــۆرتی ئــایینی ئیســلام
لادان لــەو رێگــه خۆشــه پــڕ ســەفا / مایــەی نەگبەتــه و شــەقایه و جــەفا
مەعلوومــه ئێمــه شــاه و گــەدامان / لــه خوداوەیــه مــەنع و عــەتامان
بــه مــەیلی خۆیــه دان و نــەدانی / بــەرگری ئــەمری هــیچ کــەس نــەیتوانی
هــەر وەک بــه دانی دڵــخۆش و شــادین / بــه نەدانیشــی ئــەبێ هــەر وا بــین
نابــێ شــەڕ لــه گــەڵ قــەزا و قــەدەردا / بکــەین و لــوول دەیــن خــۆ وه ســەقەردا
شــیوەن بــۆ مــردوو یەخــه دادڕیــن / ســەر لــه قــوڕگرتن یــا پەلکــه بــڕین
درووسکــردنی کۆتــەڵ و ئــالا / پۆشــینی کــالای ســیا وه بــالا
لاواندنــەوەی مــردوو بــه هــۆره / ژنــان و پیــاوان نــۆره بــه نــۆره
وه زایەڵــەی بــەرز هــاوار و هــەی رۆ / بــه «نظــم» و «نثــر»ی تــان و پــۆ درۆ
ئەمانــه هــەموو دەلیلــه لــه ســەر / نارەزاییمــان بــه قــەزا و قــەدەر
لــه خــۆش و نــاخۆش ئــەوی روو داوه / بــۆ ئیمتیــازی چــاک لــه خــراوه
بــەلایێ ئەگــەر هــات و واریــد بــوو / خۆمــان لــه خۆمــان بــا نەیکــەن وه دوو
جڵــەوی تاقــەت لــه دەس بەرنــەدەین / لــه جــەزای ســەبر خــۆ بــێبــەش نەکــەین
هــەرچی لــه ئــەزەل موقــەددەر بــووه / تــەغییری لــه دەس تــەدبیر دەرچــووه
وەخــتی خــۆی زاهــیر ئــەوێ بــێگومــان / خــوا لی ســەرخۆش بــین یــاخۆ هەراســان
لادان لــه قــەزای ئیلاهــی مــومکین / نیــه بــۆ فــەردێ لــه ئیــنس ولــه جــین

بە قەزا غەیری رەزا چارەیی
نییە، سەد شیوەن ناژی پارەیی

وەلی قیسمەتی ئەونە نەزانن
بۆ مردوو شیوەن بە فەرز ئەزانن

لەگەڵ گیان دەرچوو مردوو ویڵ ئەکەن
سەرچاوەی قانوون مەزهەبلێڵ ئەکەن

ئەوێ وە شیوەن ڕۆڕۆ و قوڕپێوان
وە هەردوو چەپۆک بە سەرخۆدا دان

ریشەی حەیاتت ئازیز بۆ چڕیم
بە مەرگی ناکاو جەرگت بۆ بڕیم

بەعزێ بێئەوە ئاو بێ لە چاوی
سەروشانی خۆی ئەکا قوڕاوی

بۆ ئەوە عەشرەت لی نەدەن تانە
سەدا هەڵدێنێ بەم درۆیانە:

براگیان خۆ تۆ وەختی مەرگت نەو!
دوور لە تۆ ئەمە مردنە یان خەو

ئازیز کۆچ لە ناو کەسوکار مەکە
یاران سینەڕێش دڵ زەخمار مەکە.

بانگ و زایەڵە شیددەت ئەسێنێ
مردووی بێچارە بێکەس ئەمێنێ

خێشان دوورەواز وەک لی بتۆرن
بێگانە بەخێر خۆیان ئەیشۆرن

نە ئەزانن چۆن مردوویان شۆرا
یا چلۆن لاشەی ناو کفن خرا

لە باتی ئەوە مردوو بەڕێ کەن
نوێژ و کفن و تەڵقینی ڕێ خەن

ڕەددی مەزڵەمە یا ئەدای قەرزی
یا چارەجۆیی بۆ قەزای فەرزی

یا وەسییەتی ئەو بەجێبهێنن
خەتم و تەهلیلەی لە سەر بخوێنن

ئەون وە ئاشپەز وە ساقی و فەڕاش
ئێژن ئەمەیە ڕەسم و ڕێگەی باش

لە بەر تەهییەی چێشت و چای و نان
لەگەڵ مردوودا ناچن بۆ قەبران

ئیتر ناپرسن ئایا ئەم نانە
ئەگەر مەشهوورە وە بەر مەیتانە

داخۆ حەڵاڵە یا خەیر حەرامە
خیلافی قانوون دینی ئیسلامە

ئەمانە ئەمرن ئەڕۆنە ژێر خاک
پیاو بن یا ژن، خراو بن یا چاک

دارا یا نەدار شا بن یا حەماڵ
گیانیان دەرئەچێ و جێئەمێنێ ماڵ

بەشی زیادیان دارای سەغیرن
بێماڵ و دەوڵەت، گەدا و فەقیرن

بێبەش لە نەقد و جنس و دارایین
بێنان و پێخۆر، بێقەند و چایین

بێپیاز و لەپە، بێزەردەچێوە
وەک پۆلی کوللە، لە هەموو ڕێوە

ڕوویان تێئەکەن تیپ تیپ ژن و پیاو
نەک بۆ سەرخۆشی بەڵکوو بۆ گۆشتاو

گەر یەکێ بێژێ عەشرەت ئەم کارە
خیلافی ڕەزای پەروەردگارە

بە شەرعی ئیسلام رەسمی خراوە ... ئەیدەنە بەر قاو لە هەزار لاوە
ئێژن بێ‌دەنگ وە، مەدە ئەم فتوا ... لە ناو عەشرەتا عورزەمان ئەڕوا
چون ئەمە یاسای باو باپیرمانە ... مەحبووبی نەزەر جوان و پیرمانە
دەسبەردار نابین بە قەولی ئێوە ... مەجبوورین ئەبێ بیبەین بەڕێوە
چون لە قانوونی ئیسلام ناڕوانین ... ئەو بەرمەیتانە بەر فەرز ئەزانین
جا ئێوەو خودا ئەمە عار نییە ... ئەمە رەسمێکی کەچ و لار نییە؟
مردوو لێ‌مردوو دارای سەغیر وێ ... قەرزار و نەدار، مات و زویر وێ
مردووەکەیان بە خاک نەسپێرن ... پەلە پەل سفرە و سەماوەر بێرن
هەروا ئەم قەومە لە خوا نەترسە ... تالانیان بکەن بە ناوی پرسە
زمهەڕەکەیان بە جارێ بخۆن ... نە ئارد بمێنێ، نە قاورمە و رۆن
هیچ بەشیان نەکا وەک سپای یەئجووج ... دوایی بێ‌هێلکە، نەمێنێ فڕووج
رەواجی رەسمی وا خەسارەتبار ... وا لە خورڕخوڕە و تیلەکۆ و هەوشار
موسڵمانەکان باشە ئەم کارە ... ئەم رەسم و یاسای پڕ لە خەسارە؟
کێ فتوای بۆتان دا بە حەڵاڵی ... هەرکەس مردووی مرد چەپاو کەنماڵی
لە دایرەی دین بۆ بچینە دەر ... لە یاسای ئایین بۆ نەکەین نەزەر؟
بۆچی بە هەوا خۆ تالان بکەین ... چاو لە کاری لار هاومالان بکەین
هەتا سێ رۆژە ئەم رەسمە بەرپا ... ئەبێ هەڵگیرێ لە سێ رۆژ بەولا
سێ کەلیمەیە ئەسڵ سەرخۆشی ... چاکی بگرە گوێ گەر ئەهلی هۆشی
کاتێ تەشریفت برد بۆ ئەم کارە ... بێژە بەو شەخسە موسیبەت بارە
خوا ئەجرێ گەورە و سەبرێ چاکت پێ ... بدا و بە رەحمەت مردووت ببەخشێ
بۆ دەفعی غەمی دانیشە تاوێ ... بڕێژە وەسەر ئاوریا، ئاوێ
دڵخۆشی بەرۆ هەتا ئەتوانی ... ببە بە مایەی شەفا، بۆ ژانی
بە زبانی خۆش بێ وە تەقریردا ... مەیێڵە تاڵی بەڵای لە بیردا
لە بێ‌تاقەتی و شین بیترسێنە ... ئاوری کوژاوەی هەڵمەگیرسێنە
نەوی وە کۆمەک بۆ شین و چەمەر ... دووبارە مردووی بێریتۆ نەزەر
لە هەر جێگایێ مومکین بوو بۆتان ... دەفعی ئەم گلە بکەن لە خۆتان
باشە و بۆ ئەدای سوننەت کافیە ... لەمە زیاتر بێ ئینسافیە

کە ماڵی بکەن بە قاوەخانە / ریشەی دەربێنن بەو چێشت و نانە
ئاخر چ شەرعێ بەمە رازیە / پەسەندی نەزەر کامین قازیە؟
ئەم بەرمەیتانە کە ئیسە باوە / کەی شەریعەتمان دەستووری داوە؟
تۆشە و کولێرە و شیرینی ژنان / سێ رۆژ دوای مردوو ئەبن بۆ قەبران
پیان وایە بەوە ئەیبەخشن لەوێ / مردوو لە عەزاو نەجاتی ئەوێ
یا شەوی جومعە دەعوەت ساز ئەکەن / بە ئاواییدا بانگەواز ئەکەن
بێن! شەو جومعانەی فلان مردووە / بخۆن! واریسی خێریان کردووە
یا دوایی چل رۆژ بە ناوی ئێحسان / بۆ مردوو بەزمێ ساز ئەکەن دیسان
بە شەرعی ئیسلام بیدعەتە و بەتاڵ / سەربەخۆ نابێ پێی بێژن حەڵاڵ
لازمە بکەین دووری لە هەرچی / قانوونی ئیسلام ناڕەزایە پێی
هەتاکوو ماون واجبی خۆتان / بۆ جێ نایەنن کە مردن بۆتان؟
کێ بەجێ‌دێنێ چاوەڕوانی کێن؟ / کێ غەمتان ئەخوا بۆ کێ چاوەڕێن؟
لێرەدا ئەگەر کەمێ بە تەحقیق / بڕوانین ئەکەین هەموومان تەسدیق
کە لامان داوە لە رێگەی راسان / کەوتووینەتە شۆن رێگە نەناسان
خاوەن مردوو بۆ کاری بکا وێڵ؟ / دانیشێ لە ماڵ تا دوایی دێ خێڵ؟
بۆ ساڵێ ماڵی میوانخانە وێ / خەریک ئەم بەزم و سفرە و خوانە وێ؟
مەعلوومە لە لای هەر خاوەن کەماڵ / بەم رەسمە خەیلێ بنەماڵ پاماڵ
کریا و گرفتار بوون وە قەرزاری / کەوتنە گێژاو دەریای نەداری
تۆخوا پێم بێژن ئا بەم کردەوە / چ مردوویەکتان زیندوو کردەوە؟
مردوو لێ‌مردووی بێچارەی هەژار / دەردی با یەک بێ مەیکەن وە هەزار
ئەڵبەت وەزیفەی موسوڵمانانە / لە ماڵی خۆوە بۆ ئەو کەسانە
کە خاوەن مردوون خۆراک بنێرن / دەرخواردیان بدەن گەر ئەهلی خێرن
بۆ دڵنەوایی تا سێ رۆژ کەم کەم / بچن با دەرچێ لە خاتریا غەم
بە دانیشتنتان ئەما مەدەن توول / زیاتریان مەکەن عاجز و مەلوول
«زاری» بێژە ئەم قەومە نەترسە / با تەخفیفێ بەن بە شێوەی پرسە

## ٦٦

### عەقیدەی زاری

لــــــه بیســــــمیللاهی گەرەكمــــــه یــــــاری | بــــۆ تــــــەواو بــــوونی عەقیــــدەی «زاری»
بــۆ لــێ قبــوولْ بــوون بــۆ گرتنــه یــاد | چـــۆن نـــاوم نـــاوه «تحفـــه الاكـــراد»
بــه كومــــەكی ئــــەو دڵ لــــه گــــەڵ زبــان | ئیقراریــــان هەیــــه بــــه دیــــن و ئیمــــان
لــه هــــەر كارێكــدا ئــەو كۆمــەك نــەوێ | بێشــــك ئــــەو كــــاره ناتــــەواو ئــــەوێ
هــــەر خۆیــــه بــــۆ خــــۆی خــــەریكی كــــاره | دەسْــت ئــەر نــەگرێ تــۆ چیــت بێچــاره؟
بیكــــه وه خــــاتر شۆڵــــەی ســــیراجت | خۆشەویســــــەكەی شــــــەوی مێعراجــــــت
میهمــــانی ئــــازیز ســــەرای ئــــەو ئــــەدنا | شــــای بــــوراق ســــوار شــــەوەكەی ئەســــرا
خــــــەتا وه رەحمــــــەت بكوژێنیتــــــەوه | خــــــەلاتێ كــــــه دات نەیســــــێنیتەوه

### الصلوة علي النبي صلي الله عليه و سلم

بــرێژه رەحمــەت پــەیپــەی لــه ســەردا | وەســــەر رەوزەی پــــاك «خــــیر البشــــر»دا
درگــــای خەزێنــــەی رەحمــــی بــــۆ واز كــــه | ئــارەزووی هــەردوو دنیــای بــۆ ســاز كــه
لــــــه ســــــەرچاوەكەی عــــــەتای وەهــــــابی | تێــــراو كــــه تــــەواو ئــــال و ئەســــحابی
ئێمــــەش ســــەگێكین كەوتینــــه دوایــــان | ســــا بمانبەخشــــی بــــه خــــاكی پایــــان

#### موخاتەبەی نەفس و نەزمی كتێب

هەركەســــــێ تــــــۆزێ دارای شــــــعووره | ئــــــەزانێ كــــــرێ لــــــه بێكــــــار دووره
موســــەللەمه لات ئــــەم فســــه یــــا خــــەیر | تــــۆ بــــەرات ئــــەدەی بــــه رەنجبــــەری غــــەیر؟
فكــــــرێ بكــــــەرۆ هــــــەتاكوو مــــــاوی | بزانــــــــه بــــــــۆچی درووس كــــــــراوی
بــــەم رێكــــی قامــــەت بــــەم عــــەقڵ و فامــــه | بــــەم حوســــن تــــەركیب شــــێوه و ئەندامــــه
بــــه دەســــتی قــــودرەت ســــوورەتیان كێشــــای | چــــاو و دەم و لــــووت دوو گوێیــــان پێــــدای
لــــەم ئیجــــادەدا ئەلــــبەت كــــارێ هــــەس | بۆیــــه مامۆســــا تــــۆی نــــەدا وەكــــەس
ئــــەتۆش ئــــازا بــــه و عەبــــدی كــــەس مەبــــه | غــــولامی شــــەیتان یــــا هــــەوەس مەبــــه

سـەریان پێـداوی بـۆ سـوجدە بـردن
نـەک بـۆ تەکـەببور یـا رووهەڵـکردن

چـاو بـۆ ئیعتیبـار، زبـان بـۆ ئـەزکار
گـوێ بـۆ بیسـتنی ئایـات و ئـەخبار

سوڵـتانی ئـەعزات خسـووس یـانی دڵ
کـە هـەرچی کـارە بـەو ئـەبێ حاسـڵ

ئەسـیری هـەوا و شـەیتانی مەکـە
ئینسـانی، غـەیری ئینسـانی مەکـە

مەنزڵـێکە حـەق سـازی کـرد بـۆ خـۆی
ڕێگـەی کـەس مـەدە دەرکـەوانی تـۆی

مەنزڵـگای زیکـرت تـەواو تاریکـە
گیـانی مـن نـەختێ سـپیکاری کـە

بـا پـاکی کـەینۆ لـە نافـەرمانی
بیـڕازێنینۆ بـە موسوڵـمانی

چـون موسڵـمانین دینمـان ئیسـلامە
ئەسـڵ و فـەرعی دیـن بـزانین کامـە

الدین احکامٌ وضعها الله تعالی لعباده لاصلاح معاشهم و معادهم

دیـن قانوونێکـە وازیـح وەک جـادە
خـودا داینـاوە بـۆ ئـەم عیبـادە

کـە پێیـدا بـڕۆین پـی بکـەین ڕەفتـار
تـا لـە دۆزەخـا نەسـووتین بـە نـار

ئـەوەڵ و ئـاخر تـەواو هـەرچی بـوو
یـەک یـەک پێغەمبـەر ئیبلاغـی فـەرموو

دەخیـل لـە ئـەمری ئـەوان دەرمـەچۆ
ڕێگـەی ڕاس بگـرە لابـەلا مـەڕۆ

ئەسڵ ئەووەڵ «الذات»

ئەسـڵ دیـن پەنجـە لـە مـن بگـرە گـوێ
چـاک ڕەوانی کـە لـە بـیرت نـەچێ

ئەوەڵـیان بـاوەڕێکی چـاک
دوور لە تۆزی ڕەیب لە گـەردی شـک پـاک

بـە بـوونی خـودا چـاوی بـراتی
ئـەوەڵ و ئـاخر نییـە بـۆ زاتی

ئەزەڵـی و قـەدیم هەیـە هەمیشـە
وەک بـێئەوەڵـە، بـێئاخریشـە

نـە بـاب، نـە ڕۆڵـە، نـاخوا، ناخـەوێ
پـیر نـاوێ، نـامرێ، بـووە و هـەر ئـەوێ

عـەجایبی وا داخـۆ دیویـە کـەس
مـەکانی نییـە و لـە گشـت لایـێ هـەس

لە ئـەرز و سـەما خـوا ڕۆژ بـێ یـا شـەو
بـە قـەی یـەک زەڕڕە خاڵـی نییـە لـەو

لـە ماسـیوای خـۆی وا بـێنیـازە
ئـەر بـێ و بـڕێژێ ڕەنگێگـی تـازە

عالـەم ئـەباتۆ بـۆ سـەحرای عـەدەم
دنیایـەکی تـر دێنێتـە بەرهـەم

دەلیـل لـە سـەر بـوون زاتی ئـەو زۆرە
فکـرێ بکـەرۆ ئـادەی بـەم جـۆرە

هیچمـان قـەدیم نـین لـە نەبوونـەوە
هاتینـە سـەیری سـارای بوونـەوە

نەمانتوانیوە بوون بەین بە خۆمان — نە نەقش خۆمان نە میسلی خۆمان
لە من بژنەوە ئەر راستت ئەوێ — سانێعمان ئەشێ وەک ئێمە نەوێ
ئەشێ بێ شەریک گەورە و تەنیا بێ — ئەویش هەر ئەبێ زاتی ئەڵڵا بێ
ئەگەر لابدا ئینسانی ئەحمەق — «لیس کمثلە» ئەیداتە بەر شەق
کە بۆت سابت بوو ئەو لە تۆ ناچێ — وەک ئێمە نەقس و موحتاجی نابێ
باوەڕت ببێ بێ نیازە و فەرد — نسارا و یەهوود سەریان دا لە بەرد

**ئەسڵی دووەم: الصفات**

دوەم باوەڕە بە جەمعی سیفات — کە زۆر و گەورە و قەدیمن وەک زات
سیفاتی زۆر و دارای کەماڵن — دوور لە نوقسانی پەستی و زەواڵن
ئەگەر گەرەکتە یەک یەک بیزانی — لە من بڕوانە ئەتۆش ئەتوانی
وەلێ حەو سیفەت لەوان مەشهوورە — ئەڵبەت زانینیان بۆ دین زەروورە
«عیلم»و«حەیات»و«قودرەت»و«کەلام» — «سمع» و «بصر» و «ئیرادە»، تەمام
عیلم یانی ها زانینی «بالذات» — سەراسەر ئەحواڵ تەواو مومکینات
نەک بە واسیتەی تەلەفون یا تەل — یا خەبەردانی مەئمووری مورسەل
هەر لە لامەکان هەر تا لامەکان — مەوجوودات هەموو پەیدا و پەنهان
یەک زەڕڕە نیە ئاگای لێ نەوێ — ئەم زانایییە هەر بۆ ئەو ئەوێ
زیندووە و بووە و هەیە و دەمێنێ — رۆح لە زیندوان تەواو ئەسێنێ
بێهەناسە و نەفەس، وە بێلووت و دەم — بۆخۆی فەرموویە زیندەم و هەر هەم
ئەم ئەسڵە بۆ کەس نەکریا تەحقیق — هەر لەو فەرمایش لە ئێمەش تەسدیق
لە مەعنای قودرەت تۆزێ تامڵ کە — ئیمان وە حەزرەت باری کامڵ کە
یانی دەسی ئەڕوا بێ سپا و عەسکەر — هەرچی کە بیکا لە خوار یا لە سەر
ئەتوانێ سەما با وە سەر خاکا — ئەم دوانە لاوا و دووی تر ئاوا کا
بە لایۆ زەحمەت نیە ئەمانە — درووس کردنیان بۆ ئەو ئاسانە
کەی موحتاج کۆمەک وە زەید و عەمرە — هەرچی دەیبینی ساختەی یەک ئەمرە
نە موحتاج وەستا نە وەشاگردە — بۆ کێ دەسی دا ئەم دەست و بردە
«انما امرە» وا لە یاسینا — دەلیلی چاکە لە خواناسینا

دارای گوفتوگـۆس نـەک بـە دەنـگ و دەم
مەڵاشـک نەیچەشـت زەوقـی کـەلامی
نـە گـەروو و نـە لێـو بـو قسـەی ئێشـا
دەرکـی ئـەم بەحسـە بـە خـەیاڵ نـاویٚ
دەبیسـیٚ ئـەمما نـەک وەک تـۆ کاکـە
ناڵـەی دەردەدار یـا گیـزەی مەگـەس
لە ژوور یا لە ژێر لـە بـەحر یـا لـە بـەڕ
دەبیسـیٚ و بیسـتن بـۆ ئـەو ئاسـانە
لـەم خسووسـەوە قسـە زۆر کریـا
ئەونـە بـزانین وەک ئێمـە نییـە
دەبینـیٚ وەلـیٚ نـەک بـەم چاوانـە
بینایـە بـە نـوور «مطلـق»ی زاتی
ئاشـکرا و پـەنهان هـەرچی هـەس تـاویٚ
ژێـر زەوی و بـن گـۆم ئـاوا و وێرانـە
تاکـەی بێچـارە تـۆ حاڵـی نـاوی
کـە ئـەو هەمیشـە چـاوی هـاتێتۆ
قـەت وا نـەزانی کـە لی دەبـیٚ گـوم
فریبـت نـەدەن ئـەو دوو دوشمنتـە
لامـەدە لـە ریٚ پـەتیارەی سەرشـێت
ئـیرادە یـانی مـەیلی هـەر کـاریٚ
نـە موحتـاج وەسـا ، نـە وە شـاگردە
لـە هـیچ نەقشـێکا پـەرگاری نـاویٚ
بـۆ عیـبرەت گـیری دارای دڵ و چـاو
کـیٚ تـوانی لـە دار گـەڵا درووس کـا
فەراغـەت نییـە و تەنگـە مەیـدانم
کۆتـا بـیٚ قسـە و زەریـف بژنـەوە
بـە جـوزئی فکـریٚ لێمـان حاڵـییە

زبـان بـیٚ بەشـە لـە گوفتـاری هـەم
زەوقـی خسـتە دڵ عـالم و عـامی
نـە مـەخرەج بـۆ حـەرف زەحمـەتی کێشـا
چۆنمـان بـەیان کـرد ئەشـیٚ هـەروا ویٚ
خشـەی مـار و مـوور بـە گـویٚ و کەڕاکـە
سەدای نەرم و تـون واقیـع لـە هـەر کـەس
مەشریق یا مـەغریب ئـەم پـەڕ یـا ئەوپـەڕ
نزیـک و دووری لـە لا یەکسـانە
تەشخیسـی سـەمعی بـۆ کـەس نـەدریا
باوەڕمـان ببـیٚ ئیتـر کافیـە
دارای گلێنـە و مـژە و کاڵانـە
چـاو ناقونجێنـیٚ لـە «مبصـراتی»
مسقاڵـە زەڕڕەی لـیٚ غایـب نـاویٚ
گشـت بـەرزی و نزمـی لا نمایانـە
چـاک بی یـا خـراو هـای لـە بـەر چـاوی
ئاگـات لـە خـۆت بـیٚ بـڕۆ بـە ڕێتـۆ
«و هـو معکـم اینمـا کنـتم»
«          ا کن          تَ»
حـەول کلـک مـەدە بـا دانـەنی گوێـت
بکـا جـیٚ بـە جـیٚ ئـەکا بـە جـاریٚ
بـۆ کـیٚ دەس ئـەدا ئـەو دەسـت و بـردە
ماشەڵـڵا نـەقاش ئەشـیٚ هـەر وا ویٚ
ئـاو ئـەکا وە بـەرد بـەرد ئـەکا وە ئـاو
یـاخۆ کوێسـانان لـە بـەفرا لـووس کـا
ئـەینا لـەم جـۆرە خـەیلیٚ ئـەزانم
گشـت بـوون و نـەبوون بـە مـەیلی ئـەوە
کـە «متصـفە» بـەم کەماڵـییە

